

# ئاشتی جیهانی و ئیسلام


ناوی کتێب بەعەرەبی
السلام العالمي والإسلام
نوسەر
سید قطب
وەرگێڕان
جمعه صديق كاكه
(زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی ٣٣ )
بڵاوکردنەوەی
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
خـــــەت
نــەوزاد کۆیـی
بـــــەرگ
تـــرایـــزۆن
قەبارەی کتێب
٢٣×١٥،٥ - (٢٠١٤)لاپەڕە
نۆرە و ساڵی چاپ
یەکەم ١٤٢٧ ك - ٢٠٠٦ز
تـــیراژ
٢٠٠٠دانه

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردنی (٣٤٢) ی ساڵی ٢٠٠٥ی پێدراوە





**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو راگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice



# ئـاشـتی
# جیهـانی و ئیسـلام


نووسینی:
سـید قـطب

وەرگێڕانی:
جمعە صدیق کاکە

پێداچوونەوەی:
نەوا محمد سعید




# بیرو باوەڕ و ژیان

تەمەنی هەر تاکێك بەرفەنا و سنورداره، رۆژەکانیشی لەسەر زەویدا ژمێردراوه، ئەو -لەچاو ئەو گەردوونە مەزنەی کە لەسەری دەژێت- گەردێکی سەرگەردانە، نە ئارامگا و نە نرخی هەیە، تەمەنەکەشی لەچاو ئەو مەودا بێشومارەی کە لە بێسەرەتاوه، تا هەتاهەتایە تروسکایی بروسکەیەك، یان چاوتروکانێکە..

بەلام ئەم تاکە فانییە، ئەو گەردە وێڵ و سەرگەردانە، ئەم دۆزراوە ون بووه، توانای ئەوەی هەیە لە یەك چرکەساتدا پەیوەندی بەهێزی بێسەرەتای هەتاهەتاوه بکات، بە پانی و درێژی ئەم گەردونە فراوانەدا درێژ بێتەوه، لە قولاییەکانی ناخی و لە پەیوەندیەکانیدا پەیوەندییەکی توندوتۆلی خزمانەیی لەگەلێدا پەیدا بکات. وا هەست بکات کە لەو هێزە یەکجار مەزنەوه هاتوه و بۆ ئەویش دەگەڕێتەوه.. ئەو دەتوانێ گەلێ شت بێنێتە ئاراوه، روداوی مەزن ئەنجام بدات، کار و کاردانەوەی لەگەڵ گشت شتێکا هەبێ.

دەتوانێ لە رابردوودا هەست بەبوون، لە ئێستادا هەست بە ئارامی، لە داهاتووشدا هەست بە بەردەوامێتی بکات.. دەتوانێت هێزەکەی لەو هێزە هەرە مەزنەوه وەربگرێت، کە چك ناکات و سنوردار ناکرێت و لاواز نابێت.. کەواتە ئەو دەتوانێ روبەڕووی ژیان و روداوەکان و شتەکان بە هەمان هێز و بەهێزتریش ببێتەوه، کەواتە ئەو لە کاتێکدا پشت بە هێزی بێسەرەتای هەتاهەتایی و پەیوەندیەکانی نێوان خۆی و ئەو دەبەستێت، لەو کاتەدا دۆزراوەیەکی ون بوو و تاکێکی دەستەوسان نیە.

ئەمەیە ئەرکی بیروباوەڕی ئاینی، ئەمەشە ئاسەوارەکەی لەسەر دەروون و ژیان، ئەمەیە ڕاز(سر)ی هێزی بیروباوەڕ لە دەروون و، ڕازی هێزی دەروون بە بیروباوەڕەوه. رازی ئەو دەرئاسایانە(خوارق)ی کە بیروباوەڕ لەسەر زەوی دروستی کردوه و تا ئەمڕۆش بەردەوام دروستی دەکات. ئەو دەرئاسایانەی، کە ڕۆژ بە ڕۆژ ئاڕاستەی ژیان دەگۆڕن و، هانی تاك و کۆمەڵ دەدەن بۆ قوربانی دان بە تەمەنێکی

لەناوچـووی سنوردار، لەپێناو ژیانێکی مەزنی لەناونەچوو، وا لە تاکی کەمی لاواز دەکـات لـە بەرامبەر هێزەکانی دەسەلاَت و، هێزەکانی پارەوپول و، هێزەکانی ئاگر و ئاسن بوەستێتەوە.. ئەمانە هەموویان لە ئاست بیروباوەڕی هەڵنەر لە گیانی تاکی بڕواداردا خۆڕاناگرن و دەشکێن. ئەو تاکە لەناوچووە سنوورداره نیە، کە شکستی بە هـەموو ئـەو هـێزانە هێـنا، بەڵکو ئەو هێزە گەورە لەبن نەهاتوەیە، کە ئەو ڕۆحە سەرچـاوەی لێ هەڵبەسـتووە، ئـەو کانیاوە هەڵقوڵاوەیە، کە چك ناکات و سنووردار ناکرێت و لاواز نابێت.

هـیچ بیروبـاوەڕێکی دیکـە -بـێجگە لـە بیروباوەڕی ئایینی- توانای ئەوەی نیە شتێکی لەناوچوو ببەستێتەوە بەهێزی بێسەرەتا و هەتاهەتایی و، ئەو پشتیوانی و یارمەتـیە بـە تـاکی لاواز ببەخشـێت و، هـێزەکانی پشـت و پارەوپول و، پایە و دەسـەلاَت و، ئاگر و ئاسنی لەبەرچاو بچووك بکاتەوە و، ئارامی پێ بگرێت لەسەر نـەبوونی و ئازار و، تواناداری بکات لەسەر ئارام و تێکۆشان و، هەڵی بنێت بۆ ئەو مەرگـەی ژیـان وەدی دێـنێ و، ئـەو لەناوچـوونەی نەمـری دەبەخشـێت و، ئـەو قوربانیەی سەرکەوتنی لێ دەکەوێتەوە.

هـەروەها بـەها مەزنەکـەی ئەم بیروباوەڕە هەم لەژیانی تاکەکان و، هەمیش لە ژیانی کۆمەڵاندا وەك یەکە.

هـەروا ئەو سوربوون و مکوڕیەی، کە پێداگیری دەکەین لەسەر ڕوبەڕووبوونەوەی گرفـتە کۆمەڵایـەتی و مـرۆڤایەتی و جیهانـیەکانمان، بـەو چارەسـازیانەی، کە لە بیروباوەڕە ئایینیەکەمانەوە هەڵ دەقوڵێت.

ئـەم بیروبـاوەڕە کـە لەبـەر دەسـتماندایە هـێزێکی یەکجار مەزنە و، هێزێکی قووڵیشـە لـەناخماندا. هـێزێکی ئەوتۆیـە، کـە هـیچ بـڕواداری لـەکاتی زۆری ململانێکاندا ناتوانێ دەسبەرداری بێ، مەگەر گەمژە بێ یا عەقڵ سوك بێ.

ئـێمە لـە دەوروبـەری خۆمـاندا ڕوبـەڕووی ململانێـیەکی زەبـەلاح دەبیـنەوە. ڕوبـەڕووی چـەندین هـێزی گـەورەی گـرمۆڵە دەبیـنەوە، کە لە وزەی ڕوتی خۆمان گەورەترە. جا ئەگەر بیروباوەڕەکەمان لەو ململانێ مەزنەدا بەهێزێکی ڕاستەقینەی

کاریگـەر و، بـە چارەسـەری کـرداری راسـتەقینە بـە فـریامان بگات.. کەواتە چ ویژدانـێك لەدەسـتی دێ کـە ئـەو هـێزانە بـەفیڕۆ بدات و، دەست لەو چارەسەرانە هەڵگرێت، تەنها لەبەر ئەوەی لەو بیروباوەڕە هەڵقولاّون؟!

لەوانەیـە هەندێك لە سیستەمەكانی دیكە، هەندێك جار چارەسەری هەندێك لە گیروگرفـتەكانمان پێشـكەش بكـەن.. بـەلاّم بـەهای ئەو بیروباوەڕەی بانگەوازی بۆ دەكـەین، تـەنها ئـەوە نـیە چارەسـەری كاتی پێشكەش بە گیروگرفتەكانمان بكەن. بـەڵكو بەهاكـەی لەوەدایـە؛ لەگەڵ ئەو چارەسەرانەی پێشكەشی دەكات، هێزێكی دابیـنكەریش پێشـكەش دەكـات بۆ بەجێهێنان و پارێزگاریكردنی. هێزی پاڵنەری (فـیطری) قووڵـی بیروباوەڕی ئایینی ئەو هەڵنەرەیە، كە نە بیرۆكەی فەلسەفی و نە رێچـكەی كۆمەلاّیەتی و نە بیردۆزەی ئابووری، ناتوانن بۆشاییەكەی لە دەروونـدا پڕ بكەنـەوە. ئەمـەش لەبـەر ئەوەیـە لە دەروونی مرۆڤایەتیدا لە ئاستی هزر و بیر و رێچكە و بیردۆزەكان قوڵترە.

ئەمـە برسـیەتیەكی (فـیطری)یـە، تەنها بڕوا(ایمان) تێری دەكات، برسیەتیەكە هەروەكو برسیەتی لاشە بۆ خواردن و خواردنەوە و هەموو پێویستیەكانی دیكەیە..

چـەند هەڵـە دەكـەن ئەوانـەی خـامۆش بـون، یـان دیارنەبوونی ئەو پاڵنەرە بۆ ماوەیەك، هەڵیان دەخەڵەتێنێت و وادەزانن مردووە، وا دەزانن دەتوانن بە بۆچوونی فەلسەفی، یان بیردۆزی ئابووی، یان بیرۆكەی كۆمەلاّیەتی بۆشاییەكەی لە دەروونی تاك و كۆمەلاّندا پڕ دەكەنەوە.

هـەر زوو هەڵەكـەیان بۆ دەردەكەوێت، كاتێك بیروباوەڕە خامۆشەكە لەلایەكەوە جـۆش دەدات كـە هیچ حیسابێكیان بۆ نەكردووە، جا شتی دەرناسا لەژیانی تاك و ژیـانی كۆمـەڵ دێنێـتە كایـەوە.. ئـەو بیروبـاوەڕەی كـە پێش كەمێك خامۆش و بێجووڵـە بـوو، هـیچ هـیوایەكی پـێوە دیار نەبوو، هیچ ئومێدێكی نەدەبەخشی. خامۆشـبونەكە تـەنها ماوەیـەكی متـبوونە كە نەفامەكان وا دەزانن مردنە، بەلاّم تێگەیشـتووەكان هەسـت دەكەن، كە ئەمە قۆناغێكە لە قۆناغەكانی دەروونی، كە پڕە لە جۆرەها دەروازە و ڕێڕەو، تولەڕێ و گەورە ڕێی مرۆڤایەتیە!

ئـەو دەرئاســايانەی کە بیروباوەڕی ئایینی لە ژیانی تاك و کۆمەڵاندا دەیهێنێتە دی؛ لەسـەر بیروبـاوەڕی پوچـی لـێڵ بنـیات نانرێـت و، پشـت بـە خەیاڵ و خەون نابەسـتێت. بـەڵکو لەسـەر هۆکـاری زانین و پەی پێبراو(مدرك) و بنەمای چەسپاو بنیات دەنرێت.

بیروبـاوەڕی ئاییـنی تێڕوانینـێکی هـەموەکی(کلي) گشـتگیرە، کە ئادەمیزاد بەهـێزە ئاشـکرا و شـاراوەکانی گـەردوون دەبەسـتێتەوە و، گیانەکەشـی لەسـەر باوەڕبەخۆبوون و ئاسودەیی چەسپاو دەکات و، توانای ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ هێزە لەناوچـوو و ڕەوشـە ناهەقـیەکانی پـێ دەبەخشـێت، بـەهۆی هـێزی دڵنیابوون لە سەرکەوتن و هێزی باوەڕ بەخوا بوون..

ئـەم بیروباوەڕە پەیوەندیەکانی تاك بە خەڵك و رووداوەکان و شتەکانی دەوروبەری ڕاڤـە دەکـات و ئامـانج و ئاڕاسـتە و ڕێگاکـەی روون دەکاتەوە و، هەموو توانا و هـێزەکانی کۆدەکاتـەوە و، بـەرەو ئاڕاسـتەیەك هەڵیان دەنێ. هەروا هێزەکەی ئەم بیروبـاوەڕەش لێرەوەیە، هێزی کۆکردنەوەی هێز و تواناکان بە دەوری یەك تەوەرەدا و، ئاڕاسـتەکردنی بـە یەك ئاڕاستەدا، بەهێز و بە متمانەیی و بە دڵنیاییەوە بەرەو ئامانجە ڕونەکە دەڕوات.

کەسـایەتی ئادەمـیزادی ڕێك و تەواو یەکەیەکی یەکگرتووە، بۆیە پێویستی بە بیروبـاوەڕێکی یەکگرتوو هەیە، کە بەرەو هەموو لایەك تیشك پەخش بکات و، لە هەسـت و ڕەفتاردا ڕەنگ بداتەوە و، ڕێنوێنی بکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گەردوون و ژیان و، لە هەموو گەورە و بچوکێکدا بۆی بگەڕێتەوە.

فـەزڵی ئـەم بیروبـاوەڕە لە ژیانی هەموو ئادەمیزادێکدا، ئەوەیە کە خاڵی چەق بێـت، کـە هـەموو سـەرەداوەکانی ژیـان و چالاکیەکانی تیادا کۆببێتەوە، بەجۆرە کەسـایەتیەکەی پارچەپارچـە و پەرتـەوازە نابێـت و، دوودڵـی و سەرسـامی و پەشـۆکاوی ڕووی تێـناکات، جا هەرچەند ئەو خاڵە بەهێزتر بێت و پەیوەندییەکانی بە سەرەداوە پەرت و بڵاوەکانی ژیانی تاك و چالاکیەکانی لێرەو لەوێ توندتر بێت؛ ئـەوا کەسایەتیەکەشـی بەهـێزتر دەبێـت، چونکە زیاتر کۆدەبنەوە و هەنگاوەکانی

رونتر دەبێت، چونکە ڕێگاکەی یەکگرتووترە..

بیروبــاوەڕێك جـێگای گشــت چــالاکیە جۆراوجۆرەکــانی مــرۆیی تــیا ببێتەوە، چاکترین بیروباوەڕە و لەو بیروباوەڕە تەواوترە، کە هەندێ جۆرە چالاکی رێك دەخات و لە هەندێکیان کەمتەرخەمی دەکات.

تــاك ئەگــەر لــە هــەموو چالاکیەکانیدا بۆ یەك بیروباوەڕ بگەڕێتەوە، ئەوا بۆی چــاکتر و ئاسانترە لەوەی لە چالاکیە هەمەجۆرەکاندا بۆ چەند بیروباوەڕێکی جیاواز بگەڕێــتەوە، لــەو کاتەشــدا یەکــیەتی بیروبــاوەڕ و یەکــیەتی کەســایەتی بەدەســت دەهێنێــت، بــێ ئەوەی ستەم لە جۆرەکانی چالاکیە جۆربەجۆرەکانی بکات و بواری چــالاکی تەســك بکاتــەوە یــان ســنورداری بکــات و بۆ چەندین پارچەی جۆراوجۆر پارچەپارچەی بکات و شپرزەیی و پەشۆکاوی یەکجاری بخاتە نێوانیانەوە.

ئەو بیروباوەڕە رۆحیەی کە لە رەفتارە کۆمەڵایەتیەکان و پەیوەندیە ئابووریەکان و سیســتەمە جیهانــیەکاندا هــیچ رایەکی نیە.. هەروەکو ئەو بیردۆزە کۆمەڵایەتیە وایــە، کــە لــە بیروبــاوەڕی رۆحــی و ڕەوشــت و رەفــتاردا هیچ رایەکی نیە.. وەکو بیرۆچــکەیەکی هونــەری وایــە، کــە هــیچ پەیوەندیــیەکی بــە رەفتار و بیروباوەڕ و سیســتەمەوە نــیە.. هــەموو ئەمانــە هــەوڵی ناکــامن، نــاتوانن ژیانی ئادەمیزاد بەتــەواوی ڕێــك بخــەن و، یەککگــرتوویی و تەواومــەندی بــە کەســایەتی ئادەمــیزاد ببەخشن.

تاکــیش هــەروەك کۆمــەڵ پێویستیەکی زۆری بە بیروباوەڕێك هەیە، کە جێگای هــەموو جۆرەکانی چالاکیی زیندووی تێدا ببێتەوە و بەسەر هەموو لایەنەکانی زاڵ بێــت، تــاکو هــەموویان بــە ئاڕاســتەی بنیاتنان و دروست کردن و گەش ونما کردن ئاڕاستە بکــات. ئــەو ماوانــەش کــە تــاك یــان کۆمەڵ بەو بیروباوەڕە دەگەیەنن و بەتــەواوی بەدەمــیەوە دەچن و لە واقیعی ژیاندا جێبەجێیان دەکەن.. ئەو ماوانەیە کــە مــرۆڤایەتی شــتی وایان وەدیهێناوە کە وەك پەرجو(معجزه) وابا و بە زەحمەت شــرۆڤە(تفسیر) بکــرێن، مەگــەر لەژێــر تیشــکی ئــەو یەکێتیــیەی کــە تواناکــان کۆدەکاتــەوە و لــە پەرتــەوازەیی و لــێك دابــڕان دەیانپارێزێــت و، وەکو شەپۆلێکی

بەهێز و لافاوێکی مەزن، بەرەو هەموو ئاڕاستەکان هەڵیان دەنێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی تاکە نمونەیە لەم بوارەدا، کە مرۆڤایەتی لە مێژووە دوورودرێژەکەیدا ناسیبێتی. بیروباوەڕێکی فراوانە و هەموو چالاکیەکانی بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆڤ دەگرێتە خۆی و، ئەرکەکەی لە بوارێك بێ بوارەکانی دیکە، یان ئاڕاستەیەك بێ ئاڕاستەکانی دیکە کورت هەڵنەهاتوە.

ئەم بیروباوەڕە ڕێ نادا بەوەی، کە دەڵێ ئەوەی هی قەیسەرە بۆ قەیسەر و ئەوەی هی خوایە بۆ خوا، چونکە ئەوەی هی قەیسەرە و قەیسەر خۆیشی، لە بیروباوڕی ئیسلامی‌دا هەموو هی خوان و، قەیسەر هیچ مافێکی زیاتری بەسەر خەڵکییەوە نیە!

ئەم بیروباوەڕە گیانی تاك ناگرێتە خۆی و ژیری و لاشەی فەرامۆش بکات، یان دروشمەکان ناگرێتە خۆی و دەستور و یاساکان فەرامۆش بکات، یان ویژدانی بگرێتە خۆی و ڕەفتاری فەرامۆش بکات.. هەروەها بەتاك نایگرێتە خۆی و بە کۆمەڵ فەرامۆشی بکات و، ژیانە تایبەتیەکەی ناگرێتە خۆی و سیستەمی فەرمانڕەواییەکەی، یان پەیوەندیەکانی دەوڵەت و کۆمەڵەکەی لەگەڵ تێکڕای دەوڵەتان و کۆمەڵانی دیکەی فەرامۆش بکات.

ئەمە بیرۆکەیەکی تەواوی گشتگیرە و هێڵەکانی لە ژیانی ئادەمیزاددا، وەکو خوێنبەرەکانی لاشەی زیندوو و دەمارەکان درێژ دەبێتەوە.

ئێمەش لەم وڵاتەی خۆمان-و لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا- ڕوبەڕووی جۆرەها گیروگرفت و کۆسپ و تەگەرە دەبینەوە. لەناوەوە بەشێوە گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕەوشتی و، لە دەرەوەش بەشێوەی گیروگرفتی نێودەوڵەتی جیهانی روبەڕووی دەبینەوە، بەڵام ئێمە لەکاتێکدا روبەڕووی دەبینەوە کە خۆمان نەبینیوەتەوە و، بڕی توانای خۆمان نازانین و، ئامانج و ڕێگای خۆمان نازانین. روبەڕووی دەبینەوە و ئەوپەڕی پێویستیمان بە تاکە بیروباوەڕێکە، کە هێزەکانمان کۆبکاتەوە، پێویستیمان بە تاکە ئاڵایەکە لە سێبەرەکەیدا یەکڕیز بوەستین، پێویستیمان بە تاکە بیرۆکەیەکە بۆ روبەڕووبوونەوەی ژیان و گیروگرفتەکان، هەروا

ڕووبەڕووی ئەو هێزە دەرەکی و ناوەکیانەی پێ ببینەوە، کە دژایەتیمان دەکەن.

ئـێمە تاوانمـان بەرامـبەر بیروبـاوەڕە مەزنەکـەمان ئـەنجام دەدا، جا بە نەفامی بوبـێ، یـان بـە مەبەست، وامان دەزانی بە چارەسەری کرداریی دیاریکراو فریامان ناکەوێـت بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی ژیـانی هاوچەرخ و گیروگرفتەکانی، بە تایبەتی لە بواری کۆمەڵایەتی و لە بواری نێودەوڵەتی.

بەڵام بواری کۆمەڵایەتی چەندان دانراوی لەبارەوە دەرچووە، ئەوە ئاشکرا دەکەن کە ئیسلام چارەسەری کرداری هەیە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ژیان و، زۆربەی ڕەخنەکانی خوازیـارانی دادوەری کۆمەڵایـەتی پوکـاندەوە، دیتـیان کـە ئیسـلام دەتوانێـت دادوەریـەك بەدەسـت بهێنێـت، گشـتگیرتر و تەواوتـر لە هەموو ئەوانەی بۆچوونە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە بەدەستی دێنن.

بـەڵام لـە بـواری نـێودەوڵەتی، لەوانەیـە کار لەم بوارە کەم بێت و، هێشتا ئەم لایەنـە وەك پێویسـت راڤـە نەکرابێـت.. ئێسـتاش گیروگرفـتی ئاشتی جیهانیمان لەبەردەمدایـە، کە هەموو مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی دەبێتەوە و، ئێمەش لەگەڵ ئەوان. جا ئایا ئیسلام لەوەدا هیچ ڕایەکی هەیە؟ و چارەسەری بۆی چیە؟

ئەم کتێبە هەمووی وەڵامێکی دوورودرێژی ئەم پرسیارەیە..

# سروشتی ئاشتی له ئیسلامدا

بیرۆکەی ئاشتی لە ئیسلامدا بیرۆکەیەکی ڕەسەنی قووڵە، پەیوەندییەکی بەتینی بە سروشتەکەی و، بیرۆکە گشتییەکەی دەربارەی گەردوون و ژیان و ئادەمیزاد هەیە. ئەو بیرۆکەیەی سەرچاوەی هەموو سیستەمەکانیەتی و، خاڵی هاوبەشی هەموو دەستور و ڕێنمونیەکانیەتی و، شەریعەت و دروشمەکانی لێیدا کۆدەبنەوە، بەشێوەیەك کە بە خەیاڵی توێژەرەوە لێکۆڵەرەوەکانی ئەم ئایینە خۆشیاندا نایەت.. مەگەر توێژینەوە و لێکۆڵینەوە بگاتە ڕەگە ڕۆچووە دوورەکانی و، بە وریایی و ئارام و شارەزاییەوە بە شوێن درێژبوونەوە و لق لێبوونەوەکانی بکەوێت.

بۆچوونی گشتیی ئیسلام دەربارەی گەردوون و ژیان و ئادەمیزاد بابەتی توێژینەوەی ئەمڕۆم نیە لەم کتێبەدا،[1] هەروەك بابەتی توێژینەوەکەم لە کتێبی (العدالة الإجتماعية في الإسلام)یش نەبوو؛ بەڵام توێژینەوە لە هەر بوارێك لە بوارەکانی ئیسلام پێویستی بە شارەزابوون هەیە لەو بۆچوونە گشتییە گەورە و گشتگیرە، لەبەر بەهێزیی پەیوەستی و هاوڕێکیی نێوان بەش و لایەنەکانی و، توندوتۆڵی پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەموو بۆچوونێکی بچووکی، یان لقێك لە لقەکانی.. ئەم ئایینە گیروگرفتەکانی ئادەمیزاد بەش بەش و پارچەپارچە چارەسەر ناکات و، هەر یەکێکیان لەسەر بنەمایەك بنیات نانێت، کە پەیوەندی بە بنەماکانی دیکەوە نەبێت، بەڵکو هەموویان دەگەڕێنێتەوە سەر یەك خاڵی چەق و، بە دەوری یەك تەوەرە دەیانسوڕێنێتەوە و، هێڵی ئاشکرای پان یان باریك بەو تەوەرەیەیان دەبەستێتەوە. هەرچۆنێك بێت پەیوەندییەك هەیە، لە بابەت و مەسەلەکانی ئەم ئایینە، کە یەکەیەکی گشتی کۆکەرەوە پێك دەهێنن، کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونە گشتییەکەی دەربارەی گەردوون و ژیان و ئادەمیزاد.

---

[1] ئەو بۆچوونە گشتییە گشتگیرە کتێبی (خصائص التصور الإسلامي ومقوماته) لە ئەستۆی گرتووە.

سروشـتی ئاشـتی لە ئیسلامدا لە ڕووە تایبەتییەکەی، پێویستی بە شارەزابوون لـەو بۆچـوونە گشـتییەی ئیسـلام هەیـە، ڕاسـتەوخۆ لێـیەوە هـەڵدەقوڵێ و، ڕاستەوخۆش بۆی دەگەڕێتەوە. با پێش دوان لەسەر (سروشتی ئاشتی لە ئیسلامدا) لـە چـەند دێـڕێکی کەمدا شارەزای ئەو بۆچوونە ببین، هەروەك لەکاتی دوان لەسەر (سروشتی دادوەری کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا) هەندێك شارەزای بووین.

ئیسـلام لـەم گەردوونـە مەزنـەدا ئایینی یەکبونێکی گەورەیە.. یەکێتی نێوان هـەموو پارچـە بچـووکەکانی؛ هـەر لـە تاکـە گەردێکـەوە تـا پایەدارتـرین چینە ئاوێـتەکانی ژیـان، یەکێتی نێوان هەموو تاکەکانی، هەر لە بێگیانێکی بێجووڵە، تـا ڕووەکـی گەشەسـەندوو، تا ئاژەڵی جووڵاوە، تا ئادەمیزادی قسەکەر.. یەکێتی نـێوان هـەموو چـالاکییەکانی؛ هـەر لـە خولی هەسارە و ئەستێرەکانەوە، تا هات وچـونی بـیر(فکـر) و گـیانەکان.. یەکێـتی نـێوان هـەموو لایەنـەکانی؛ هـەر لـە بەدەنگەوەچـوونی ئەسـتێرەکان بـۆ یاسا، تا بە دەنگەوەچوونی گیانەکان بۆ زانین و ڕێـنموونی.. هـەروەها یەکێـتی نـێوان هەموو وزەکانی؛ هەر لە برسیەتی لاشە بۆ پێویسـتییەکانی، تـا هـاواری حـەزەکانی گـیان.. هـەروەها یەکێتی نێوان هەموو زیـندەوەرەکانی و، نێوان هەموو ڕەگەزەکانی و، نێوان هەموو نەوەکانی تیایدان و، نێوان دەست پێکردن و کۆتاییەکەی و، نێوان زەوی و ئاسمانەکەی و، نێوان دواڕۆژ و دونیاکەی..

هەنگاوی یەکەم بە بەتاك زانینی خوا دەست پێ دەکات، ئەو زاتەی ژیان لێیەوە دەردەچـێت و، ئاڕاسـتەکان تـەنها بۆ لای ئەوە: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، اللَّهُ الصَّمَدُ، لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ: بلـێ: ئەو خودایە تاکە، خودایەکی بێنیاز و جێنـیازە، کـەس لـەو نـەبوە و ئـەویش لـە کـەس نـەبوە، هەرگـیز هاوتـای ئەو نەبوە.﴾الإخلاص.

بەمـە هـەموو هۆیـەکانی جـیاوازی و ناکۆکی لە سەرچاوەی یەکەمی گەردوون بنـبڕ دەبێـت و کۆتایی پێ دێت، هۆیەکانی خراپەکانی و پێکدادان لە ناخی یاسادا هەڵدەگیرێـت، چـونکە تاکـیەتی خـوای بەدیهێـنەر ئـەوە ڕەت دەکاتـەوە، کـە

فرەنەخشـەدانان و فرەیاسـای گـەردوون هەبێت، لەبەر ئەم هۆیانە بوونی دژایەتی و پـێکدادان ڕەت دەکاتەوە، ئەمەش بەڕاست خەری ئەو فەرمایشتەی خودای بەرزە، کـە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللَّهُ لَفَسَدَتَا: ئەگەر بێجگە لە -الله- خودایـەکی دیکـەی تێدابوایە، ئەوا زەوی و ئاسمان تێك دەچوون.﴾الأنبـیاء/ ٢٢. بە ڕاست خەری ئەو فەرمایشتەیە کە دەفەرموێت: ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ وَلَد وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَه إِذًا لَذَهَبَ كُلُّ إِلَه بِمَا خَلَقَ وَلَعَلاَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ: زاتـی (اللّٰه) هەرگـیز کـوڕی بۆ خۆی دانەناوە و هیچ خوایەکیشی لەگەڵدا نەبوە، ئەگەر وابوایە هـەر خوایـەك دروسـت کراوی خۆی بۆ خۆی دەبرد و، هێندێك بەسەر هێندێکیاندا زاڵ دەبوون.﴾المؤمـنون/٩١.

بـەپێی ویسـتی ئـەو خودا تاکە، گەردوون بە یەك ڕێگا دەردەچێت؛ ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ: فـەرمانی ئەو ئاوایە، ئەگەر شتێکی ویست، پـێی بڵێ: ببە، دەبێ.﴾ یس/٨٢. بەبێ هیچ پێناوێك لەنێوان ویستی بەدیهێنەر و گەردوونی بەدیهێنراودا.

هـەروا چەندایەتی لە شێوازی پەیدابوونی ئەم گەردوونەدا نیە، هەمووی لە تاکە بەدیهێنەرێکەوەیە، ئەوە تەنها ئەو ویستەیە، کە قورئان بە وشەی (کن) گوزارشتی لێ دەکـات و، ئاڕاسـتەبوونی ئـەم ویسـتە بـە تەنها بەسە بۆ پەیدابوونی گەردوون لـێرەوە؛ (کـن فـیکون)، بەمـەش هـەموو پێناو(وساطة)یەك، یان دوانەییەك، یان چـەندایەتییەك لـە پـەیدابوونی گەردوون ڕەت دەکاتەوە، هەر لە چرکەی یەکەمەوە هـەموو پـێکدادان و ئاسـتەنگ، یـان ناڕێکـیەك، بـە شێوەیەکی ئاسان و ڕێك لە ڕێگـەی بوونـدا بـڕیاری هاوڕێکیی گەردوون دەدات، ئەو هاوڕێکییەی لە رووکاردا تێبیـنی دەکرێـت و، لـە سیسـتەمی گـەردوون و هـەموو ژیـان و زیندەوەرانیشدا شـاراوەتەوە: ﴿الَّـذِي خَلَـقَ سَبْعَ سَمَاوَات طِبَاقًا مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَانِ مِنْ تَفَـاوُت فَـارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ، ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ: ئـەو زاتەی حەوت ئاسمانی چین لەسەر چین بەدی هێناوە، لـە دروسـتکراوی ئـەو خودا میهرەبانەدا هیچ ناڕێکییەك نابینیت، جارێکی دیکە

تەماشـاکە، ئایـا هـیچ قەڵشـێك دەبیـنی.. دووبارە چاوی پێدا بگێڕەوە، سۆمای چاوت بە داماوی بەرەو خۆت دەگەڕێتەوە.﴾تبارك/٣-٤.

هـەر خوای تاقانەیە هەموو شتێکی بەدەستە و، هەموو گەردوون، بە کۆمەڵ و بـە تـاك تاك، لە دونیا و لە ڕۆژی دواییدا، لە کارکردن و لە نوێژکردندا، لە ژیان و مـردندا، ڕووی تێدەکـەن، هـەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە، هەروەك لەلای ئەوەوە هاتـبوون: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَـــيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ: مـەزنی و پـیرۆزی بۆ ئەو زاتـەی هەموو شتێکی بەدەستە و بەسەر هەموو شتێکدا تەوانایە.. ئەو زاتەی کە مردن و ژیانی داهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە کامتان کرداری چاکترە.﴾تبارك/١-٢.

﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِــنْ لاَ تَفْقَهُــونَ تَسْـبِيحَهُمْ: حەوت ئاسمانەکە و زەوی و هەرچی لەناویاندایە پاکـیگاری خـوا دەکـەن، هـیچ شتێك نیە پاکیگاریی سوپاسگوزاری ئەو نەکات، بەڵام ئێوە لە پاکیگاری ئەوان تێ ناگەن.﴾الإسراء/٤٤.

﴿وَمَـــا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ، مَا أُرِيدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَنْ يُطْعِمُونِ: جـنۆکە و ئادەمیزادم دروست نەکردووە، تەنها بۆ ئەوەی بمپەرستن.. هیچ ڕۆزیم لەوان ناوێت و نامەوێت خۆراکم بدەنێ.﴾الذاريات/٥٦.

بەمـەش بیرۆکـەی گومـڕایی مەبەسـت، یـان پێکهەڵچون(تصادم)ی ئامانج لە گـەردوون و ژیـان و زیندەوەران ڕەت دەکاتەوە و، لەسەر بەرنامەیەکی یەکگرتوو و ئاشـکرا و هاوڕێك بنیاتی دەنێت و، لە تاکە ڕێگایەك دەیخاتە ڕێ کە دەیگەیەنێتە مەبەست، مەبەستی هەموان و ڕووگەی هەموان.

ئەم گەردوونە بەش بەش و جۆراوجۆر و قەبارە جیاوازە.. بۆ یەك بنچینە و یەك سروشت دەگەڕێنەوە. بنچینەکەشی یەك کۆمەڵ بوو، پاشان پارچەپارچەکانی پەرش و بـڵاو کـرایەوە و دووریـەکانی پێك هات: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَــتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا: ئاخۆ بێبڕواکان نابینن کە ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچـە بـوون و لـێکمان هەڵوەشـاندن؟.﴾الأنبياء/٣٠. هەمووشـی ملکەچی یەك یاسـایە، کـە جووڵانـەوەکانی ڕێك دەخات و، لە پێکدادان و ڕوخان دەیپارێزێت و،

بەسەر ئەستێرە و هەسارەکاندا زاڵ دەبێت و، ڕۆیشتن و ڕێڕەوەکانیان ڕێك دەخات: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ، وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ، لاَ الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلاَ اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ: خۆریش بەرەو بنەی خۆی لە گەڕاندایە، کە لە خاوەنی دەسەڵاتی زاناوە ئەو فەرمانەی پێدراوە، مانگیش ئێمە بۆمان داناوە بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕێت، تا وای لێدێت وەکو پەلی کەونی وشکهەڵاتووی دارخورما دێتە بەرچاو.. نە خۆر توانای ئەوەی هەیە بگات بە مانگ، نە شەو وەپێش ڕۆژ دەکەوێت، هەر هەموویان لە ئاسمانێکدا مەلە دەکەن..﴾یس/٣٨-٤٠.

ئەمەش ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە پارچە جۆراوجۆرەکانی گەردوون یەکدیبڕ و پەرش و بڵاو بن، بەڵکە دەیسەلمێنێت، کە لە سروشتی پێکهاتن و، لە ناخی یاسا و، لە سیستەمی جووڵانەوە یەکگرتوو و هاوڕێکن..

ژیانیش لەم گەردوونە مەبەستدارە، نەك ڕێکەوتێکی بەسەرچوو، لە نەخشەدانانی گەردوون و یاساکەیدا ڕەچاوی ئەوە کراوە، کە ڕێ بە پەیدابوونی ژیان بدات و، پێویستیەکانی و پێویستی هەموو زیندەوەران دابین بکات و، لە تێکشکان و لەناوچوون و ڕووخان بیپارێزێت.

جا ئەم زەوییە؛ ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا: کەژ و کێوی لە زەمین دانا و، پیت و فەڕی تێخست و بری بژێویی تیادا بۆ دیارکردن.﴾ فصلت/١٠.

﴿وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ: لەم زەویەدا کێوەکانی داناوە تا نەتانلەرزێنێ.﴾النحل/١٥.

﴿وَالأَرْضَ وَضَعَهَا لِلأَنَامِ، فِيهَا فَاكِهَةٌ وَالنَّخْلُ ذَاتُ الأَكْمَامِ، وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ وَالرَّيْحَانُ: زەویشی بۆ مرۆڤ داناوە، میوە و دارخورمای خونچەداری تێدایە، لەگەڵ دانەوێڵەی گەڵادار و بۆن خۆش.﴾الرحمن/١٠-١٢.

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ: ئەوە کە زەویی بۆ دەستەمۆ کردوون، جا بە هەموو پەناوپێچەکانیدا بگەڕێن و لەبژێوەکەی بخۆن..﴾ تبارك/١٥.

ئـەم ئاسمانـەش لـە نەخشـەدانانیدا ڕەچاوی پێویستیەکانی ژیان کراوە؛ ﴿وَزَيَّنَّا السَّـــمَاءَ الدُّنْــيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا: ئاسمانی دونیامان بە چەندین چرا ڕازاندۆتەوە و پاراستمان.﴾ فصلت/١٢.

﴿وَيُمْسِـــكُ السَّـــمَاءَ أَنْ تَقَـــعَ عَلَى الأَرْضِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ: ئاسمانیش ڕادەگرێت کە بکەوێتە سەر زەوی، مەگەر بە ئیزنی خۆی.﴾الحج/٦٥.

ئەم بایەش لەنێوان ئاسمان و زەویدا لە خزمەتی ژیان و زیندەوەراندایە:

﴿اللَّـــهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَـــفًا فَـــتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلاَلِهِ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ: هـەر خودایە ئەو بایانە بەڕێ دەکات، ئەوانیش هەور دەبزوێنن، ئەوسا هەرچـۆنی بوێـت لـە ئاسمانـێ ئەو هەوایە پەرش و بڵاو دەکاتەوە و پارچەپارچەیان دەکات. دەبینی لەوانەوە دڵۆپەباران دێنە خوارێ، ئەگەر مەیلی لێبێت بۆ هەر کام لە بەندەکانی خۆی بنێرێت، ئەوان دڵخۆش دەبن.﴾الروم/٤٨.

بەمـەش بـڕیاری هاریکـاری و هاوڕێکـیی نێوان سروشتی گەردوون و سروشتی ژیـان بەگشـتی دەدات و، بیرۆکـەی پـێکدادان و نـاکۆکی ڕەت دەکاتەوە. هەروەك بڕیاری مەبدەئی سیستەمی مەبەستدار لە بنیات نانی گەردوون دەدات و، بیرۆکەی ڕێکەوتی کوێر ڕەت دەکاتەوە کە لەسەر سیستەمێك دانەمەزراوە.

ژیـانی جوڵـەدار لـەم زەویـیەدا لـە یـەك بنچـینەوە دەرچووە، هەموویان یەك ڕەگەزیان تێدایە، ڕەگەزی ئاو کە بنچینەی زیندەوەرانە:

﴿وَجَعَلْـــنَا مِـــنَ الْمَـــاءِ كُـــلَّ شَـــيْءٍ حَيٍّ: لەئاو هەموو شتێکی زیندوومان پێکهێناوە.﴾الأنبياء/٣٠.

هـەموو زیندەوەرانـیش-بەڵکو هەموو شتەکان- لە تایبەتمەندییەکدا هاوبەشن، ئەویش تایبەتمەندیی جووتیە:

﴿سُـبْحَانَ الَّـــذِي خَلَقَ الأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لاَ يَعْلَمُـــونَ: پـاکی و بێگـەردی بـۆ ئـەو خودایـەی هەموو جووتەکانی وەدی هێنا، لەوانەی لە زەوی دەڕۆیت، یان لەخۆیان؛ یان لەوانەی نایزانن.﴾ یس/٣٦.

﴿فَاطِـــرُ السَّـــمَاوَاتِ وَالأَرْضِ جَعَـــلَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا: وەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەمین، هەر لە خۆتان جووتەی بۆ داناون.﴾الشورى/١١.

هەمووشیان لە تاکە ڕێکخستنێکی بە کۆمەڵدا هاوبەشن:

﴿وَمَـــا مِـــنْ دَابَّـــةٍ فِـــي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ:هەر زیـــندەوەرێك بەســـەر زەویدا دەڕوات، یان هەر باڵندەیەك کە دەفڕێت، کۆمەڵانێکن وەك ئێوە.﴾الانعام/٣٨.

بەمـــەش ڕەچـــەڵەکی نـــێوان هـــەموو زیـــندەوەرانی زەوی دادەمەزرێـــت، هەموو زیندەوەرانـــیش دەبـــنە یـــەك خێزان، کە لەسەر یەك بنچینە ڕواون، خزمایەتی نێوان هەموو زیندەوەران و شتەکان لەم زەوییەدا دادەمەزرێت.

ئادەمـــیزاد باڵاتـــرین نمونەکانی ژیانە، قەوارەکەی لە ماددەی یەکەمی گەردوون داڕێژراوە. ڕەچەڵەکی بۆ ماددەی ئەم گەردوونە؛ ڕەسەنە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ سُلاَلَةٍ مِنْ طِينٍ: ئادەمیزادمان لە زنجیرەیەك لە قوڕ دروست کردووە.﴾المؤمنون/١٢.

دوای ئـــەوە تاکـــەکانی ئـــەم ئادەمـــیزادەش یەکێتـــیی بنەچـــەیان هەیـــە، لـــە ڕەچەڵەکیشدا یەکسانن:

((أَنْـــتُمْ بَـــنُو آدَمَ وَآدَمُ مِـــنْ تُـــرَابٍ: ئـــێوە نـــەوەی ئـــادەمن و ئادەمیش لە خۆڵە..))مسلم وأبوداود.

هـــەموو تاکـــەکانی ئـــەم ڕەگـــەزە لـــە تاکـــە کەسێکەوە دروست کراون، هەر لەو تاکەکەســـەوە هاوســـەرەکەی دروســـت کـــراوە، لە هەردوکیشیانەوە هەموو تاکەکان دەرچوون:

﴿يَاأَيُّهَـــا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُم الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَـــثَّ مِـــنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً: ئـــەی خەڵکینە، لە پەروەردگاری خۆتان پارێز بکـــەن، ئـــەو پـــەروەردگارەی ئـــێوەی لـــە یەك کەسەوە خستۆتەوە و هاوسەرەکەشی لەوەوە دروست کردووە، لەو دوانەشەوە پیاو و ژنێکی زۆری خستۆتەوە.﴾النساء/١

هـــەموویان دروســـتکراون تـــا یـــەکدی بناسن و هۆگری یەکدی بن، نەك دژایەتی یەکدی بکەن و پیلان بۆ یەکدی داڕێژن:

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێیەکەوە دروست کردووە و کردوومانن بە چەندین گەل و هۆز، تا یەکدی بناسن.﴾الحجرات/۱۳.

بەم شێوەیە هەمو هۆیەکانی ناکۆکیی ڕەگەزایەتی لادەبات، بە بڕیاردانی یەکێتی مرۆڤایەتی لە سروشت و بنەچە و دروستبوونیدا، بە بڕیاردانی مەبەست لە بەش بوونی ڕەگەز و هۆزەکان، هەروا بە بڕیاردانی دەق، ئەوەی کە ئەمە یەکترناسین و هۆگربوونە، نەك دژایەتی و پیلانگێڕی.

خودای تاك یەك پەیامی بۆ ئەم مرۆڤایەتییە ناردووە، کە بەهۆیەوە بڕواداران یەك ئوممەتن:

﴿شَرَعَ لَكُمْ من الدِّينِ مَا وَصَّى به نُوحًا وَالَّذي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا به إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلاَ تَتَفَرَّقُوا فيه: پەروەردگارتان ئەو دەستور و بەرنامەیەی بۆتان دانا، کە ئامۆژگاریی نوحی پێکردبوو، ئەو سروشەی بە تۆمان گەیاند، هەمان ئەوەیە، کە ئامۆژگاری ئیبراهیم و موسا و عیسامان پێکردبوو، کە ئایین بەرپا بکەن و تیایدا ناکۆك مەبن..﴾الشوری/۱۳.

﴿قُولُوا آمَنَّا باللَّه وَمَا أُنزلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطَ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَد منْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلمُونَ: بڵێن: بڕوامان هێنا بە خودا و ئەوەی بۆمان هاتۆتە خوارەوە، هەروا ئەوەی بە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و یوسف و براکانی درا و ئەوەش، کە بە موسا و عیسا دراوە و ئەوەی لەلایەن پەروەردگاریانەوە بە پێغەمبەران دراوە، جیاوازی لەنێوان هیچیاندا ناکەین و خۆمان سپاردەی خودا دەکەین.﴾البقرة/۱۳٦.

﴿يَاأَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا من الطَّيِّبَات وَاعْمَلُوا صَالحًا إِنِّي بمَا تَعْمَلُونَ عَليمٌ، وَإِنَّ هَذه أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُون: ئەی کۆمەڵی پێغەمبەران! لە بژێوی پاکژ بخۆن و ئاکار چاك بن، من لە کردارەکانتان ئاگادارم.. ئەم ئایینەی ئێوە یەکپارچەیە و من پەروەردگارتانم، جا پارێز لەمن بکەن..﴾المؤمنون/۵۱-۵۲.

بەمەش هەموو هۆیەکانی ناکۆکیی ئایینی نێوان بڕواداران لە ئایینی ڕاستی خوادا لادەبات، کاتێك بڕیار دەدات کە ئاین هەمووی لەلایەن خواوەیە و، هەر یەك ئایینە و بانگەشەی ملکەچیی خوای تاك بەبێ هاوبەشی و، فەرمانبەریی تەواو بۆی دەکات، جا چ لە کاروباری دونیا بێت، یان لە کاروباری ڕۆژی دوایی، بەبێ جیاوازی.

پاشان ئیسلام چەند قۆناغێك لە بڕیاردانی بیرۆکەی یەکیەتی گەورە تێدەپەڕێت و، دەیئاخنێتە ناو شاراوەکانی دەروون و خواستەکانی لاشە و داخوازیەکانی گیان و، دەیگەیەنێتە هەموو گۆشەیەکی ژیانی ئادەمیزاد و، هەموو ڕوێك لە ڕوەکانی ژیان.. بەلاّم لێرەدا پێویست ناکات درێژە بەم توێژینەوانە بدەین، ئەم برە ڕێخۆشکردنەمان بەسە بۆ ڕوونکردنەوەی (سروشتی ئاشتی لە ئیسلامدا).

لەم هاوڕێکییەی سروشتی گەردوون و، لە یاسای ژیان و، بنچینەی ئادەمیزاد.. سروشتی ئاشتی لە ئیسلامدا هەڵدەهێنجرێت، بە پشت بەستن بە بنچینەیەکی ڕەسەنی قووڵ، ئاشتی دەبێتە یاسایەکی بەردەوام و، جەنگیش ئەو هەلاّوێرد(استثناء)ە دەبێت، کە دەرچوون لەو هاوڕێکییە پێویستی دەکات، کە خۆی لە ئایینی خودای تاکدا دەنوێنێت، دەرچوونەکەش بە زیادەڕۆیی و ستەم، یان بە خراپەکاری و تێکدان دەبێت.. لە هەموو ستەمێك ستەم تریش هاوبەش دانانە بۆ خودا.. خراپترین خراپەکاریش پەرستشی بەندەکانە بۆ غەیری خودا، ئەمانەش لەرێگای جەنگێکی کات دیاریکراو دەگەڕێنرێتەوە بۆ هاوڕێکیی بەردەوام و چاکیی پێویست؛ ﴿حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّه: هەتا هاوبەش پەرستی ڕونەدات و فەرمان هەمووی بۆ خودا بێت.﴾الأنفال/٣٩.

کەواتە ئیسلام هەر لە هەنگاوی یەکەمەوە زۆربەی ئەو هۆیانە ڕەت دەکاتەوە، کە جەنگ لە زەویدا دەوروژێنن و، ئەو جۆرە جەنگانە بەدوور دەخات، کە بڕیاری لەسەر هەڵگیرسێنەر و ئامانجەکانی نەداوە.

کاتێك بڕیاردەدات کە هەموو خەڵك لە یەك بنچینەن، هەموویان لە یەك کەسەوە دروست کراون و، کراون بە چەندین گەل و هۆز تا یەکدی بناسن، بۆیە ئەو

جەنگانــە بەدوور دەخات کە نەتەوەیی ڕەگەزپەرستی دەیوروژێنێت، کەواتە جێگای نەتەوەیی ڕەگەزپەرستی تێدا نابێتەوە.

هــەروا ئــەو جەنگانــەش ڕەت دەکاتــەوە کــە چاوتێبڕین و دەستکەوت و قازانج دەیوروژێنێــت: جــەنگی داگیرکــاری و چەوســاندنەوە و، گــەڕان بــەدوای بــازاڕ و کەرەستــەخاوەکان و، کۆیلەکــردنی شــوێن و کەســەکان. ئەوانــە هیچیان جێیان لە ئیســلامدا نابێــتەوە. ئەمــە لــە کاتێکدا هەموو مرۆڤایەتی بە یەکەیەکی هاوکار دادەنێــت، بەڵکو هەموو ژیان بە خێزانێکی ڕەچەڵەك نزیك دادەنێت، بەڵکو هەموو گــەردوون بــە یەکەیــەك دادەنێــت، کە ئامانجەکانیان لەگەڵ یەك ناکۆك نین.. ئەمە لەکاتێکدا فەرمان بە هاوکاری لەسەر چاکە و خۆپارێزی دەکات، نەك لەسەر خراپە و دوژمنکاری، بۆیە ڕاووڕوت و تالآن و داگیرکردن حەرام دەکات..

ئــەو هــەموو مــرۆڤایەتی بــە دادوەریــیەکی ڕەهــا دادەنێــت، کــەوا لــە ڕووی ســودمەندبونی تــەواو، لــە ژێــر ســێبەری شەریعەتی خوادا و لەو سیستەمەی، کە خــودا بــڕیاری لەســەر داوە، جــیاوازی لەنــێوان هــیچ ڕەگــەزێك، یان ڕەنگێك یان بیروباوەڕێك دا نیە.

هــەروا ئەو جەنگانەش بەدوور دەخات، کە خۆشەویستی ناووناوبانگی درۆینەی پاشاو پاڵەوانان، یان خۆشەویستی دەستکەوتی تایبەتی و تالآن ، دەیوروژێنێت..

((پــیاوێك هاتــە خــزمەت پێغەمــبەرﷺ و وتــی: پــیاوێك دەجەنگێــت بــۆ دەســتکەوت، پــیاوێك دەجەنگێــت بــۆ ناوبــانگ، پــیاوێك دەجەنگێــت بۆ سەرنج ڕاکێشــانی خــەڵك.. کــێ لەمانە لە پێناوی خودایە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: مَــنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ: ئەو کەسەی بجەنگێت تا تەنها قسەی خودا بەرز بێت، ئەوە لەپێناوی خودایە))[1]

ئــا لــێرەدا ئــەو تاکــە جەنگەی ڕێپێدراوە بەدیار دەکەوێت، کە ئیسلام بڕیاری لەســەر دەدات: ((ئــەو کەســەی بجەنگێــت تــا تــەنها وتــەی خودا بەرز بێت، ئەوە لەپێــناوی خودایــە)). جا ئەو (قسەی خودا)یە چییە، کە ئەو کەسەی لەو پێناوەدا

---

[1] اخرجه خمسة.

بجەنگێت ئەوە لە پێناوی خودایە؟

(قسەی خودا) دەربڕینی ویستەکەیەتی، ویستە ئاشکراکەشی بۆ ئێمەی مرۆڤ ئەوەیە، کە خودای پاك و بێگەرد بڕیاری لەسەر دەدات و بەو فەرمایشتە دیاری دەکات کە دەفەرموێت: ﴿حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّه: هەتا هاوبەش پەرستی ڕونەدات و فەرمان هەمووی بۆ خودا بێت.﴾الأنفال/٣٩.

ئایین و بەرنامەش تەنها بۆ خوا نابێت، مەگەر لە کاتێکدا پەرستراوێتی (الوهیة) و پەروەردگاریەتی(ربوبیة) و عیبادەت و گوێڕایەڵی و ملکەچی تەنها بۆ خوا بێت.. جا خەڵك تەنها یەك خوا دەپەرستن و، لە سیستەمی ژیان و بژێوییاندا تەنها ملکەچی شەرعی خوا و ڕێپێدراوەکانی ئەو خودا تاکە دەبن و، بەرنامەکانی ژیانی دونیایان-هەروەك ژیانی دواییان- تەنها لە پەیڕەو(منهج)ە ڕاستەکەی خوا هەڵدەهێنجن.. تەنها بەمە ئایین هەمووی تەنها بۆ خوا دەبێت-بە مانای ملکەچی تەنها بۆ خوا لە هەموو کاروبارێکی ژیاندا-، بەم شێوەیە تەنها یەك پەروەردگار لەم زەمینەدا دەبێت، نەك چەندین پەروەردگار، کە هەریەکەیان خۆی بە خاوەن مافی یاسا دانان بۆ خەڵك بزانێت، بەڵکو وای دەردەخات-ئەگەریش بە ئاشکرا دەری نەبڕێت- کە ئەو لە زەویدا خوایەکە لەگەڵ زاتی (الله) -یان لەو نزمتر-، جا ئەوکاتە خوای تاك بوونی نابێت و، ئایین هەمووی بۆ خوا نابێت.

ئا ئەمەیە ئەو جەنگەی، کە ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە، بۆ بڕیاردانی پەرستراویی (الله) لە سەر زەوی و ڕەتکردنەوە خودا هەڵبەستراوەکانی دیکە و، لابردنی ئەوانەی -بەکردار یان بە گوفتار- خۆیان بە خودا دەزانن و، چەسپاندنی دەسەڵاتی خوا لە زەویدا. تاکو ئایین هەمووی بۆ خوا بێت، هەتا خەڵك هەندێك هەندێکی دیکەیان بە پەروەرگار نەگرن بێجگە لە زاتی (الله).!

بێگومان ئیسلام بۆ هەموو مرۆڤایەتی هاتووە، جا لە هاتنەدی فەرمایشتی خودایە، کە ئەو خێرەی ئیسلام هێناویەتی بگاتە هەموو خەڵك و، هیچ بەربەستێك لەنێوان ئەوان و ئەم ئیسلامەدا نەبێت. هەر کەس لە ڕێگای ئەم خێرەدا بوەستێت و نەهێڵێت بگاتە تێکڕای خەڵك و، بەزۆری زۆرداری ببێتە بەربەست لە بەردەمیان، ئەوا ئەو کەسە دەستدرێژی کردۆتە سەر فەرمایشتی خوا،

کەواتــە لابردنیشی لە ڕێگای بانگەواز، بەدیهێنانی فەرمایشتی خوایە، نەك بەزۆر سـەپاندنی ئیسـلام بەسەر خەڵکدا بێت، بەڵکو تا سەربەستیی ناسین و هەڵبژاردنی ڕێنوێنیـیان پێ ببەخشرێت.. ئیسلام زۆر لەکەس ناکات بۆ لەخۆگرتنی؛ ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِــي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الغَيِّ: لەم ئاییـنەدا بەزۆر سەپاندن نیە، شارەزایی لە گومڕایی هاوێرکرا.﴾البقرة/٢٥٦.

بـەڵام ئەوانـە ناچـار دەکات کە بە هێز لە ڕێگای ئەم ئاییـنە دەوەستن و خەڵکی لێ دەڕەوێننەوە، یان لە ڕێگای دەسەڵات بەسەردا شکانەوە ڕێگرییان لێ دەکەن و، بـواری هاوێرکـردنی شـارەزایی لـە گومڕاییـیان پێنـادەن و، لـە مافی هەڵبژاردن بێبەشـیان دەکـەن.. ئەمەیـە ئـەو جەنگـەی ئیسلام بڕیاری لەسەر دەدات و هانی دەدات، هـەروا بـانگی پێغەمـبەرەکەی دەکـات، کـە بـڕواداڕانی بـۆ هـان بدات، ئەوانەشــی خــۆش دەوێــت کــە ئــەنجامی دەدەن و، بەڵێـــنی بەرزتــرین پلــەکانی ڕەزامەندییان پێدەدات:

﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَــيْنِ وَإِنْ يَكُــنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَفْقَهُونَ: ئێسـتا خـودا کـە دەزانـێ وڕەو تواناتان کەم بوە، کاری بۆ هاسان تر کردن. بەگەر ئـێوە سـەد کـەس بـن و خۆڕاگـر بـن، دەرەقـەتی دووسەتان دێن. خۆ ئەگەر ئێوە هـەزاری خۆڕاگـر بـن-بەئـیزنی خـوا- دەرۆسـتی دوو هـەزاریان دێن. خوا دەگەڵ خۆڕاگرانە.﴾الانفال/٦٥.

﴿قَــاتِلُوا الَّذِيــنَ لاَ يُؤْمِــنُونَ بِاللَّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُــولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُــمْ صَاغِرُونَ: وەل ئەوانەدا بجەنگن کە بەخودا و ڕۆژی سەلا بێباوەڕن و هەرچی خـوا و پێغەمـبەری خـوا بـەناڕەوایان زانیوە، ئەمان بەڕەوای دەزانن و نایەنە سەر دیـنی ڕاسـتیش، تـا ئەوکاتـەی بەزەلیـلی و بەدەسـتی خـۆ، سـەرانەی خۆ بەنگۆ دەدەن﴾التوبة/٢٩.

﴿إِنَّ اللَّـهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ: خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە بە ریزێکی پتەو لەپێناویدا دەجەنگن، هەروەکو دیواری پتەو وان.﴾الصف/٤.

ئیسلام هاتووە تا دادوەری لەسەرتاپای زەوی بەدی بهێنێت و، یەکسانی لەنێوان تێکڕای مرۆڤەکان بەرپابکات، دادوەری بە هەموو جۆرەکانیەوە، دادوەری کۆمەلآیەتی، دادوەریی یاسایی، دادوەریی نێودەوڵەتی، جا هەر کەس دەستدرێژی و زۆرداری بکات و خۆی لە دادوەری لابدات، ئەوا پێچەوانەی قسەی خوای کردووە، لەسەر مسوڵمانان پێویستە بجەنگن بۆبەرزڕاگرتنی قسەی خودا و، ئەوانە بگەڕێنێتەوە لای خۆی، کە لێی پەرتەوازە بوون، ئەگەریش شمشێریان لەڕووی مسوڵمانە یاخییەکان بەرز بکەنەوە، کەواتە دادوەری ڕەها و، بەرپەرچ دانەوەی دەستدرێژی و دوژمنکاری، ئەو ئەو فەرمایشتەی خوایە کە پێویستە لە هەموو بار و شوێنێکدا بەرز بێتەوە:

﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ: هەرکاتێ دوو کۆمەڵ لە بڕواداران بەشەڕ هاتن، ئێوە ئاشتیان بکەنەوە؛ ئەگەر لایەکیان دەستدرێژی کردە سەر ئەوی دیکە، ئێوە دژی دەستدرێژکارەکە بجەنگن، تا بۆ فەرمانی خوا مل کەچ دەکات.. ئەگەر ملکەچ بوو ئەوا بە دادگەری پێکیان بێنن و خوا دادگەرانی خۆش دەوێت.﴾الحجرات/٩.

ئەگەر ئیسلام بانگی مسوڵمانان بکات، تا دژی مسوڵمانە دەستدرێژکارەکان بجەنگن بۆ بەرپەرچ دانەوەی دەستدرێژی و وەدیهێنانی دادوەری، کەواتە بانگیان دەکات بۆ لادانی هەموو ستەمێك. لادانی ستەم لە خۆیان و، لە هەموو ستەم لێکراوێك کە ناتوانێت لەخۆی لابدات، بەو مەرجەی لە کاتی پەرچ دانەوەی دوژمنکاریدا زیادەڕۆیی و دەستدرێژی نەکەن:

﴿وَقَــاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ: لەپێـناوی خـوا لەگـەڵ ئەوانـەدا بجـەنگن کـە شەڕتان پێ دەفرۆشن و، دەستدرێژی مەکەن، خوا دەستدرێژکارانی خۆش ناوێت.﴾البقرة/١٩٠.

﴿وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِيـــنَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَـــل لَـــنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا: چیتانە بۆ ناجەنگن لە پێناوی خودا و، ئەو پیاو و ئافـرەت و مـنداڵە بێدەسەڵاتانەی دەڵێن: پەروەردگارا! ڕزگارمان کە لەم شارە کە خەڵکەکـەی سـتەمکارن و، لـەلای خۆتـەوە دۆسـت و پشـتیوانێکمان بـۆ دابـین بکە.﴾النساء/٧٥.

تـەنها بـۆ ئـەم مەبەستە بەرزانە ئیسلام شمشێر هەڵدەگرێت و، جیهاد بە مەزن دەگرێت و، وادەی بەرزترین پلەکانی شەهیدی و پاداشت بە موجاهیدان دەدات:

﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّـــهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ: خـودا، گیان و سـامانی بـڕوادارانی کـڕیوە و لە باتیاندا بەهەشتیان پێدەبەخشێت، باوەڕدارانیش ئەوانـەن کـە لـە ڕای خـوا دەجـەنگن، جـا دەکوژن و دەشیانکوژن، پەیمانێکە و لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا لەسەر خۆی داناوە.﴾التوبة/١١١.

﴿وَلاَ تَحْسَـــبَنَّ الَّذِيـــنَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ، فَـــرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ أَلاَّ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ، يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْـــرَ الْمُؤْمِـــنِينَ: ئەوانـەی لـەڕێی خـودا کوژراون، هەرگیز بە مردوویان حیساب مەکەن، بەڵکو زیندون و پەروەردگاریان بژێویان دەداتێ، دڵیان خۆشە بەو چاکەیەی خـودا دەربـارەی کـردون، شـادن بەوەش کە ئەوانەی وا نەگەیشتونە ئەمان و بەجێ مـاون، هـیچ ترسێکیان لەسەر نابێ و هیچ خەمێکیان لەبەر نابێ، دڵیان خۆشە بە نـیعمەتی خودا و زیادەبەشانەی ئەو، بەوەش کە خودا پاداشی باوەڕدارەکان بە زایە نادا.﴾آل عمران/١٦٩-١٧١.

تـەنها لەبەر ئەم مەبەستە بەرزانە داوایان لیّ دەکات خۆیان بۆ ساز بکەن و هێز ئامادە بکەن و، سست نەبن، کە داوای ئاشتیی هەرزان فرۆش بکەن:

﴿وَأَعِـــدُّوا لَهُـــمْ مَـــا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُـــمْ: تـا بۆتان دەکرێ چەك و جبەخانەی شەڕ و ئەسپ سواری پەیدا بکەن؛ دوژمنی پێ بترسێنن، کە دوژمنانی خوداشن.﴾الأنفال/٦٠.

﴿فَـــلاَ تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنْتُمُ الأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ وَلَنْ يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ: سست مـەبن و داوای ئاشـتی بکـەن، لەکاتـێکدا ئـێوە زاڵن بەسەریاندا و خواش لەگەڵتانە، کردارەکانیشتان نەبڕاوەیە.﴾محمد/٣٥.

خـۆ ئامادەکـردن و دابین کردنی هێز، هەر بۆ خۆی مەبەستە و، پێویستیەکە لە پێویسـتیە گـرنگەکانی بـزاڤی ئیسلامی.. هەڵبەت ئیسلام دوا پەیامی خودایە بۆ مـرۆڤ و، کۆکـەرەوەی ئـەو عەقـیدەیە، کە خوای گەورە بۆ خەڵکی دەوێت و، ئەو (ئـایین)ەیـە کە هەر یەك لە پێغەمبەران بنەما سەرەکیەکانیان هێناوە. ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ: ئـایین و بەرنامە لای خودا هەر ئیسلامە.﴾آل عمـران/١٩. ﴿وَمَنْ يَبْـتَغِ غَـيْرَ الإِسْـلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ: هـەر کەس بێجگە لە ئیسلام بە ئایین و بەرنامەی خۆی بخوازێت، لێی وەرناگیرێت.﴾آل عمـران/٨٥.

هاتـنی هەر پێغەمبەرێك بۆ ئەوە بووە فەرمان بە خەڵك بکات، کە تەنها زاتی (الله) بەبێ هاوبەش بپەرستن و، بەبێ دوودڵی ملکەچی خوای تاك بن: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِـنْ قَـبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدُونِ: بـەر لەتۆش هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە، مەگەر سروشمان بۆ کردبێت کە هیچ خودایە نیە بێجگە لە من-زاتی الله-، جا بمپەرستن.﴾الأنبیاء/٢٥.

پاشـان (محمـد) ئـەم ئاییـنەی هێنا؛ ﴿مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَـيْهِ: وەك سەلماندنی کتێبەکانی بەردەستی ئەوان و، چاودێر بەسەریاندا.﴾المائدة/٤٨.

کەواتـە ئەمـە دوایـەمین پەیامـە، ئامۆژگـاری و ڕاسپاردەیە بۆ گیانی هەموو مـرۆڤایەتی و تـێکڕای ژیـانی، ئامۆژگاریکـاریش پێویسـتی بـە هـێزێك هەیە بۆ

بـڕیاردانی ئامۆژگاریـەکانی، نـەك لـەڕێگای زۆرکاری و تۆقاندن، بەڵکو لەڕێگای ڕێزلێنان و شکۆمەندیەوە.

خەڵکـیش هـەر ئـەو خەڵکەیـە، ئەگەر بەربەرچێکی بەهێز نەبێت بۆ پاراستن و چـاودێری سنورەکان، ئەوا لاڕێ دەبن.. کەواتە پێویستە هێزێك هەبێت حیسابی بۆ بکـەن، ئەگـەریش دەسـتی پـێ نەگەیشـتبێت.. ڕێـی ڕاست بەبێ چەك فەرامۆش دەکرێت و چاکەی بێدەسەڵاتیش پشتگوێ خراوو فڕێدراوە.

جـا سـازکردنی هـێز واجـبە، واجبە تاوەکو لەم زەویەدا دەسەڵاتێکی هەرەبەرز پـەیدا ببێـت، ئەوانـە بگێڕێـتەوە کـە لە حەق هەڵدێن و، بەربەرچی دەستدرێژی و دوژمـنکاری زۆرداران بداتـەوە و، ئاسـایش و سـەلامەتی ئەوانـە بپارێزێت کە لە دلنیایـیدا دەژیـن و، فەرمایشـتی خوا لە سوکایەتی و بە کەم گرتن، بەرز و بەڕێز بگرێـت و، بـڕیاری دەسـەڵاتی خـوا لەسەر زەوی بدات و، بەهۆی دەسەڵاتەوە خوا بەیەك بگرێ.

بـەلام کاتـێك سەربەسـتی قەدەغەکـراو وەدی دێت و، کەس بەزۆری ڕێی وتەی خـودای لێ ناگیرێت و، لەو ئایینەی خودا لانادرێن، کە ڕەزامەندی لەسەرە بیکەنە سیسـتەمێکی گشـتگیر(شـامل)ی ژیـان، ئـەو کاتـەی دەسـەڵاتێك لەسـەر زەوی هەڵناسـێتەوە خـەڵکی سـەر زەوی بکاتـە بـەندە و کۆیلـەی کەسانێکی بێجگە لە خودا.. ئەو کاتەی دادوەری تەواو وەدی دێت، کەس دەستدرێژی ناکاتە سەر کەس، کـەس سـواری مـلی کەسـی دیکـە نابێـت، کاتـێك هێمـنی و دلـنیایی بـۆ ئـەو بێدەسـەڵاتانە دابـین دەکرێـت، کـە نـاتوانن بەرگـری لـەخۆیان بکـەن، کاتـێك دەسـتدرێژکار واز لـە دەسـتدرێژی دەهێـنێ و ئاشتی و ئارامی قبوڵ دەکات.. ئەو کاتـە ئیسـلامی خـاوەن هـێز و ئامادە بۆ هەر ناکاوییەك، شمشێر بەلاوە دەنێت و یەکسەر داوای ئاشتی دەکات:

﴿وَإِنْ جَـنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ: ئەگەر داوای ئاشتییان کرد، قبوڵی بکە و پشت بەخوا ببەستە.﴾الانفال/٦١.

﴿وَقَــاتِلُوهُمْ حَــتَّى لاَ تَكُــونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّه: لەگەڵـیان بجەنگن هەتا هاوبەش پەرستی ڕونەدات و فەرمان هەمووی بۆ خودا بێت.﴾الأنفال/٣٩.

ئەمــە پوختــەی بیرۆكــەی ئاشــتیە لــە ئیســلامدا: ئاشتی بناغەیە و جەنگیش پێویســتییە، پێویســتییە بــۆ بــڕیاردانی دەسەڵاتی خودا لەسەر زەوی، تا خەڵك لە بەندایــەتی غەیــری خــوا ڕزگاریان بێت. پێویستییە بۆ بەرپەرچی دەستدرێژكاران و وەدیهێــنانی وتــەی خــودا و دادوەریــی خودا.. پێویستییە بۆ وەدیهێنانی چاكترین مــرۆڤایەتی، نــەك چــاكترین كۆمــەڵ، یــان چــاكترین ڕەگــەز، یــان چــاكترین تاك. پێویســتییە بــۆ وەدیهێــنانی نمونــەی بــەرزی مــرۆڤایەتی، كە خودا كردوویەتی بە مەبەســتی ژیانی دونیا.. پێویستییە بۆ دڵنیاكردنی خەڵك لە فشار و ترس و ستەم و زیــان لــێدان.. پێویســتییە بۆ وەدیهێنانی دادوەریی ڕەها لە زەویدا، جا ئەوكات. قسەی خودا بەتەنها بەرز و بڵند دەبێت.

واقــیعی مــێژوویی ئیســلام ئــەو ڕێبیر(مبدأ)ە بیردۆزەییانە دەسەلمێنن، (محمد) هــات و فــەرمانی پێكــرابوو، كــە پەیامەكــە بە تێكڕای خەڵك ڕابگەیەنێت: ﴿وَمَا أَرْسَــلْنَاكَ إِلاَّ كَافَّــةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا: ئــێمە تۆمان هەر بۆیە نارد تا بۆ گشت خەڵكی سەر زەمین موژدەدەر و ترسێنەر بیت.﴾سبأ/٢٨.

هــەروا بانگــەوازی خــودا بەبێگــەردی ڕابگەیەنێــت بەبێ ئەوەی منەت بەسەر كەســدا بكات یان كرێ وەربگرێت: ﴿يَاأَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ، وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ، وَثِيَابَكَ فَطَهِّــرْ، وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ، وَلاَ تَمْنُنْ تَسْتَكْثِرُ، وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ: ئەی ئەو كەسەی خۆت داپۆشــیوە! ڕابــە، خــەڵك ئاگــادار بكــەوە، پــەروەردگارت بەگــەورە بگــرە، جل و بەرگیشــت خاوێن ڕاگرە، لە هەموو پیسییەك بەدوور كەوە، بەو نیازە مەبەخشە تا زیاترت پێ بدرێتەوە، بۆ خاتری پەروەردگارت خۆڕاگر بە.﴾المدثر/١-٧.

هەروا بانگەوازەكەی بەرێگای گفتوگۆ بە چاكترین شێوە و، قەناعەت پێهێنانی بــە بەڵگــەدا بــبات، بــەبێ دڵــڕەقی و توندوتیژی: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَــةِ الْحَسَــنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ: بە دانایی و ئامۆژگاری پەسند،

خەڵك بەرەو ڕێگەی پەروەردگارت بانگ بکە و بە چاکترین شێوە لەگەڵیان بدوێ. ﴾النحل/ ١٢٥.

﴿وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَنْ يَخَافُ وَعِيدِ: تۆ زۆردارێك نیت لەسەریان، هەرکەسێکی لە هەڕەشە ترسی هەیە، بەم قورئانە وەبیری بخەرەوە. ﴾ق/ ٤٥.

بانگەوازەکە لەسەر ئەم بناغەیە ڕێگەی گرتەبەر، (محمد) هیچی لە خەڵك نەدەخواست تەنها ئەوە نەبێت، کە گوێی بۆ ڕاگرن، جا ئەگەر دڵەکانیان بەرەو بڕوا هاتن با بڕوا بێنن، ئەگەریش دڵەکانیان ڕەق بوو و گومڕایی دایپۆشیبوو، ئەوا حیسابیان لەسەر خوایە.. هەر کاتێك لە دەسەڵاتی زۆرداران ڕزگاربوون و توانیان بە سەربەستی لە هەڵبژاردندا ڕووبەڕووی ئیسلام ببنەوە، بەبێ هیچ فشارێکی دەسەڵاتداری زۆردار کە لە ڕێنموونی خودا لایان بدات و بەهێز ڕێگەی وەڵامدانەوەی ڕێنمونکارانیان لێ بگرێت.

بەڵام نەفامەکان بە ئاشتی لەگەڵ (محمد) ڕەفتاریان نەکرد، لێنەگەڕان بانگەوازی ئاشتیانە ڕێگەی خۆی بگرێ، هەروا سەربەستییان لەوانە گرت، کە بە سەربەستی خۆیان هاتونەتە ناوی، ئەوەبوو ئازاریان دان و لە وڵات و ناو ماڵ و منداڵی خۆیان دەریان کردن و، لە هەر کوێیەك بیاندیتبان لەگەڵیان دەجەنگان، بە هێزی ماددیی دوور لە قەناعەت پێهێنان، ڕێگر بوون لەنێوان بانگەوازیی و گوێچکەکان.

ئا لەو کاتەدا ئیسلام شمشێری هەڵگرت، تا بەرگری لە یەکێك لە ڕێبیر(مبدأ)ە بنچینەییەکانی بکات؛ ڕێبیری ئازادیی بانگەواز و ئازادی عەقیدە: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ، الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلاَّ أَنْ يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ وَلَوْلاَ دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ: مۆڵەت درا بەوانەی دەجەنگن، لەبەر ئەوەی ستەمیان لێکراوە، خوداش دەتوانێ بەسەریان بخات.. ئەوانەی بە ناڕەوا لە زێدی خۆیان دەرکرد، گوناهیان هەر ئەوەبوو کە دەیانوت: خودا پەروەردگارمانە.. ئەگەر خودا هەندێکی بە هەندێك ڕاو

نـەنابا، ئـەوا دێـر و کلێسـا و کەنشـت و ئـەو مزگەوتانەی زۆر یادی خودای تێدا دەکرێت وێران دەکران.. خوداش ئەوانە بەسەر دەخات کە ئەو بەسەر دەخەن، خوای گەورە بەهێز و دەسەڵاتە.﴾الحج/٣٩-٤٠.

پێغەمـبەرﷺ لـە سـەرەتای هاتنی بۆ مەدینە ئاشتی لەگەڵ هەموو کەسێکدا دەکـرد، کـە داوای ئاشـتی کـردبا، یـان پەیمانی لێ وەرگرتبا، جا جەنگی لەگەڵدا نەدەکـردن، مەگـەر ئەوانـەی پەیمانەکانـیان شکاند و، لەگەڵ کافران پیلانیان دژی مسوڵمانان دارشت. هەر لەبەر ئەمە بوو جەنگی (بەنی قریظة) ڕویدا، دوای ئەوەی پشـتیوانی کۆمـەڵانی کوفـریان کـرد لـە دژی مسـوڵمانان لە غەزای (خەندەق)دا، هـەروەك پێشتریش غەزای (بەنی نەضـیر) و غەزای (بەنی قینوقاع) ڕوویدا، کاتێك پەیمانەکانـیان لەگـەڵ پێغەمـبەردا بەسـوك گـرت، کـە ئەمـەش جێبەجێکـردنی فەرمانی خودا بوو لەبارەی پەیمان شکێنەکان:

﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللَّهِ الَّذِينَ كَفَرُوا فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ عَاهَدْتَ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لاَ يَتَّقُونَ، فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي الْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ: خراپترینی زیندەوەران لەلای خودا ئەو کەسانەن کە خودایـان نەناسـیوە و ئیتریش بڕوا ناهێنن.. ئەو کەسانەی پەیمانت دەگەڵ بەستن و، لـە پاشـانا هـەموو جـاران پەیمانـیان هەڵدەوەشـێنن و هـیچ ترسی خودایان نیە.. ئەوانـەت لەشـەڕدا بەگیرهێـنان، وێڕای ئەوانەش کە هاتون پشتیان بگرن، بڕەتێنە، بەشکو ئەمێ گرتو بن.﴾الأنفال/٥٥-٥٧.

پێغەمـبەرﷺ لەگـەڵ قوڕەیـش جـەنگا؛ ئـەو قوڕەیشـەی پێشـتر بـە هاوبەشپەرسـتیەکەیان دەسـتدرێژییان کـردە سـەر دەسـەڵاتی خـودا. پاشـان دەسـتدرێژییان کـردە سـەر ئەو مسوڵمانانەی، کە گرێی هاوبەشپەرستیان لەخۆیان دامـاڵی. جەنگەکەش بەرگری بوو لە پەروەردگارێتی خودا و، پاشان بەرگری بوو لە بەندەکانی..

مـەرجی چوارەمی پەیمانی حودەیبیە، کە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ قورەیش بەستی، ئـەوەبوو: ((هەرکـەس چـووە نـاو هاوپەیمانـیەتی قورەیش، ئەوا لە پەیمانەکەدایە، هەرکەس چووە ناو هاوپەیمانیەتی محمد، ئەویش لە پەیمانەکەدایە)).

لەسـەر ئـەم رێکەوتـنە (بەنوبەکـر) بوونە هاوپەیمانی قورەیش و، (خوزاعە)ش بوونـە هاوپـەیمانی (محمد). هۆزی خوزاعە لە نەفامیشدا هاوپەیمانی (عبدالمطلب)ی بـاپیری (محمـد)ﷺ بـوو، بۆیـە ویسـتی پەیمانەکـەیان لەگـەڵدا نـوێ بکاتـەوە، پەیمانەکـەیان لەگـەڵ (عبدالمطلب) ئـەم بـڕگەیەی لـەخۆ گرتـبوو: ((عبدالمطلب و کوڕەکـەی و، پـیاوانی خوزاعـە پشـتیوان و هاوکـاری یەکدین، لەسەر عبدالمطلب پێویستە پشتیوانییان بکات، خوزاعەش پێویستە لەسەریان عبدالمطلب و کوڕەکەی بەسـەر بخـەن بەسـەر هـەموو عـەرەبدا لـە رۆژهـەڵات و رۆژئـاوا و، لە خۆشی و ناخۆشیدا)).

پێغەمـبەرﷺ بـڕیاری لەسـەر ئـەو پەیمانـنامەیە دا، بـەڵام دوو مـەرجی بـۆ زیادکـرد، کـە تیایدا دیاریی دەکات هاوکاری و سەرخستن لەچیدا دەبێت، تا لەگەڵ بـنەما سـەرەکیەکانی ئیسـلامدا بگونجێـت. ئـەو دوو مەرجـەش ئـەوەبوو کـە: ((پشـتیوانی خوزاعـە ناکـات ئەگەر ستەمکار بوون)) و ((خوزاعە بەسەر دەخات ئەگەر ستەمیان لێکرا)).

خوزاعــە تـا ئـەو کاتـەش ئیسـلام نەبووبوون، بەڵام (محمد) بەناوی ئیسلامەوە پەیمانـیدا، کـە لەدەست ستەم بەسەریان بخات، چونکە ئیسلام قینی لە هەموو جۆر و شـێوەکانی سـتەمە، بۆیـە هەوڵی لادانی دەدات، جا چ لەسەر مسوڵمانان بێت، یان لەسەر هەڵگرانی ئایینێکی دیکە بێت.

پێغەمـبەرﷺ دەربارەی پەیمانی (فضول) کە لە نەفامیدا بەسترابوو، فەرمووی: ((لـە ماڵی عبداللە کوڕی جدعان ئامادەی پەیمانێك بووم، حەزناکەم لەجیاتی ئەوە خـاوەنی کۆمەڵـێك حوشـتری سـور بم، ئەگەر لە ئیسلامیشدا بۆ ئەوە بانگم بکەن وەڵام دەدەمەوە)).[1]

---

[1] رواه ابن هشام في السيرة من حديث ابن اسحاق.

دەبێ ئەو پەیمانە چی تێدابووبێت، کە وا (محمد) ﷺ ئەزناکات کۆمەڵێك حوشتری چاك و جوانی هەبێت و بیشکێنێت؟ ئەوە ئەو پەیمانەیە کە بەنی هاشم و مطلب و، (أسدی کوڕی عبدالعزی) و، (زوهرەی کوڕی کیلاب) و، (تیم کوڕی موڕە) لەسەری کۆبوونەوە و، تیایدا پەیمانیان دا لەسەر بەرپەرچ دانەوەی ستەم و سەندنەوەی مافی ستەملێکراو لە ستەمکار. پێغەمبەریش ﷺ لەو کاتەدا تەمەنی (٢٥) ساڵ بوو، پێش پێغەمبەرایەتی.

هیچ رۆژێك مەبەستی جەنگ لە ئیسلامدا بۆ بەزۆر ئیسلام کردنی خەڵك نەبووە، نە لە بنەما تیرۆیەکانی و نە لە واقیعە مێژووییەکەی. مەگەر چەند لادانێکی لابەلا نەبێت، کە لەوانە ڕوویداوە کە لە هەقیقەتی بانگەوازی ئیسلامی تێنەگەیشتوون، ئەوانەش لەسەر ئایینەکە حسێب ناکرێن، چونکە لە ئایینەکەدا نیە، ئیسلامیش بە شمشێر بڵاو نەبۆتەوە، هەروەك نەفامەکان و دوژمنەکانی بۆیان هەڵبەستووە. جەنگیش تیایدا هەرگیز بۆ بەزۆر مسوڵمان کردنی خەڵك نەبووە، بەڵکو بۆ لابردنی ئەو زۆردارانە بووە، کە دەبنە بەربەست لەنێوان خەڵك و بیستنی بانگەوازەکە، یان ئەوانە لە دینەکەیان لادەدەن، کە بە قەناعەتەوە هەڵی دەبژێرن، هەروا بۆ لابردنی ئەو زۆردارانە بووە، کە بانگەشەی مافی خوایەتییان کردووە و خاسیەتەکانییان داگیر کردووە و خەڵکیان کردوەتە بەندەی خۆیان، خوداش دەیەوێت خەڵك تەنها یەك پەرستراویان هەبێت و، ئاین و بەرنامەش تەنها بۆ (الله) بێت.

(سیرت و. ئارنۆڵد) لە کتێبەکەیدا (الدعوة الی الاسلام) کە (حسن ابراهیم حسن) و هاوڕێکەی بۆ عەرەبی وەریانگێڕاوە، لە لاپەڕە (٥١)دا دەڵێ:

"لەو نمونانەی پێشکەشمان کردن دەربارەی ئەو لێبوردەییەی مسوڵمانە سەرکەوتوەکان لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا بەسەر عەرەبە مەسیحیەکاندا بڵاویان کردەوە و، بۆ چەندین نەوەی دوابەدوای یەکیش بەردەوام بوو، دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی، کە ئەو هۆزە مەسیحیانەی بوونە ئیسلام، بە هەڵبژاردنی خۆ و ویستی

ئـازاد بـووه، ئەو عەرەبە مەسیحیانەی لەم کاتەدا لەنێوان کۆمەڵە مسوڵمانەکاندا دەژین گەواهی ئەم لێبوردەییە دەدەن."

هەروا لە لاپەڕە (٤٨)دا دەڵێت:

"دەتوانـین لەو پەیوەندییە دۆستانەیەی نێوان مەسیحی و مسوڵمانە عەرەبەکان پـەیدا بـوو، بـڕیاری ئـەوە بدەیـن، کـە هێز هۆکارێکی یەکلاکەرەوە نەبووە لە بە ئیسـلام کـردنی خـەڵك، ئـەوەتا (محمد) خۆی هاوپەیمانی لەگەڵ هەندێك لە هۆزە مەسـیحیەکان بەسـتووە و، پاراسـتن و ئـازادیی ئـەنجامدانی دروشمە ئاینیەکانیانی گـرتوەتە ئەسـتۆ، هـەروا بواری بە پیاوانی کەنیسە داوە، ماف و دەسەڵاتی خۆیان پـیادە بکـەن. هاوپەیمانـیەکی وەك ئەمـەش لەنـێوان شـوێنکەوتوانی پێغەمبەر و هاوڵاتیەکانیاندا هەبووە کە لەسەر دینی کۆنی خۆیان و بتپەرستی مابوونەوە".[1]

ئەمـە و هاوشـێوەکانی ئەو بانگەشەیە دەڕەوێننەوە و، ئەوەش دەچەسپێنن، کە جەنگـەکانی ئیسلام بۆ زۆرلێکردنی خەڵك نەبووە تا بێنە ناو ئەم ئایینە، هەروا بۆ داگیرکـردن و چەوسـاندنەوە و سەرشـۆڕکردن نەبووە. بەڵکو بۆ بەرزکردنەوەی وتەی (الله) لەسـەر زەوی، کـە دەسـەڵاتی بـەرز تیایدا بەوانە دەدات، کە بە تەنها زاتی (الله) بەخوا دەزانن.

هـەروا گـەیاندنی ئەو خەیرەی، کە ئیسلام بۆ هەموو خەڵکی هێناوە بە ڕێگای ڕەزامـەندی و قەناعەتـەوە بـووە. هـەروا بـە بەجێهێـنانی دادوەری و ئاسـایش و ئاشـتی، لـە سـایەی دەسـەڵاتی خوای تاکدا بووە.. لە سایەی ئەو دەسەڵاتەدا، کە بـڕیاری بەرنامـەی ژیـانی خەڵك دەدات، ئەو خەڵکە تیایدا ئازادن، کە هەر تاکێك بیروباوەڕی خۆی بەبێ فشار و زۆرلێکردن هەڵدەبژێرێت..

---

[1] لێرەدا پێویسـتە ئاگـاداری ئـەوە بـین کـە ئـەو هاوپەیمانـیە لـە قۆناغـێك لە قۆناغەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیدا بووە، ئەو دەربڕینەی ڕۆژهەڵاتناس (ت.و.ئارنۆڵد) نیازێکی شاراوەی لە پشـتە و پێویسـتە ئاگـاداری بین! بۆ زیاتر زانینی ئەو هەقیقەتە بگەڕێوە بۆ کتێبی (معـالم في الطريق) بەشی (الجهاد في سبيل الله).

لێدوان دەربارەی سروشتی ئاشتی لە ئیسلامدا تەواو نابێت، هەتا ئاماژە بەو بوارە نەدەین، کە ئیسلام کاری تیا دەکات. ئیسلام لە سروشتە گشتییەکەیدا لە تێڕوانینی بۆ ژیان، ئاشتی بەش بەش ناکات و، داواش ناکات لە تاکە بوارێکی ژیان دابنرێ. بەڵکو هەموو ئاشتی بە یەك پارچە تەماشا دەکات و، هەوڵ دەدات لە هەموو بوارەکاندا بەجێی بهێنێت و، پەیوەستی بکات بە تێڕوانینە گشتییەکەی بۆ گەردوون و ژیان و ئادەمیزاد.. بەمەش ئەو وشەی (ئاشتی)یەی، کە ئیسلام مەبەستیەتی دەبێتە خاوەن مانایەکی قوڵتر و گشتگیرتر لەو مانایەی وڵاتەکان لەم سەردەمەدا ئاشنای دەبن.. ئا ئەمە ئەو ئاشتییەیە، کە وتەی خوا لەسەر زەوی بەجێ دەهێنێت، لە سەربەستی و دادوەری و ئاسایشی هەموو خەڵك، نەك وازهێنان لە جەنگ بە هەر نرخێك بێت، هەرچەندە ستەم و خراپەکاری لەسەر زەوی ڕووبدات! هەرچەندە زۆرداری و دەستدرێژی کردنە سەر دەسەڵات و خوایەتی زاتی (الله) ڕووبدات!

ئەو کاتەی ئیسلام هەوڵ دەدات بڕیاری ئاشتی گشتگیر بدات بەپێی بنەما هەرە بەرزەکانی لە بەجێهێنانی وتەی خوا، لەبواری ئاشتی دەوڵەتانەوە دەست پێ ناکات، چونکە ئەوە کۆتایی قۆناغەکەیە نەك سەرەتاکەی. ئاشتیی دەوڵەتان، تەنها ئەڵقەی کۆتاییە، کە پێش ئەو چەند ئەڵقەی دیکە هەن.

ئیسلام یەکەمجار لە ویژدانی تاکەوە هەوڵی ئاشتی دەدات، پاشان لە چوارچێوەی خێزان، ئنجا لە نێوەندی کۆمەڵدا. لە کۆتاییدا لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتی لە نێوان کۆمەڵ و گەلان هەوڵی بۆ دەدات.

ئیسلام داوای ئاشتی دەکات لە پەیوەندی تاك بە پەروەردگاریەوە، لە پەیوەندی تاك بە خۆیەوە، لە پەیوەندی تاك بە کۆمەڵەوە. ئنجا لە پەیوەندی هۆزێك بە هۆزێکی دیکەوە، لە پەیوەندی تاك بە حکومەتەکانەوە، پاشان دوای ئەو هەنگاوانە، داوای ئاشتی دەکات لە پەیوەندی دەوڵەتێك بە دەوڵەتانەوە.

جا بۆ بەجێهێنانی ئەو ئامانجەی دوایی، بە ڕێگایەکی دوورودرێژدا دەڕوات، تیایدا لە ئاشتیی ویژدانەوە دەپەڕێتەوە بۆ ئاشتی ناو ماڵ، بۆ ئاشتی کۆمەڵگە، لە کۆتاییدا بۆ ئاشتی جیهان.

با لە پێناوی ئاشتیدا سەرنج بدەینە هەنگاوەکانی ئیسلام...

# ئاشتیی ویژدان

ئاشــتیی جیهان هەرگیز بەرقەرار نابێت، هەتا ویژدانی تاك لە ئاشتیدا نەبێت.. ئەمــەش تێڕوانیــنی ئیســلامە.. ئەگەر بیەوێت ئاشتی جیهانی لەسەر بناغەیەكی جێگیر و چەسپاو دابمەزرێنێت، ئەوا لە ناخی ویژدانەوە دەست پێ‌دەكات.

لــە سیستەمی ئیسلامیدا تاك بەهایەكی بنەڕەتی هەیە، كە یەكەمین خشتە لە دروســتكردنی كۆمــەڵدا، لــە ویژدانیشــدا یەكــەمین تــۆوی بیروبــاوەڕ دەڕوێــت، لــە ڕەفتارەكانــیدا بیروبــاوەڕە شــاراوەكەی بــە ئاشــكرا دیار دەكەوێت، بەڵكو خۆیشی دەبێتە ڕەنگدانەوەیەكی زیندووی ئەو بیروباوەڕە.

ئیســلام تــۆوی ئاشتی لە ویژدانی تاكدا دەڕوێنێت، ئاشتیەكی ئیجابی كە ژیان بــەرز و باڵادەكــات، نــەك ئاشــتیەكی ســلبی، كە بە هەموو شتێك ڕازی بێت، لێ بگەڕێت لە پێناوی ساغ و سەلامەتیدا بنەما بەرزەكانی ژێر پێ بكەوێت.

ئاشتییەكی هەڵقوڵاو لە هاوڕێكی و پێكەوە گونجان، كە لە ئاشكرایی و بێ‌چەند و چــون و ڕێــك و پــێكی پــێكهاتووە! لــە بەربەرەڵاكــردنی هــێز و وزە چــاكە بنیاتــنەرەكان، هــەروا لە پاكخوییكردنی حەز و ئارەزووەكان دروست بووە، نەك لە خەفەكردن و خەواندن و خاوەخاوی.

ئاشــتییەك كە دان بە بون و حەز و سۆزی تاكەكان دا دەنێت و، لە هەمان كاتدا دان بــە كۆمــەڵ و بــەرژەوەندی و ئامانجەكانــیدا دەنێــت، هــەروا بــە مرۆڤایەتی و پێویســتی و هەســت و ســۆزەكانی و، بە ئایین و وەدیهێنراوەكان و نموونە.. هەموو ئەمانە بەشێوەیەكی گونجاو و هاوڕێك لەگەڵ یەكدیدا.

## ژیربێژی و بیروباوەڕ

ئیســلام هــەر لــە یەكــەم هــەنگاوەوە، ئاشــتی لەنــێوان ژیربێژیی مرۆڤایەتی و بیروبــاوەڕی ئایینی گرێدەدات. ئیسلام بیروباوەڕێكی ساكار و ڕوونە، هیچ ئاڵۆزی و تەم ومژی تێدا نیە.

زاتـی (الله).. هیچ هاوشێوەیەکی نیە. وەدیهێنەری هەموو شتێکە. (محمد)یش مرۆڤـێکە وەك هـەموو مرۆڤـێکی دیکە، خوا سروشی بۆ کرد، کە رێنمونی خەڵك بکـات بـۆ پەرستنی خودای تاك و تەنیاو بێهاوبەش، لە هەموو کاروبارێکی دونیا و دوارۆژدا ئـایین و بەرنامـە تەنها بۆ خوا بێت بەبێ هاوشان. خودا یەك لە سیان و سیان لە یەك نیە، نە باوکە و نە لەدایك بووە.. (محمد) مرۆڤو خوا نیە، لە زەویدا پێغەمبەر و لە ئاسماندا پەروەردگار نیە!

لـە ئیسـلامدا مەتەڵ و سەر لێتێکدان نیە، کە لە روناکی ڕابکات و، ژیربێژی مـرۆڤ لـە سەرسـامیدا بـەجێ بهێڵێـت و، ویژدانـی تـاك بخاتە دودڵییەوە. چونکە ئەوکاتـە یـان بـڕوا دەهێـنێ و ژیربێژیـیەکەی پشـت گـوێ دەخات، یان دەست بە ژیربێژیـیەوە دەگرێت و بەرەو کوفر و خوانەناسیی دەبات، یان لەنێوان هەردوکیاندا لـە مۆلەقـە[1] دەبێـت و، بـیری پارچەپارچە و شێواو دەبێت و لەسەر بڕیارێك ئۆقرە ناگرێت.

لە ئیسلامدا هیچ ئەستەم نیە، کە مرۆڤێك بێنیتە پێش چاو پەیوەندی بە هێزی هـەرە مەزنـەوە هەبێـت، چـونکە لـە گـیانی ئادەمـیزاددا ئـەو وزەیـە هەیە، کە بیگەیەنێـت بـەو هـێزە، تاکـە ئاسـاییەکانیش لـە ئەزمونەکانـیاندا هەسـت بـەو پەیوەندیـیە دەکـەن، بـەڵام گیانەکانـیان لەسـەر ئـەو پەیوەندیـیە جـێگیر نابێت، چەندچـرکەیەکی کـەم نەبێت. بەڵام گیانانێکی وەك گیانەکانی (محمد) و (موسا) و (عیسـا) و (نـوح) و (ئیـبراهیم)، -سـەلامی خوایـان لێبێت- هیچ گران نیە ئەوە بێنینە پێش چاو، کە چۆن یارمەتی لەو هێزە وەردەگرن و پێی دەگەن.

ئەگـەر مەسـەلەی چـۆنیەتی سـروش بـەم شـێوازە بـەپێی مەسەلەی چۆنیەتی لاهوتـی و ناسـوتی لـە (اقنوم) و، بوونی سیان لە یەکدا و، دابەزینی خوداوەند بۆ سـەر زەوی لـە شـێوەی کوڕەکـەی، تا ئازار بچێژێت بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتی لە تاوانەکەی ئادەم و، هەموو ئەو خەیاڵاتانەی کەنیسە و کۆمەڵەکان خستویانەتە ناو

---

[1] چاوزەق وەستان

نەصـرانیەتەوە، ئەگـەر ئەو مەسەلەیە بەپێی ئەم مەسەلانە پێوانە بکرێن، زۆر زۆر بچووك دێنە بەرچاو!

ئـەم ئەفسـانانە کەوتـنە نـاو نەصـرانیەتەوە، کـە نەصـرانیەت لـێی بەریـە. نەصـرانیەت لـە سەرچاوە یەکەمەکانیەوە وێنەیەکی ئەو ئاییینەیە، کە خودا هەمو پێغەمـبەرەکانی پـێ‌ی نـاردووە.. ئاییـنی یەکخواپەرسـتی، کـە هاوبـەش بۆ خوا دانەنێـت، کـە مـرۆڤ لە بەندایەتی هاوبەشێك ئازاد دەکات. بەڵام ئەو رۆمانیانەی چوونە ناو مەسیحیەتەوە، خواوەندە جۆراوجۆرەکانیان هەر لەگەڵدا بوو، نەیانتوانی نـاخی خۆیـان بـۆ ئـەو یەکخواپەرسـتییەی نەصـرانیەت یەکلا بکەنەوە، ئنجا ئەو ئەفسـانانە دەسـتیان پێکرد. جا وردەوردە ئەو ئەفسانان خۆیان بوونە نەصرانیەت، ئـەو نەصـرانیەتەی کەنیسـە دەیناسـێنێت، واتـە ئـەو نەصـرانیەتە رەسمیـیەی، هەرکەسێك نەیگرێتە خۆی دەربەدەری دەکات و لە هەموو شتێك بێ‌بەشی دەکات!

بـەڵام گـۆڕان و بەئـەنجام گەیشـتنی نەصـرانیەت بـۆ ئـەم بـارە، رۆشـنبیرە نەصـرانیەکانی دوچاری دوودڵی و شڵەژاوی هزریی بەردەوام کرد. دەبوو یان بە دەم ژێربـێژیی خۆیانـەوە بچـووبان، کـە لـە ریـزی بـرواداران دەری دەکـردن بـۆ ریـزی بێـباوەڕان؛ یانـیش دەبـوو عـەقڵی خۆیـان فـەرامۆش بکـەن، تـا پارێـزگاری لـە بیروبـاوەڕی ئـەو ئەفسـانانە بکـەن، کـە کەنیسـە دەیپارێزێـت، یـان خۆیان بخەنە دوودڵـیەکی گیانیی بەردەوام لەنێوان پێویستییان بە بیروباوەڕێك و، ژێربێژییان، کە ئەو ئەفسانانە رەت دەکاتەوە!

زۆری نـەمابوو هـەمان ئـەوەی لـە نەصرانیەت روویدا لە ئیسلامیشدا رووبدا، حـەزی مرۆڤ بۆ ئەفسانەکان لە هەوڵدانیدا بوو بۆ داپۆشینی رونی و سادەیی ئایینی ئیسـلام، بـەردەوام بوو لە دارشتنی شتی ناڕاست بە دەوری (محمدی کوڕی عبدالله) و، ئالوبەیـتە هەڵـبژاردەکانی، بـە تایـبەتی حوسـەین-خوای لێ‌رازی بێت-، شتی ناڕاسـتی وای هەڵدەبەسـت، کـە سروشـتی ئیسـلام نەیدەویست و قبوڵی نەدەکرد، کەچـی لـەلای خـەڵکی رەشـۆکی بەشێوەیەکی زیاتر لە ڕاستیە سادە وساکارەکانی ئیسلام وەردەگیرا!

بەڵام خودی بینایەی ئیسلام بە دروستی مایەوە و، بنەماکانی بە پارێزراوی مانەوە، سروشتەکەی ئەوەندە ڕون و سادە وساکار بوو، کە ئەو ئەفسانە پڕوپوچانە لە پەراوێزیدا دەپوکانەوە و، نەدەچوونە ناو بناغەکەیەوە.

لە نەصرانیەتدا کەنیسە خۆی پێشڕەوی ئەم ئەفسانانەی دەکرد و دەیگرتە خۆی، چونکە دەبوە هۆی زیادبوونی دەسەڵاتەکەی بەسەر دەروونی جەماوەردا، جا ئاڵۆزکردنی بیروباوەڕ و دەورەدانی بە شتی تەم ومژاویی بە مەبەست بووە، تا کەنیسە ڕۆڵی لە ژیانی خەڵکدا هەبێت. ئەگەر بیروباوەڕی مەسیحیەت وەکو خۆی بە ساکاری و روون و ئاشکرایی بمایەتەوە، ئەی پیاوانی ئایین چی بکەن؟ ئەگەر خەڵك خۆیان توانیان لە ئاینەکەیان تێبگەن و دروشمەکانیان ئەنجام بدەن و، راستەوخۆ بە پەروەردگاریان بگەن، چ پێویستییەکیان بەوان دەبێت؟! کەواتە پێویستە تەم و مژ هەر هەبێت. پێویستە ئەو خەون و خەیاڵ و ئەفسانانە هەر هەبن، تا خەڵك بەردەوام بۆ کردنەوەی گرێکوێرەکانی بیروباوەڕ پەنا بۆ کەنیسە بەرن، تا نهێنیەکانیان بەرامبەر بە شتێك بۆ ئاشکرا بکات. ئا بەم شێوەیە دەسەڵاتی کەنیسە بەکاملی دەمێنێتەوە، کەس بۆی نیە یەك هەنگاو لە ژیانی ئاینیدا، یان لە ژیانی ڕۆحیدا بنێت بەبێ بوونی قەشەیەك!

بەڵام لە ئیسلامدا کەنیسە نیە. دەستەیەك نیە بەناوی (ئیکلیرۆس) کە بەبێ ئەو هیچ دروشمێکی ئایینی ئەنجام نەدرێت و، تەنها لە ڕێگەی ئەوەوە تاك بە خوای وەدیهێنەری بگات.

ئیسلام ڕزگارکەری بیری مرۆڤە، نەك تەنها لە ئەفسانە و شتی خەیاڵاوی، بەڵکو هەروەها لە فشاری ماددیەتی بەدەر لە یاسای گەردوونیی ناسراو ڕزگاری دەکات.

ئیسلام نەیویستووە بەکاری ماددیەتی بەدەر لەیاسا، بیری مرۆڤ ناچاری ملکەچ کردن بکات. بەڵکو هۆکاری سادەیی و ڕونی و ڕاستیەکانی بەکاردەهێنێت بۆ گەیشتن بە هەستی مرۆڤ.

کاتـێك هاوکات له ڕۆژی مردنی (ئیبراهیم)ی کوڕی (محمد)ی پێغەمبەری خوادا ڕۆژ گیرا، خەڵك بە ڕوداوەکە هاواریان لێ هەستا و گوتیان: بەهۆی مردنی ئیبراهیم ڕۆژ گـیرا.. (محمـد)ﷺ دەسـبەجێ ئەم گومانەی ڕەواندەوە، تا ڕوونی و بێگەردیی بیروبـاوەڕ دانەپۆشـێت، ڕایگـەیاند کـە ڕۆژ نیشانەیەکی خودایە و بۆ مردنی مرۆڤ ناگیرێـت.. بـەم توندوتۆڵی و ڕاستگۆییە بێگەردە نەیهێشت خۆ بدەنە دەست حەزە شـاراوەکانی دەرونـیان و، لەگـەڵی نەڕۆیشـت و بـەکاری نەهێـنا بۆ بڵاوکردنەوەی ئاییـنە نوێـیەکەی، چـونکە ئەوانـە لـە نـاوەڕۆکدا پێچـەوانەی سروشـتی ئاییـنە نوێیەکەیە.

ئیسـلام بەم ڕوونی و بێگەردیەوە، ئاشتی لەنێوان ژیربێژی تاك و بیروباوەڕەکەی گـرێ دەدات، ئەو دوودڵیەش ناوروژێنێت، کە نەصرانیەتی دەسکاریکراوی کەنیسە دەیوروژێنیـت، هـەروا ئـەو بیروباوەڕانەش کە ڕاستی و ئەفسانە تێکەڵ دەکەن. جا هـەق و ناهـەقی تـێدا تێکەڵ دەبن و، لەڕووناکی و ڕوونی خۆی دەشارێتەوە، بۆیە ژیانی هەموی لە کەشێکی دوکەڵاوی و دوعا خوێندنی بەدەنگدا دەبێت، چونکە لە ڕووناکی ڕادەکات و دەترسێت پێی بگات.

بەڵێ، ڕەوەی مرۆڤ کاتێك ڕوبەڕووی گەردوونی فراوان و سروشتی مەزن بویەوە، پێویستییەکی بێشوماری بەوە هەبوو، کە هەست بکات خواوەندەکەی لێی نزیکە و گـرنگی بـە ئـازار و ئاواتەکانی دەدات، ئەوەبوو زۆر لە ئەفسانەکانی نەصرانیەتی کەنیسـە هـات بـۆ تـێرکردنی ئـەو حـەزە قووڵە، جا خودایان لەو بەرزییە هێنایە خـوارەوە، تا بەرگەی ئازار بگرێت بۆ سڕینەوەی تاوانەکەی ئادەم، یان وایلێکرد کە کـوڕە تاقانەکـەی بەرگـەی بگرێت وەکو میهرەبانیەك بۆ مرۆڤ.. هەتا دواییـنی ئەو شتە شاراوانەی ژیربێژی سەرسام دەکات و ویژدان شپرزە دەکات و دەیشێوێنێ.

بـەڵام ئیسـلام ئـەو پێویسـتیە دابـین دەکـات، بـەڵام بەشـێوەیەك کـە لەگـەڵ خواوەندێـتی و تاکێتی خوادا بگونجێت. پێویستیەکە دابین دەکات بەوەی، کە وا لە ئادەمـیزاد دەکـات هەسـت بکـات، کـە خـوا لـێی نـزیکە و وەڵامی دەداتەوە و، لەچـاودێریکردنی بێئاگـا نابێـت و لـەیادی ناکات: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي

قَرِيــبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِي فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ: ئەگـەر بـەندەکانم دەربـارەی من پرسیاریان لیّ کردیت؛ من نزیکم، هەرکەس بانگم بکـات وەلاّمـی دەدەمـەوە، بـا بەدەنگمەوە بیّن و بڕوام پی بهیّنن، بەلّکو ڕیّنمون دەبن.﴾ البقرە/١٨٦.

﴿وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ: پـەروەردگارتان فەرموویەتی: بانگم بکەن، بە دەنگتانەوە دیّم.﴾ غافر/٦٠.

﴿مَــا يَكُــونُ مِنْ نَجْوَى ثَلاَثَةٍ إِلاَّ هُوَ رَابِعُهُمْ وَلاَ خَمْسَةٍ إِلاَّ هُوَ سَادِسُهُمْ وَلاَ أَدْنَــى مِنْ ذَلِكَ وَلاَ أَكْثَرَ إِلاَّ هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا: هـەر سێ کەسیّك پیّکەوە بە چپە قسە بکەن خودا چوارەمیانە، پیّنج بن ئەو شەشەمیانە، کەمتر بن و زیاتر بن و لە هەر کویّ بن ئەو هەمیشە لەگەلّیانە.﴾ المجادلة/٧.

﴿وَنَحْــنُ أَقْــرَبُ إِلَــيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ: ئـیّمە لە شادەماری لاملی نزیکترین لیّی.﴾ق/١٦.

﴿إِنَّ رَبِّــي قَرِيــبٌ مُجِيبٌ: بیّگومان پەروەردگارم نزیکە و بەدەنگەوە دیّت.﴾ هود/٦١.

﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ: ئەو لیّبوردە و ڕوخۆشە.﴾البروج/١٤.

بـەم شـیّوەیە ئادەمـیزاد دەبینیّـت، کـە پەیوەندییەکەی بەخوداوە چەند پتەوە، هەسـت بـە میهرەبانـیی و چـاودێریی و وەلاّمدانـەوەکانی دەکـات، بـەبیّ ئـەوەی پیّویستی بە ئەفسانەی سەرسوڕهیّنەر هەبیّت.

## حەزەکان و پیّویستیەکان (الأشواق والضرورات)

هـەروا ئیسـلام ئاشـتی دەخاتـە نـیّوان ئەوشتانەی بۆ تاك زۆر پیّویستن و، ئەو حـەزە گیانیـیانەی ناتوانیّـت دەسـبەرداری بیّـت. بەلاّم نەك لەسەر حیسابی حەزە پیّویستییەکانی و، نەك لەسەر حیسابی حەزە گیانیەکانی.

ئەو بیرۆکە(فکـرة)ی هەیەتی دەربارەی یەکیەتی تیّکڕایی، لە تیّڕوانینی بۆ تاکی ئـادەمی و، هەلّـنەرەکانی ئەو ژیانەی تیایدایە، ڕەنگی داوەتەوە. پیّویستییەکان و حەزەکان هەردووکیان بە هاوڕیّکی یەك دەگرن، هیچ لە وزە و هەلّنەرەکانیان بەفیڕۆ

ناچێت، مەگەر ئەوەی لەگەڵ ئەو هاوڕێکییە نەگونجێت، یان ببێتە کۆسپ لەبەردەم گەشەی تەواوی ژیان.

ئیسلام هەر لە سەرەتاوە دان بە پێویستیە رەسەنە شاراوەکانی سروشتی مرۆڤ دادەنێت، وا نابینێت کە نەگونجێت لەگەڵ حەزی بەرەو بەرزی چوون، کە ئەمەش حەزێکی رەسەن و شاراوەی سروشتی مرۆڤە، بەو مەرجەی لەباری هاوسەنگیەکی رێکوپێکدا بێت.

کاتێك ئیسلام بانگەشەی پاکبونەوەی گیان و، دەرچوون لە کۆتی ئارەزووەکان دەکات، مەبەستی خەفەکردنی هەڵنەرە زیندووەکان و، لەناوبردنی وزە زیندووەکان نیە، بەڵکو بانگەشەی ئەوە دەکات، کە ئادەمیزاد سەرکردەی دەروونی خۆی بێت و نەبێتە بەندەیەکی بێدەسەڵاتی ئارەزووەکانی، یان وەك ئاژەڵ ئارەزووەکانی هەڵنەری بن.. ویستیش دوریانی نێوان ئادەمیزاد و ئاژەڵە لە ڕابواردندا: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الأَنْعَامُ: ئەوانەی خوانەناسن وەکو ئاژەڵ ڕادەبوێرن و دەخۆن.﴾محمد/١٢.

بەڵام ئەگەر مرۆڤبەسەر کاروباری خۆی زاڵ بوو، پێویستە بزانێ کە لاشەکەی مافی هەیە، پێویستە لەسەری دەروونی خۆی لە خۆشییەکانی ژیان بێبەری نەکات، ئەوانە حەرام نەکات کە خوا حەڵاڵی کردووە.. ئەوەش کە خودا حەڵاڵی کردووە هەموو ئەو چێژ و خۆشییانە دەگرێتەوە کە دەرونی ڕاست و ڕێك داوای دەکات.

لە ئیسلامدا هەڵنەرە سروشتییەکانی ژیان هەموویان بێزراو نین، حەز کردن بە درێژەپێدان شکستێك نیە خۆپاککەرەوەکان خۆیان لێی بەرز بگرن. چونکە ئارەزووی درێژەپێدانی ژیان لەگەڵ ویستی خوادا لە بەدیهێنانی ژیان، رێکە، بەڵکو خودا دەیەوێت ژیان بەرز ڕابگیرێت نەك تەنها درێژەی پێ بدرێ.. ئەو درێژەپێدانەش هۆکاری پەرەسندن و بەرزبوونەوەیە، نەك دژی بیرۆکەی بەرزبوونەوە بێت. هەروەها ئیسلام هەڵنەرە زیندووەکانی بنیاتی مرۆڤلەگەڵ حەز و ئارەزوە گیانیە قوڵەکان لە سروشتیدا هاوڕێك دەکات، لە هەردوکیاندا یەکیەتیەك

دادەڕێژێت، کە نە زیادەڕۆیی و نە بەزایەدانی تێدا بێت، نە ململانێ و نە پێکدادانی تێدا بێت.

لە ئیسلامدا بانگەشە بۆ خۆش ڕابواردن، هاوشان لەگەڵ بانگەشە بۆ بەرزبوونەوە دەڕوات، جا لەنێوانیاندا وێنەیەکی هاوسەنگی دروست دەبێت، دوور لە خراپەکاری و دوور لە بێبەش بوون:

﴿يَابَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلاَ تُسْرِفُوا إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ، قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ، قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ: ئەی نەوەی ئادەم! لە هەر مزگەوتێکدا بوون خۆتان بڕازێننەوە، بخۆن و بخۆنەوە و زیادەڕۆیی مەکەن، خوا زیادەڕۆیانی خۆش ناوێت.. بڵێ: کێ ئەو کەل وپەلی ڕازاندنەوە و بژێوییە پاکژەی حەرام کردووە، کە خوا بۆ بەندەکانی داناوە؟! بڵێ: ئەوە لە ژیانی دونیادا بۆ بڕواداڕانە و لە ڕۆژی قیامەتیشدا تایبەتە بەو.. ئێمە ئاوا نیشانەکان ڕوون دەکەینەوە بۆ ئەوانەی دەزانن.. بڵێ: بەڵکو پەروەردگارم خراپەکاری ئاشکرا و نهێنی و گوناه و سنور بەزاندنی ناڕەوا و هاوبەش دانان بۆ خودا بێهیچ بەڵگەیەك و قسەکردن دەربارەی خودا بەبێ زانینی حەرام کردووە.﴾ الاعراف/٣١-٣٣.

(الفواحش) لە (الفحش)ەوە هاتووە، کە بریتییە لە لادان لە هاوسەنگی و مامناوەندی، ئەمیش هەروەکو زیادەڕۆیی بە ناهەق و هاوبەش دانان بۆ خودا وایە.. هەموان تێکدەری سروشتی مرۆڤن، دژی دادوەرین، پێچەوانەی یاسای ژیانی هاوڕێکن.

بەم جۆرە وزە مرۆییە چون یەکەکان بواری خۆیان دەست دەکەوێت بۆ بنیاتنان و بەرز ڕاگرتنی ژیان، تاکیش بە بەش بەشی لەنێوان واقیعی ژیانە پێویستەکەی بۆ

مانــەوەی خۆی و ژیانەکەی و، ئەو حەز و ئارەزووە بەرزانەی بە گوێیدا دەچرپێت و بانگی دەکات، نامێنێتەوە.

هــەروەها هاوڕێکیــیەك لەنــێوان پاراستنی ژیان و بەرزڕاگرتنی دادەنرێت.. ئەم هاوڕێکیــیە لە وژدانی تاکدا بەپێی بیروباوەڕەکەی دەبێت، هەروەکو لە چوارچێوەی کۆمەڵێکیشــدا بەپــێی رەفــتارەکان دەبێت، جا تاك خۆی لە ئاشتی ناوەکی لەگەڵ ویژدانەکەی و، ئاشتی دەرەکی لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا دەبینێتەوە.

هــەروەها ئیســلام هۆیــەکانی (گــرێ دەروونــیەکان) چارەسەر دەکات، ئەو گرێ دەروونــیانەی، کــە فــرۆید و شوێنکەوتەکانی ڕێڕەوەکەی خۆیان لەسەر بنیات ناوە، کــە پێیان وایە بەڵایەکە و کەس لێی دەرباز نابێت، نەفرەتێکە و کۆمەڵ بە کۆت و پــێوەند و ڕیکــار(تعالــیم)ەکــانی لەســەر تاکی دەسەپێنێت، هەروا بە خەفەکردنی ئارەزوەکــان، کــە ویژدانــی مــرۆڤ یــان خــودی بــەرز(الذات العليا) جێگای کۆمەڵ دەگرێتەوە لە سەپاندنی چاودێریی بەسەریدا.

هۆکارەکــانی ئەو گرێ دەرونیانە، لە ڕەوش(جو)ی بیروباوەڕی ئیسلامیدا بونیان نــیە، کــە هــەر لــە هــەنگاوی یەکەمــەوە دان بــە ئارەزوو و پێویستییەکانی تاکدا دەنێــت، بە پیس و داڕوخانی نازانێت و، ڕێگاکانی بەتاڵکردنی بە شێوەیەکی دڵنیا بــۆ ئاســان دەکات، کە دان بە شەرعی بوون و ڕاستگۆیی و پاك وخاوێنیدا بنرێت، هــەر ئەمــەش گرنگە، مادام لە سنورێکی راست و دڵنیادا بێت، کە نەبێتە مایەی لاوازی کەســایەتی تــاك و، لــە چوارچێوەی کۆمەڵگەشدا دوچاری گەڕانەوە بۆ باری ئاژەڵیی نەبێت.

ئیســلام بــە وردی سەرنجی ئەم ئارەزوە سروشتییە بێگەردانە دەدات، داینــاوە کە هــەندێك جــار ئافــرەت ئــارەزووی خۆشی و جوانکاری لەپیاو زیاترە، بۆیە هەندێك لەوانــەی بــۆ پیاو حەرامە بۆ ئافرەت حەڵاڵی دەکات، ئەمەش وەك ڕەچاوکردنێکی سروشــتە مێیینــەکەی، کــە ڕازاندنــەوە و جوانکاریــیە. بــۆ ئافرەتی حەڵاڵ کردووە ئەنگوســتیلەی زێــڕ و بــەرگی ئاوریشــم بپۆشــێت، لەکاتێکدا پیاو لەم شتە نەرم و شــلانە قەدەغــە دەکــات و بــە خۆشــگوزەرانیەکی زیــانداری دادەنێت، هەرچی لەو

بوارەدا بۆ ئافرەت حەرامە، تەنها خۆدەرخستنە بەجوانکاری و ڕازاوەیی بۆ بێگانە، چونکە لێرەدا مەسەلەکە لە ڕۆڵی خۆشی(متاع)ی بێگەردەوە دەردەچێت بەرەو ئارەزو بزواندنی ئاژەڵانە، ئەمەش دوریانی ڕێگاکەیە!

بەم شێوەیە هۆیەکانی توشبوون بە (گرێ دەرونیەکان) لە ڕەوشی بیروباوەڕی ئیسلامیدا لە چەند بارێکی ریزپەڕی نەخۆشیدا سنوردار دەبێت و کورت هەڵدێ، بەڵام سروشتە ڕێکەکان، هاوسەنگی و هاوڕێکییان تێدا دێتە ئەنجام و، هۆکارەکانی دوودڵی نامێنێت، بەمەش تاکی مسوڵمان لە دەرونی خۆیدا لە ئاشتی و ئاسایشدا دەژێت.

## گوناه و تەوبە

ئیسلام تەنها لە سنوری دانان بە پێویستیەکانی تاك و هاوڕێك کردنی لەگەڵ حەز و ئارەزوەکانیدا ناوەستێت.. بەڵکو دوای ئەوە هەنگاوێکی دیکەی واقیعی و بەرچاوڕونانە دەنێت.. ئەو دان دەنێت بە هەڵنەرەکانی هەڵە و گوناه. بۆ هەڵە و لەبیرکردن و ئەوانەی بەزۆر پێیان دەکرێت، ئەوا ئەوانە لێیان ناگیرێ و بۆیان بە گوناه دانانرێ: ((ئوممەتەکەی من، لە هەڵە و لە بیرکردن و ئەوەی بەزۆر پێیان کراوە، لەسەریان هەڵگیراوە-واتا بۆیان بەگوناه نانوسرێ)).

بەڵام تاوان و گوناه، هەموو کاتێك دەرگای تەوبە لێیان کراوەیە، هەرکەسێك حەز بکات روی تێدەکات بۆ داولی لێخۆش بوون و پاکبوونەوە، کەس بۆی نیە لە بەزەیی خودا دەری بکات و، دەرگای خودای لێ داناخرێت و، هیچ نێوەنێکیان لەنێواندا نیە.

ئەگەر تاك خزایە ناو گوناهەوە، ڕێگاکانی تەوبەی لێ ناپچڕێت، نابێتە گوم بووی دەرکراوی نەفرەت لێکراو و، تاریکیی بێبڕوایی نایچەوسێنێتەوە.. ئا لەوێدا روناکیی هەیە، ڕێگا هەیە، دەستی بەسۆز و میهرەبان هەیە.. دەستی تەوبەی پەشیمانی، پاکبوونەوە و سەلامەتی پێ دەبەخشێت، بە ڕۆح و تاریکی دایدەپۆشێت: ﴿قُلْ يَاعِبَادِي الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّـهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ: بێژە: ئەی بەندەکانی من! ئەی

ئەوانـەی بـە لادان لـە ئـەندازە، ناهەقـیو لـەخۆ کردوە! نابێ ئێوە لە بەزەیی خوا ناهومـێد بـن، چـونکە لـە هـەمو گوناهـێك چـاو دەپۆشـێ، ئـەو لێـبوردەو دلۆڤانە.﴾الزمر/٥٣.

لـە ئیسلامدا خواوەند بۆ هەتاهەتا گوناهبار ڕاونانێت، کە مۆڵەتی پێنەدات و تەوبـەی لێ وەرنەگرێت، مەگەر خۆی بکوژێت، یان جەستەی خۆی ئازار بدات، یان گـیانی بۆ چەندین سەردەم و نەوە لەلاشەی پیس و بۆگەندا جێگیر بێت. سڕینەوەی گوناهـیش پێویسـت بـەوە ناکـات، کە خودا لە بەرزیەکەی خۆی بێتە خوارەوە، تا لـەخاچ بدرێـت و ئازارەکان بچێژێت وەك کەفارەتێك بۆ گوناهی مرۆڤ، لە کاتێکدا ئـەو خۆی دروستکەری ئەو مرۆڤانەیە، دەتوانێت پاکیان بکاتەوە بەبێ ئەوەی خۆی لە خاچ بدرێت و سزا بدرێت.. هەروەها سڕینەوەی گوناهەکان پێویستی بە کاهین و کورسی دانپیانان نیە، یان بە هەڵواسراوی بەسەر سەری کەسێکەوە بمێنێتەوە، بەبێ ئەوەی رزگاربوون یان راکردنی بۆ هەبێت..!

هـەمو ئادەمـیزادێك دەتوانێـت راستەوخۆ بە پەشیمانی و تەوبەوە روو بکاتە پـەروەردگاری، بـەبێ ئـەوەی سوربێ لەسەر گوناهەکەی و بەردەوام بێت، جا خودا دەرگـای خـۆی لـێدەکاتەوە و، بـۆ نـێو بـەندەکانی وەری دەگرێت و، میهرەبانی و لێـبوردەیی خـۆی پـێ دەبەخشـێت. دەرگـای میهرەبانیش هەموو کاتێك کراوەیە، لەبـەزەیی خـوادا بێئومـێدی و هیوابڕاوی نیە، هەرکەسێك دەیەوێت با لە دەرگای بدات و داوای مۆڵەت بکات، بەڵکو با بەبێ مۆڵەت ڕووی تێ بکات:

﴿وَلاَ تَيْأَسُـوا مِـنْ رَوْحِ اللَّـهِ إِنَّهُ لاَ يَيْأَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الكَافِرُونَ: ناهومـێد مـەبن لـە بـەزەیی خـودا، هـەر ئەوانـەی خوانەناسـان، لە بەزەیی خوا ناهومێدن.﴾ یوسف/٨٧.

ئیسـلام لـەم ڕێـڕەوەدا دوور دەڕوات، هـەتا ئەگـەر مـرۆڤ بەخـێرایی سـەرنجی لێبدات، وادەزانێ کە ئیسلام گوناه بۆ خەڵك دەڕازێنێتەوە، تا لە گوناهەکە تەوبە بکەن..!

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((هەموو ئادەمیزادێك گوناهكارە، چاكترین گوناهكاریش تەوبەكارانن)).[1] هەروەها دەفەرموێت: ((سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر گوناه نەكەن، ئەوا خودا ئێوە لادەبات و كۆمەڵانێك دەهێنێت، كە گوناه بكەن و داوای لێخۆشبوون بكەن، ئەویش لێیان خۆش بێت)).[2]

ئیسلام لێرەدا گوناه ناڕازێنێتەوە، بەڵكو تەوبە ئاسان دەكات، دەروونی گوناهكاران بە هیوا پڕ دەكات، رێگا بۆ گیانەكانیان روناك دەكاتەوە، ئەو گیانە ماندووە ترساوانە دەخاتە ناو پشودان و ئاسودەییەوە. هەتاهەتایە بە دودڵی و سەرسامی و پارچەپارچەیی و ئۆقرەنەگری نامێنێتەوە.

ئەمە لە كاتێكدایە كە لەسەر ویژدانی تاك پێویست دەكات بەردەوام هۆشیار بێت، داوای لێدەكات چاودێری دەرونی خۆی بكات و، ئاگاداری دەكاتەوە لە هەڵخەڵەتاندنی ئارەزوە حەرامەكان و، فیتنەی ئافرەت و ماڵ و منداڵ، دەیهێنێتە پێش چاوی كە چۆن شەیتانی دوژمنی سورە لەسەر هەڵخەڵەتاندنی، بەردەوام دڵەڕاوكێی بۆ دروست دەكات و بۆی لە سەنگەردایە..

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الْمَآبِ، قُلْ أَؤُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرٍ مِنْ ذَلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ، الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، الصَّابِرِينَ وَالصَّادِقِينَ وَالْقَانِتِينَ وَالْمُنْفِقِينَ وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالأَسْحَارِ: خۆشەویستی ئارەزوەكان بۆ خەڵك ڕازێنراوەتەوە، ئارەزووی ئافرەت و منداڵ و كۆكردنەوەی سەروەت و سامانی زۆر لە زێڕ و زیو و ئەسپی نیشانەدار و مەڕ ومالات و كێڵگە.. ئەمانە مایەی خۆشی ژیانی دونیان.. بەڵام خودا چاكترین سەرەنجامی لایە.. بڵێ: ئایا هەواڵی لەوە باشترتان بێ بڵێم؟ ئەوانەی پارێزكارن لەلای پەروەردگاریان بەهەشتانێكیان بۆ هەیە

[1] اخرجه الترمذي.
[2] رواه مسلم

ڕوباریـان بەژێـردا دەڕوات، بـە هەمیشـەیی لەوێ دەمێننەوە، لەگەڵ ژنانێ پاك و بێگـەرد، ئەمانـە و ڕەزامەندی خوداش.. خودا ئاگاداری بەندەکانیەتی.. ئەوانەی کـە دەڵێن: پەروەرگارا! ئێمە بڕوامان هێنا، تۆش لە گوناهەکانمان ببورە و لە سزای ئاگـر بمانـپارێزە.. ئەوانەی ئارامگر و ڕاستگۆن و بەردەوامن لەسەر خواپەرستی و، ماڵ دەبەخشن و بەرەبەیانان داوای لێخۆشبوون دەکەن.﴾آل عمران/١٤-١٧.

﴿وَيَـــاآدَمُ اسْـــكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ فَكُلاَ مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّـــجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ، فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُرِيَ عَنْهُمَا مِـــنْ سَـــوْآتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ، وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ، فَدَلاَّهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّـــجَرَةَ بَـــدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُلْ لَكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُبِينٌ، قَالاَ رَبَّـــنَا ظَلَمْـــنَا أَنفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ، قَالَ اهْبِطُوا بَعْضُـــكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ: ئـەی ئادەم! تۆش وێـڕای ژنـت لە بەهەشت بحاوێنەوە، لە هەر کوێدا هەرچی دەخۆن بەئارەزوی خۆتان بکەن، هەر تخونی ئەو داری هانا مەکەون، دەنا ئێوە لە ناهەقیکاران دەبن. شەیتان کەوتـە کلێشـەیان تا ئەو ئەندامەیان-کە داپۆشرابو-بێنێـە بەرچاویان. گوتی خودا کـە نەیدەهێشـت لـەو دارە نزیك ببنەوە، هەر بۆیە بو کە ئێوە نەبنە فریشتە، یان هەمیشە هەر لەبەهەشتا بمێنن. جا سوێندی بۆ هەردووکانیش خوارد کە: من بەدڵ ئامۆژگاریـتان بـۆ دەکـەم.بەفریوان، ئەوانی خستە تەماوە. لەدوای ئەوەی لە بەری دارەکـەیان چەشـت، عەیـب و عاریـان کەوتـە دەشـت و کۆششـیان کـرد بەگەڵای بەهەشـت داپـۆشـن. پەروەردگار گازی کردن: ئاخر من بەئێوەم نەگوت توختی ئەم دارە مەکەون؟ پێشم ڕانەگەیاندبون بەئاشکرا شەیتان دوژمنی ئێوەیە؟ گوتیان: ئەی پـەروەردگارمان! ناهەقـیمان لـەخۆمان کـرد، ئەگـەر تـۆ لێمان نەبوری و بەزەییت پێماندا نەیە، بێشك لەزیانبارانین. گوتی: داگەڕێنە خوارێ، ئێوە دوژمنی یەکدین. تا ماوەیەك جێگا و مایەی ژیانتان لەزەوی دەبێ.﴾الاعراف/١٩-٢٤.

ئیسـلام کـە ململانـێی نـێوان ئادەمـیزاد و شەیتان بەم شێوەیە دەهێنێتە بەر نـیگا، بـۆ ئـەوە نیە خەڵك بخاتە ناو شڵەژانی دەروونیی بەردەوام، کە کەسایەتییان پارچەپارچـە بکات و هێزەکانیان پەرتەوازە بکات، بەڵکو بۆ ئەوەیە تا بانگەشەیان بکـات بـۆ هۆشـیاربون لـە هەڵـنەرەکانی خراپە و گوناه، تا لە کۆتاییدا نەوەکانی ئادەم و حەوا ئاگادار بکاتەوە لە خۆدانە دەست هەڵخەڵەتاندن و فریودانەوە.

﴿یَابَــنِي آدَمَ لاَ یَفْتِنَــنَّکُم الشَّیْطَانُ کَمَا أَخْرَجَ أَبَوَیْکُمْ مِن الْجَنَّة یَنزِعُ عَنْهُمَا لبَاسَــهُمَا لــیُرِیَهُمَا سَوْآتِهِمَا إِنَّهُ یَرَاکُمْ هُوَ وَقَبِیلُهُ مِنْ حَیْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّیَاطِینَ أَوْلِیَاءَ لِلَّذِینَ لاَ یُؤْمِنُونَ: ئـەی فـرزەندەکانی ئادەم! شەیتان نەتانخەڵەتێنێ، هـەروەك بـاوك و دایکـتانی لـە بەهەشت بەدەرکردن داو جل و بەرگی لێ دارنین تا شـەرمی خۆیانـیان پێـیان نیشـان بـدا. شـەیتان و دەستەو بەستەکەی لەلایەکەوە دەتانبیـنن، کـە ئـێوە ئـەوان نابیـنن. ئێمە شەیتانەکانمان کردۆتە دۆستی ئەوانەی بروایان بەخودا نیە.﴾الاعراف/٢٧.

لـە هـەمان کـاتدا بـریاری ئەوە دەدات، کە گوناهەکەی ئادەم وەکو شمشێرێکی بـڕەری هەڵکێشـراو بـەدیار سـەری نـەوەی ئادەمـەوە نەبوە و، داوای کەفارەتێکی سەرسـوڕهێنەر نەکراوە، کە خوای گەورە لەسەر شێوەی کوڕی خوا پێی هەڵسێت.. کارەکە لەهەموو ئەمانە سووك و ئاسانترە: ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ مِنْ رَبِّهِ کَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَیْهِ إِنَّــهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِیمُ: ئادەم لە پەروەردگاریەوە چەند وتەیەکی پێگەیشتن، ئەوسا تەوبەکەی قبولْ کرد، هەر خۆی تەوبە وەرگر و میهرەبانە.﴾البقرة/٣٧.

جـا ئەم هەموو ئاسانیە کەس بازنادات، مەگەر ئەوەی لەسەر گوناه سور بێت، ئـەم هـەموو دەرگـا کراوانە داناخرێن، تەنها لەروی ئەوانەی لە گوناهدا بەردەوام و مکوڕن.

﴿بَلَــى مَــنْ کَسَبَ سَیِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِیئَتُهُ فَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِیهَا خَــالِدُونَ: دیارە هەرکەس خۆی توشی خراپە بکا و خراپەکەی دەوری دابێ، ئەوانە یاری ئاگرن و تاهەتا هەر تێدا دەبن.﴾البقرة/٨١.

ئەمــە لەبەر ئەوەی بەردەوام بون لە گوناهدا دڵ دادەخات و ویژدان تەرت و تونا دەکات، ئنجا دەرگاکان دادەخات و سزا دەسەپێنێت.

کـەس ئـەم هـەموو هەلـە رەخسـاوانە لەدەسـت نادات، مەگەر ئەوەی شایانی بـەزەیی نەبێـت و خـۆی نەیەوێـت. بـەڵام زۆر لـە گوناهکارانی تەوبەکار، ئیسلام ئاشـتی بـە ویژدانیان دەبەخشێت و، ئاسودەیی بە گیانەکانیان دەدات، تەنها داوای هۆشـیاریی و هەوڵدانـیان لێ دەکـات، هۆشـیاریی و هەوڵدانـیش کەسـایەتی پارچەپارچـە ناکـەن و دودڵـیی لێ ناکەوێـتەوە.. ئیسلام لە واقیعە مێژووییەکەیدا پیاوانـێکی ناسـیوە، کە بە ڕادەیەك ویژدانیان هۆشیار بووە، کە گەیشتوەتە رادەی ناسـکی، بـەڵام گیانـیان لـە لوتکـەی ئاسودەییدا بووە، لە هەمان کاتدا ئەوان لە واقیعـیە کـرداری و بنیاتـنەرانە بون، هەروەك مەزنترین پیاوە واقیعییە کرداریی و بنیاتنەرەکان لە ژیاندا.

لـە سەروی هەموو ئەمانەوە (ابوبکر) و (عمر)، کە دوای پێغەمبەری خوا، دوو بنیاتــنەر و سەرپەرشــتیاری ئیســلام بــوون. ئەوان دوو نمونەی تەواون بۆ هۆشیاریی ویــژدان، تــا ڕادەی ناسکی و، ئاسودەیی دڵنیالە هەست و، گردبونەوەی کەسایەتی و، یەکیەتی ئاڕاستە لە واقیعی ژیاندا.

## ئەرك بەسەردادان و توانا

ئیســلام بــە شـێوەیەکی گشتی تێبینی ئەوە دەکات، کە ئەرکی زیاد لە توانای خـۆی بەسـەر تـاکدا نەدات، لە یاساکانی یان لە دروشمەکانی، چونکە ئەرك دان لە سەروی تواناداو بە کردن یان نەکردن، تەنها ئەم سێ ئەنجامەی لێ دەکەوێتەوە:

١/یـان ماندووکـردن و زەحمـەتی و، بێبـەش بون و خەفەکردن و، تێکشکاندنی خودی مرۆڤ لەژێر باری خەفەکردن یان ماندووکردندا و، کۆسپ خستنە بەر گەشەی خێرای ژیان و، پەرەسەندنی هاوسەنگ.

٢/یــان دوورکەوتــنەوە و یاخیــبون و دەرچــوون لــە فــەرمان و نەهیــیەکان و، دژایەتــیەکی سەرشـێت، کـە خاوەنەکەی بەرەو زیادەڕۆیی لە ڕێپێدان دەبات، وەك کاردانەوەیەکی خەفەکردن، یان شەکەت کردنە.

٣/ یانیش دڵەڕاوکێی دەروونی بەردەوام و، هەستکردنی بەردەوام بە گوناه، یان کەمتەرخەمی، لە شتانێك، کە نە گوناهە و نە کەمتەرخەمییە، ئەوەش سزایەکی بەردەوامە، کە بەرگەی ناگیرێت.

بۆیە ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی هەموو ئەرکەکانی لە سنوری تواناداا بێت، کە لەکاتی دانانی یاساییدا بە واجب بون و حەرام بونیەوە، ڕەچاوی سروشتی ئادەمی بە هەموو تواناکانیەوە بکات، پاشان لێی دەگەڕێت لەخۆیەوە زیاد لە ئەرکە فەرزەکان ئەنجام بدات، ئەگەر توانی، بەبێ تەنگەتاوی و زەحمەتی و سەختی. ئا بەمە لە تێکشکان دەیپارێزێت، لە یاخیبون دەیپارێزێت، دەیپارێزێت لەو دڵەڕاوکێیەی، کە حەسانەوەی بۆ نیە.

لەمەدا خوای گەورە لە قورئانەکەیدا دەفەرموێت: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا: خودا ئەرکی لەتوانا بەدەر بەسەر کەسدا ناسەپێنێ.﴾البقرة/٢٨٦. ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ: لە ئاین و خواپەرستیدا شتی لەسەر زەحمەت نەکردوون.﴾الحج/٧٨.

پێغەمبەری مەزنیشﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ هَذَا الدِّينَ يُسْرٌ لاَ عُسر، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلاَّ غَلَبَهُ: ئەم ئایینە ئاسانە و گرانی تێدا نیە، هەرکەس گرانی بکا، ئەوا بەهیلاك دەچێت)).[1]

پێغەمبەرﷺ ڕێگری دەکات لە گرانکردن و توند کردن لە لێکدانەوەی ئاین و هەستان بە ئەرکەکانی، کە دەفەرموێت: ((لا تُشَدِّدُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَيُشَدَّدَ عَلَيْكُمْ: لەسەرخۆتانی توند مەکەن، با لەسەرتان توند نەکرێت.))[2] یان دەفەرموێت: ((إِنَّ هَذَا الدِّينَ مَتِينٌ فَأَوْغِل فِيهِ بِرِفْقٍ: ئەم ئایینە توندوتۆڵە، جا بە نەرمی بچۆرە ناوی))[3]. ئەو کەسەی لەسەر خۆی توند دەکات و خۆی ماندوو دەکات، بەو

---

[1] رواه البخاري ومسلم
[2] رواه ابوداود
[3] البخاري

رێــبواره دەچــوێنێت، کە وڵاخەکەی ماندوو دەکات و ناگاتە مەبەستی خۆی: ((إن المنبتّ لا أرضاً قطع ولا ظهراً ابقى))[1].

ئەوانــەی رابــورد نمونــه بــون لەســەر ئەم مەبەست و میانڕەوییە و ڕەچاوکردنی توانایــە، بــە تایبەتــیش لــە هاوڕێککــردنی نــێوان پێویســتیەکان و، ئــارەزووە دەرونــیەکان، هــەروا لــە دانــنان بــە هەڵنەرەکانی هەڵە و گوناه، هیچی تێدا نیە، ئەگەر لەلایەکی دیکەشەوە بۆی بچین.

هەڵچــــوونەکانی توڕەبــــوون و رق لێــــبوونەوەی ویــــژدان، هەڵچــــوون و ڕق لێــبوونەوەیەکە، ناکــرێ لەبــەر چــەندین هــۆ لە دەرونی مرۆڤ بسڕرێتەوە یان لەناو بــبرێت. هەندێکــیان لە هەست بەخود کردنەوە سەرچاوە دەگرێت، هەندێکیشیان لە پــێکدادانی بەرژەوەندیــیەکانەوە دروست دەبێت، هەندێکیش لە جیاوازی هەست و ڕێــڕەوەکانەوە دێــت.. ئیسلامیش بانگەشەی لێبوردەیی و نەرم و نیانی و ڕوخۆشی دەکــات، بــەڵام لــەلای خۆیەوە ئەوە ڕەت ناکاتەوە، کە هەستەکانی توڕەبوون و ڕق لێــبوونەوە هەستی سروشتین، داوا لە خەڵك ناکات بەتەواوی لە دەروندا بیسڕنەوە، هــەروا لــە خــودی خۆشــیدا بــە گونــاه و تــاوانی دانانێــت، بەڵکو بانگەشەی ڕك خواردنــەوە و بەندوبەســتی دەکــات، بــۆ ئــەوە نا کە بەهیچ جۆرێك رق و کینە لە دڵــەکان نەهێڵێت، بەڵکو ئەو بەندوبەستە ڕێیەك بێت بۆبەرزبوونەوە و گەشەپێدان. جــا لــەم ڕێــیەدا بــە هــاندان دەروونــی مــرۆڤ رادەکێشێت نەك بە فەرمان و ئەرك بەسەردادان:

﴿وَلَمَــــنْ صَــــبَرَ وَغَفَــــرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الأُمُورِ: بۆ کەسانێك ئارام دەگرن و لەخــەڵك دەبــورن، ئەمــە لــەو کــارە پەســندانەیە، کــە پێویستە لەسەری بەردەوام بن.﴾الشورى/٤٣.

﴿وَالْكَــاظِمِينَ الْغَــيْظَ وَالْعَــافِينَ عَنْ النَّاسِ: ئەوانــەی رقی خۆیان دەخۆنەوە و چاوپۆشــی لــە خــەڵك دەکــەن.﴾آل عمـران/١٣٤. بــەم جــۆرە ئــارام گــرتن لەگــەڵ لێخۆشبوون هاوتا دەکات و، لە دوای ڕق خواردنەوە باسی لێبوردن دەکات، چونکە

[1] البخاري

ئارام گرتن و رق خواردنەوە ئەگەر بەرەو لێخۆشبوون و لێبوردن نەچێت، ئەوا دەبنە هۆی رق و کینە، ئیسلامیش رقی لە رق و کینە دەبێتەوە و لێیان دوور دەکەوێتەوە، بۆیە رێنمونی و هاندان بۆ لێبوردن و لێخۆشبوون دەکات، تا دەرونەکان لە رق و تورەبون پاك بکاتەوە، پێش ئەوەی ببێتە رق و قینە. جا دوعا خۆشەویستەکەی بڕواداران بەم شێوەیە دادەنێت:

﴿وَلاَ تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاً لِلَّذِينَ آمَنُوا: رق و دوژمنایەتی باوەڕداران لە دڵمان مەهێڵە.﴾الحشر/١٠.

باسی خەڵکی بەهەشت دەکات، کە بەرز و بڵندن و دەفەرموێت: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍ: رق و کینەمان لە سینەیان داماڵی.﴾الاعراف/٤٣.

کە باسی (بەندەکانی خوا) دەکات دەفەرموێت: ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُم الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلاَمًا: بەندە ڕاستەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن، کە بە نەرمی و بێفیزی بەسەر زەویدا دەڕۆن و، کاتێك نەزانەکان بە نارێکی بیاندوێنن، بە نەرمی وەڵامیان دەدەنەوە.﴾الفرقان/٦٣.

واتە لە بەرامبەر دواندنی وشك و بێئەدەبانەی نەزانەکان، بە جوانی و لێبوردەیی وەڵامیان دەدەنەوە.

ئیسلام پێی ناخۆشە دژایەتی بکەوێتە نێوان مسوڵمان و مسوڵمانەوە و، لەیەك دابڕێن، بەڵام حیسابی ئەوەش دەکات، کە هەستی تورەیی ناسڕێتەوە و، رودانی بە گوناه دانانێت، وەك نەصرانیەتی کەنیسە ناڵێت: (ئەو کەسەی بە ناڕەوا لە براکەی تورە بێت دەبێ داوەری بکرێت)، ئەگەر داوای ئاشتبوونەوە و پێکەوە گونجانی کرد، ئەوا ماوەیەك بواری پێدەدات بۆ هێمن بونەوە و دامرکانەوەی دەروون و، گەڕانەوەی دەروون بۆ هێمنی و لەسەرخۆیی، هەر یەك لەو دوو کەسە ناکۆکە سێ رۆژ لەیەك دادەبڕێن، تورەییان تێیدا دەڕەوێتەوە، دەرونیان ئارام دەبێتەوە، دوای ئەوە لەسەریان پێویست دەکات ئاشت ببنەوە.

((لا يَحِلُّ لِمسلمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، يَلْتَقِيَانِ فَيُعْرِضُ هَذَا وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلامِ: بۆ هیچ مسوڵمانێك دروست نیە زیاد لە سێ

شەو پەیوەندی لەگەڵ براکەی ببڕێت، کە بەیەک دەگەن پشت لە یەک دەکەن، چاکترینیان ئەوەیانە، کە سەرەتا سەلام دەکات))[1].

ئیسلام رقی لەو بێئارامیەیە، کە دەرونان شڕ دەکات و بڕوا بەخوا کەم دەکاتەوە و لەوانەیە دوچاری بارێکی خراپ بێت، لەبەر ئەوەی ئارام و خۆگرتن پێوەری هێز و پێوەری بڕوایە، پێغەمبەری سەروەر دەفەرموێت: ((لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ وَشَقَّ الْجُيُوبَ وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ: ئەو کەسە لە ئێمە نیە کە لەرووی خۆی دەدات و یەخەی خۆی دادەڕێ و، بەشێوەیەکی نەفامانە بەشان و باڵی مردووەکەدا هەڵبڵێت))[2].

بەڵام ئیسلام خەمباری و فرمێسک بە تاوان دانانێت و، زۆر لە دەروون ناکات بە تەواوی ئارام و وشك و ڕەق بێت، چونکە ئەمە لە سەروی تواناوەیە و، لەوانەیە بەرەو توندوتیژی و دڵڕەقیی ببات. ئا ئەوەتا (محمد) پێغەمبەری خوا خۆی بۆ (ئیبراهیم)ی کوڕی فرمێسکی بە چاواندا دێتە خوارەوە و، دەفەرموێ: ((يَا إِبْرَاهِيمُ، إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ وَلا نَقُولُ إلاَّ مَا يَرْضَى رَبُّنَا، وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ: ئیبراهیم! چاو فرمێسك دەڕێژێت و، دڵ خەمبار دەبێت، تەنها ئەوە دەڵێین کە خوا پێی ڕازییە، ئیبراهیم! ئێمە بە دابڕانی تۆ خەمبارین))[3].

ئەو ئارامەی ئیسلام داوای دەکات، ئارامگرتنی دڵدانەوە و خۆڕازاندنەوە و یادکردنەوەی خوا و گێڕانەوەی بەڵاکەیە بۆ لای خوا: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِنَ الأَمْوَالِ وَالأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ، الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، أُوْلَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ: بە هێندێك ترس و برسی بون و کەم بونەوەی ماڵ و، کەس وکار و بەروبوم تاقیتان دەکەینەوە، مزگێنی بدە بە ئارامگران.. ئەوانەی ئەگەر تووشی بەڵایەك بوون گوتیان: ئێمە هەر ئی خواین و هەر بۆ لای ئەو

---
[1] رواه البخاري
[2] رواه الخمسة الا اباداود
[3] رواه الأربعة

دەگەڕێینەوە، ئەوانە خێر و بێر و بەزەیی پەروەردگاریان بەسەردا دەبارێت و ئەوانەن، کە ڕێنوێن بوون.﴾البقرة/١٥٥-١٥٧.

ئا بەمشێوەیە و... بەمشێوەیە... ئیسلام ئەرکی لەتوانا بەدەر بەسەر کەسدا نادات، بە ئەرکەکانەوە کۆتبەند نابیت و لەژێریدا بارگران نابیت و، بەڕاڕایی و پەرتەوازەیی لەنێوان ئەرکەکان و تواناادا نامێنێتەوە، بەڵکو بە بەدەنگەوەچوون خۆشحاڵ دەبێت و بە گوێڕایەڵی ئاسودە دەبێت و، دڵت ئۆقرە دەگرێت و دەحەسێتەوە.

## ئاسودەبون بە خوا

ئیسلام لەڕێی مەیل دانە لای خودا و، دڵنیابوون لە نزیکیی و، متمانە بە بەزەیی و چاودێری و پاراستنی ئەو، ئۆقرەگرتن و ئاسایش و ئاشتی دەڕێژێتە دەرونەوە، ئیسلام بەوە جودا دەکرێتەوە، کە تیایدا پەیوەندی نێوان پەروەردگار و بەندە ڕاستەوخۆیە، قەشەو فاڵگرەوە ناچنە ناویەوەو، لە زەوی یان لە ئاسماندا بە ویستی هیچ دروستکراوێکەوە پەیوەست نیە.

تاك لەسایەی ئەم پەیوەندیە ڕاستەوخۆیەدا هەست دەکات، کە پاڵی داوەتە هێزێکەوە، کە هیچ هێزێك لەسەرویەوە نیە و، هیچ هێزێك بەرامبەری ناگرێت. ئەو هێزە هەموو کات ئامادەیە و لەبەر دەستیەتی کە پەنای بۆ ببات و داوای یارمەتی لێ بکات، بەو مەرجەی خۆی بۆی دڵسۆز بێت و، لە هەستیا هیچ هێزێك نەکاتە هاویەشی و، لە ویژدانیدا حیساب بۆ هیچ هێزێکی دیکە نەکات: ﴿وَقَالَ رَبُّكُـم ادْعُونِـي أَسْـتَجِبْ لَكُمْ: پەروەردگارتان فەرموویەتی: بانگم بکەن، بە دەنگتانەوە دێم.﴾ غافر/٦٠.

﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِي فَلْيَسْتَجِيبُوا لِـي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ: ئەگەر بەندەکانم دەربارەی من پرسیاریان لێ کردیت؛ من نزیکم، هەرکەس بانگم بکات وەڵامی دەدەمەوە، با بەدەنگمەوە بێن و بڕوام پێ بهێنن، بەڵکو ڕێنمون دەبن.﴾ البقره/١٨٦.

لـه سـایەی ئـەو هـێزەدا هـەر هـەموو هـێزەکانی زەوی بچوك دەبنەوە، پەردە درۆیـنەکانی مەزنێـتی و دەسەڵاتە ساختەکان بەردەبنەوە و، بەهێز و دەوڵەمەند و خـاوەن پایـە و دەسـەڵات و پادشاکان هەرهەموویان بە بچوك و لاواز و کەم دێنە بەرچاو، کە نە سود بە ئادەمیزاد دەگەیەنن نە زیان.

﴿قُـلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلاَنَا: بلێ تووشی هیچ نابین، مەگەر ئەوەی خوا بۆی نوسیوین، ئەو سەروەرمانە.﴾التوبة/٥١.

هـەر هـەموو هێزەیکانی سەر ڕووی زەوی توانایان بەسەر مێشێکدا نیە: ﴿وَإِنْ يَسْـلُبْهُم الذُّبَابُ شَيْئًا لاَ يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ: ئەگەر مێشێك شـتێکیان لێ بڕفێـنێ، نـاتوانن لـێی بسـتێننەوە، داواکـار و داواکـراو هـەردووك لاوازن.﴾ الحج/٧٣.

لەژێر سایەی ئەم هێزەدا تاك لە ڕۆزی و پایەی خۆی دڵنیا دەبێت، هەروەك چۆن لە ژیان و سەلامەتی خۆی دڵنیایە، هیچ هێزێك نیە و کەس ناتوانێ زیان لە ڕۆزیی یـان پایـەی یـان کاروبـارێك لـە کاروبارەکـانی دونـیا و ڕۆژی دوایـی بـدات، ئەو بەهـێزێکی تۆکمەیـە، کـە هاوتای هەموو هێزێکە کە ڕوبەڕووی دەبێتەوە، چونکە پشـتیوانی لـەم هێزە مەزنە وەردەگرێت، کە بڕانەوەی بۆ نیە، کە هەموو گەردوون بـەڕێوە دەبـات، دەسەڵاتدار و تواناداره‌کان بەڕێوە دەبات: ﴿قُلْ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَـيْرُ إِنَّـكَ عَلَـى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: بلـێ: خوایە! ئەی خاوەنی هێز و دەسەڵات! هەرکـەس بۆ خۆت مەیلت لێبێ دەسەڵاتی پێ دەدەی، کێش تۆ حەزکەی دەسەڵاتی لێ دەستێنی، هەر کەس مەیلت لێبێ بەڕێز و پایەبەرزی دەکەی، هەرکەس مەیلت لێـبێ سەرشـۆڕ و زەبوونـی دەکـەی، هەموو چاکەیەك بە دەستی تۆیە، تۆ توانات بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.﴾آل عمران/٢٦.

﴿إِنْ يَنْصُـرْكُم اللَّـهُ فَلاَ غَالِبَ لَكُمْ وَإِنْ يَخْذُلْكُمْ فَمَنْ ذَا الَّذِي يَنْصُرُكُمْ مِنْ بَعْدِهِ: ئەگەر خوا سەرتان بخات، کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێت، ئەگەریش پشتتان بەر بدات، کێ لەدوای ئەو یارمەتیتان دەدات.﴾آل عمران/١٦٠.

﴿مَــنْ كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا: کەسێ ڕێز و قەدری دەوێ، ڕێز و قەدر گشتی لەدەست خودادایە﴾فاطر/١٠.

﴿وَلِلَّــهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ: دەستەڵات هەر بۆ خودا و، بۆ پێغەمبەری و ئاپۆرەی مسوڵمانانە﴾المنافقون/٨.

﴿يَاأَيُّهَــا النَّــاسُ اذْكُــرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّــمَاءِ وَالأَرْضِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ: خەڵکینە! لەبیرتان بێت خوا چەندی چاکە لەسەر ئێوە هەیە؛ ئاخۆ بێجگە لە خوا، هیچ وەدیهێنێك هەیە، کە لە ئاسمان و زەویدا بژێوی ئێوە دابین بکات، بێجگە لەو هیچ خواوەندێك نیە شایستەی پەرستن بێت، چۆن ڕووی لێ وەردەگێڕن. ﴾فاطر/٣.

ئەگەر هەموو هێزەکانی زەوی دەست لەناودەست بن بۆ زیان پێگەیاندنی، ناتوانن مەگەر خوا ویستی لەسەر بێت، جا ئەگەر خوا ویستی ئازارێکی پێ بگات، ئەوە حیکمەتێکی بەرزی خوای تێدایە، چاکەیەکی بەرزتر لە چاکەی سنورداری تاکی تێدایە، بەڵکو چاکەیەکی بۆ ئەو تاکە تێدایە، کە لەو کاتەدا نایزانێت، بەڵام خوای وەدیهێنەری گەورە ئاگاداری تەواوی بونەوەرە و دەیزانێت: ﴿وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَــمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ: لەوانەیە شتێك حەزی پێناکەن بەڵام بۆتان بەخێر بگەڕێ، لەوانەشە شتێك حەزتان لێی بێت و ئاکامەکەی خراپ بێت بۆتان.. خوا دەیزانێ و ئێوە نایزانن. ﴾البقرة/٢١٦.

تاك هەر ئەوەندەی لەسەرە خۆی بداتە دەست خوا و، ڕەزامەندی خوا بکاتە ئامانجی خۆی و، جیهاد و تێکۆشان بکات بۆ بەرزکردنەوەی وتەی خوا و، بەدیهێنانی ویستی خوا لە زەویدا و، هیچ ڕۆژێك خۆی نەداتە دەستەوە و خۆی سوك نەکات، لەو ڕێگایەشدا خەمبار و دڵتەنگ نەبێت بەوەی لەدەستی چووە، چونکە هەر شتێکی لەو ڕێگایەدا پێشکەشی کردووە لای پەروەردگاری پارێزراوە و ون نابێت: ﴿وَلاَ تَحْسَــبَنَّ الَّذِيــنَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُــرْزَقُونَ: ئەوانەی لەڕێی خودا کوژراون، هەرگیز بە مردوویان حیساب مەکەن،

بـەڵکو زیـندون و پـەروەردگاریان بژێویـان دەداتێ.﴾آل عمران/١٦٩-١٧١. ﴿وَاللَّهُ مَعَكُــمْ وَلَنْ يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ: خواش لەگەڵتانە، کردارەکانیشتان نەبڕاوەیە.﴾محمد/٣٥.

لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا خوا ئاگای لێیەتی و بەڕێزی دەکات: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَـنِي آدَمَ وَحَمَلْـنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِن الطَّيِّبَات وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّـنْ خَلَقْـنَا تَفْضِـيلاً: ئێمە ڕێزی نەوەی ئادەممان گرت و لە وشکانی و زەریادا هەڵمانگـرتن، ڕۆزیـی پاکژمـان پـێداون، لەچـاو زۆر لەوانـەی وەدیمـان هێناون پتر قەدرمان گرتون.﴾الإسراء/٧٠.

ئـەو خودایـە مـیهرەبان و بەسـۆزە بـۆی، ئەگـەر تەوبـەی تـەواو بکـات لـێی وەردەگیرێـت و دەیبورێـت، یان یەك یەك لە خراپەکانی دەپرسێتەوە، ئەگەر ڕێی ون کـرد و گومـڕا بـوو ڕێـنمونی دەکـات، ئەگـەر چـاکەی کـرد پاداشتی چەند جارە دەداتـەوە، سـزا توندەکەشـی تـەنها بۆ ئەوانە جێبەجێ دەکرێت، کە لە خراپەکاری ڕۆدەچن: ﴿غَافِرِ الذَّنْبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ شَدِيد الْعقَابِ ذِي الطَّوْلِ: لەگوناهان دەبورێت و تەوبـە و پەشـیمانی قەبوڵ دەکات و سزای توندوتیژە و دەستی چاکە و بەخشینی لەسەر بەندەکانی درێژە.﴾غافر/٣.

﴿مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَهُمْ لاَ يُظْلَمُــونَ: هەرکـەس چـاکەیەك بکـات، دە ئـەوەندەی چاکە لەگەڵ دەکرێتەوە. کەسـێکیش خراپەیەك بکا، بە ئەندازەی خراپەکەی سزا دەدرێ و کەس ستەمی لێ ناکرێ.﴾الأنعام/١٦٠.

بە هەموو ئەمانە دەروون ئاسودە و ئارام و متمانە بەهێز دەبێت، کە ڕوداوەکان نایلەرزێـنن و، کارەسـاتەکان ڕامالّی ناکەن و، لەهیچ شتێك داناچڵەکێ و ناترسێ: ﴿الَّذِيــنَ آمَــنُوا وَتَطْمَــئِنُّ قُلُوبُهُــمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ: ئەو کەسـانەی کـە بـڕوایان بەخوا هەیە و بە یادی خوا دڵیان ئارام دەبێت، هەر بەیادی خوا دڵ ئارام و ئۆقرە دەگرێت.﴾الرعد/٢٨.

## دابینکارەکان و دڵنیاییەکان( الضمانات والتامينات )

ئیسلام بەپێی تێڕوانینە گشتییەکەی بۆ ژیان و هەڵنەرەکانی و هۆیەکانی و، پێویستییەکانی و ئارەزووەکانی و، ماددیەتیەکانی و رۆحانیەتیەکانی.. تاك ناداتە دەست بیروباوەڕە گیانیەکەی، کە لە ویژدانیدایە، بەڵکو یارمەتی دەدات بە بەدیهێنانی هۆیەکانی لە جیهانی واقیعدا، چونکە جیهانی واقیع لە ئیسلامدا پاچڤانێکی کرداریی جیهانی ویژدانە.

پاشان تەنها لەو سنورە ناوەستێت، کە تاك لە خوا دڵنیا بکات، بەڵکو لە ژیانی واقیعیدا دەستوری وای بۆ دادەڕێژێت، کە ئەو دڵنیاکەرەوانە بگرێتە ئەستۆ، جا تاك لە دەوروبەری خۆیدا تەنها هەست بە ئاسایش و دادگەری و بوونی تەواوی پێویستییەکان دەکات.

ئیسلام تاك لە هەموو دەستدرێژییەك دڵنیا دەکات، چ دەستدرێژی تاك بۆ تاك بێت، یان دەستدرێژی دەسەڵاتدار لێی، ئەو تاکە هەست دەکات لە ناوەندێکدا دەژێت، کە خۆشی دەوێت و دژایەتیی ناکات و، ئاگاداری خۆیی و ماڵ و ناموسی دەکات: ((لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ: هیچ کەسێکتان بڕواتان تەواو نابێت هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش نەبێت))[1]. ((كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَعِرْضُهُ وَمَالُهُ: خوێن و ناموس و ماڵی هەر مسوڵمانێك لە مسوڵمان حەرامە))[2]. ((وَاللَّهِ لا يُؤْمِنُ، وَاللَّهِ لا يُؤْمِنُ، وَاللَّهِ لا يُؤْمِنُ، قِيلَ: مَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الَّذِي لا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَايِقَهُ: بەخوا بڕوادار نیە، بەخوا بڕوادار نیە، بەخوا بڕوادار نیە.. گوترا: کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەو کەسەی دراوسێکەی لە خراپەی دڵنیا نەبێت))[3]

دەسەڵاتدار لە سنوری یاسادا نەبێت، هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر تاکدا نیە. ئەو یاسا خوداییەی تاك و دەسەڵاتدار وەك یەك ملکەچ دەکات، ئەو یاسایەی لە حەز و

---

[1] رواه الخمسة الا اباداود

[2] أخرجه الستة الا النسائي.

[3] أخرجه الشيخان واللفظ للبخاري.

ئـارەزووی دەسەلاتدار، یان چینێك یان کۆمەڵێك وەرنەگیراوە و، جێبەجێکردنی بۆ دابیـنکردنی بـەرژەوەندیی دەسەلاتدار، یان چینێك یان کۆمەڵێك دانەنراوە، بەڵکو خـوای پەرسـتراوی هـەموان و خـاوەن و گـەورەی هەموان، بۆ بەرژەوەندی هەموان دایڕشـتوە، ملکەچـی ئـەم یاسـایە ملکەچییە بـۆ خـوا، نـەك بـۆ بەندەیـەك لە بەندەکانی، دابینکردن تیایدا بۆ هەموانە، چونکە بۆ هەموان دارێژراوە.

ئەمەیـە جـیاکاری ئـەو وڵاتـەی، لەسەر دەستوری ئایین و یاساکەی دامەزراوە. سەربەسـتی تـەواو لـە هەموو بەندایەتییەکی سەر زەوی تەنها لە سایەی ئەم جۆرە یاسـایەدا دەبێـت، ئەگـەر کۆمەڵـە مرۆڤـێك، هەرکەسێك بن، دەستور بۆ کۆمەڵە کەسـێك دارێـژن، هەرگیز رێزی ڕەها و یەکسانیی ڕەها و بەرژەوەندیی ڕەها نایەتە دی، دەسـەلاتداران هـەردەم وا هەست دەکەن، کە ئەوان پەروەردگارن، لەبەر ئەوەی ئـەوان دەسـتور دادەنـێن، یاسـاش هـەردەم لـە بـەرژەوەندی چـینێك دەبێت بەبێ چـینێکی دیکـە، کـە هەرگیز بەرژەوەندییەکانی هەموان بەدی ناهێنێت. تەنها لە یـەك بـاردا تـاك، ملکەچـی یاسـا دەبێـت و هەست بە سەربەرزی و سەربەستی و بـەرژەوەندی تـەواوی خۆی دەکات.. لەو بارەدا کە دەستور هەمووی لە شەریعەتی خـوا وەرگیرابێـت، کـە تـیایدا فەرمانڕەوا تەنها خودایە، دەسترۆیشتو و زاڵ تەنها خودایـە، هـیچ بەرژەوندییـەکی نیە لە زاڵ کردنی چینێك بەسەر چینێکی دیکەدا، یـان ملکـەچ کـردنی چینێك بۆ چینێکی دیکە، تەنها لەو کاتەدا تاك دڵنیا دەبێت بـە دادوەری ڕەهـا و دەحەسـێتەوە. لـەو کاتـەدا دەسـەلاتدار لـەو فـیز و خۆبەگەورەزانیـنە دادەبـەزێ، کە لە دەسەلاتی یاسادانان دا وەری دەگرێت، هەست دەکـات کـە هیچی بەدەست نیە، تەنها جێبەجێکردنی یاسای خودایی نەبێت، ئەو یاسـایەی لەسـەر ئـەو و هـەموو تاکێك وەك یەك فەرز کراوە، ئا ئەمەیە ڕزگاریی تەواوی ڕاست.

ئیسـلام لـەم یاسـایەیدا هـەموو دڵنـیاکەرێکی بۆ دابین دەکات؛ ژیان و ماڵ و ناموسـی دەپارێزێـت، تـەنها بـە حـەقی خـوا نەبێـت دەسـتکاری ناکرێـت، لـە

گاڵتەپێکردنی، یان سیخوڕی بەسەردوە کردنی یان لە پاشملە باسکردنی، یان رەفتار لەگەڵ کردنی بە گوێرەی گومان دەپارێزێت:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ يَسْخَرْ قَومٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلاَ نِسَاءٌ مِـــنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ وَلاَ تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ بِئْسَ الاسْـــمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الإِيمَانِ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ، يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِـــبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلاَ تَجَسَّسُوا وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ: ئـەی بـڕواداران! بـا هێندێکـتان گاڵـتە بـە هێندێکـتان نەکەن، لەوانەیە ئەوانەی گاڵـتەیان پێدەکـەن لـەوان باشـتر بـن، بـا ئافرەتانـیش گاڵتە بە ئافرەتان نەکەن، لەوانەیـە ئەوان لەوان باشتر بن. لە سیلەی چاو داگرتن و تانەو تەشەر لەیەك دان و ناوونـاتۆرە لـێك هـەڵدان دەس هەڵگـرن، چـونکە لـە پـاش بڕواهێـنان، فاسقی و لـەڕێلادان خـراپترین نـاوە.. هەرکـەس پەشـیمان نەبێتەوە لە ستەمکارانە.. ئەی بڕواداران! لە زۆربەی گومانان خۆبپارێزن، چونکە هەندێك گومانی وا هەن گوناهن. سـیخوڕی بەسـەر یەکەوە مەکەن و لە پاشملە خراپەی یەکدی مەڵێن، ئاخۆ کەستان حـەزی لێـیە گۆشتی براکەی بە مردوویی بخوات؟ دیارە پێتان ناخۆشە، دەسا لەخوا پارێزکار بن، خوا تەوبە وەرگر و دلۆڤانە.﴾الحجرات/١١-١٢.

هـەروەها سەربەستیی ناوماڵەکەی خۆی و رێز و حورمەتی دابین دەکات و نابێ کەس بەسەر دیواریدا ناودیو بێت و نابێ کەس بەبێ مۆڵەتی ئەو بچێتە ماڵەکەی:

﴿يَاأَيُّهَـــا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلاَ تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُـــؤْذَنَ لَكُمْ وَإِنْ قِيلَ لَكُم ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ: ئـەی بـڕواداران! مەچـنە نـاو هـیچ ماڵـێکی بێجگە لە ماڵی خۆتان هەتا مۆڵەت نـەخوازن و سـڵاو لـە خەڵکەکەی نەکەن.. ئەمە بۆ ئێوە باشترە و بەڵکو پەندی لێ وەرگـرن. ئەگـەر کەسـتان تـیادا نەدیـت مەچـنە ژوورێ تـا مۆڵەتـتان پێ دەدرێ.

ئەگـەریش پێـتان وترا: بگەڕێنەوە، ئەوا بگەڕێنەوە، ئەمە بۆ ئێوە چاکترە. خوداش لە هەر کارێ دەیکەن ئاگادارە.﴾النور/٢٧-٢٨.

هـەتا تاوانـیش نابێـت بـە شـاودیو بـون بـۆ ناو ماڵان و، سیخوڕیکردن بەسەر خەڵکەوە لە ناو ماڵیاندا بسەلمێنرێت.

دەگـێڕنەوە کـە عومـەری کـوڕی خەتـتاب-خوای لیڕازی بێت- لە یەکێك لەو شـەوانەی بـەناو شـاردا دەگـەڕا، بـەلای ماڵێکدا تێپەڕی و گوێی لە دەنگی ژن و پـیاوێك بـوو، وادیارە گومانی بۆ دروست کرد، بۆیە چوە سەر دیوارەکە تا تەماشا بکـات، دیتی ژن و پیاوێکن و کوندەی ئارەقیان پێیە، عومەر گوتی: ئەی دوژمنی خـوا! وا دەزانی خوا لە کاتی سەرپێچی کردنیدا دەتشارێتەوە؟ پیاوەکە گوتی: ئەی ئـەمیری بـڕواداران! مـن یـەکجار سەرپێچـی خـوام کـرد، بەڵام تۆ سێجار؛ خودا دەفەرموێـت (ولا تجسـسـوا) سـیخوڕی بەسەر یەکەوە مەکەن، تۆ سیخوڕیت بەسەر ئـێمەوە کـرد، خـودا دەفـەرموێ (وأتوا البیوت من أبوابها) لە دەرگاوە بچنە ناو ماڵەکانـەوە، تـۆ بەسەر دیواردا هاتیتە ژوورەوە، خودا دەفەرموێ (ولا تدخلوا بیوتا غـیر بیوتکم حتی تستأنسوا وتسلموا علیٰ أهلها) مەچنە ماڵێکی بێجگە لە ماڵی خۆتان هەتا مۆڵەت نەخوازن و سەلام لە خەڵکەکەی نەکەن، تۆ نەتکرد.

بـەم جـۆرە عومـەر هەسـتی کـرد کـە بـۆی نـیە سـزای بـدات، چـونکە (پێویستیەکانی سزادان پوچ بۆوە)! بۆیە داوای تەوبەکردنی لێکرد!

بـەم دابیـنکردنانە ئیسـلام هەموو ئاسودەیی و سەربەستی و حورمەتێکی تاك دەگرێـتە ئەسـتۆ. ئەگـەر دەسـتدرێژکارێك دەسـتدرێژی بکاتـە سـەری، ئەوا تۆڵە ئامادەیـە، جـا ئـەو دەسـتدرێژکارە هـەر کەسـێك بێـت، ئەگـەریش دەسەڵاتداری هەرەبـەرز بێـت، ئیسـلام نـە لە یاساکەیدا و نە لە واقیعە مێژووییەکەیدا-کاتێك فەرمانـڕەوا بـوو-، لـە تۆڵەسـەندنەوەدا جیاوای لەنێوان خەلیفە، یان ئەمیر لەگەڵ تاکـێك لـە تـێکڕای مسـوڵمانان نەکـردووە.. (محمد)ی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆڵەی لـەخۆی دەردەهێـنا، عومـەری کـوڕی خەتـتاب لێدەگەڕێ کوڕە میسرییەك کە لە تـێکڕای گەلـە، بـە ئـارەزوی خۆی لە کوڕی (دوو بەرێزەکە) بدات -کوڕی عەمری

کوڕی عاصی فەرمانڕەوای میسر-، عەلی کوڕی ئەبوتالیب ناکۆکی خۆی و نەصرانیەك، کە زرێیەکەی دزیوە دەباتە لای شورەیحی قازی، قازیش حوکم لەدژی عەلی دەردەکات، لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی لەسەر دزەکە نیە، خەلیفەش زەردەخەنە دەیگری و ڕازی دەبێ!

هەروەها و هەروەها، کە لێرەدا بواری درێژەپێدانی نیە و ئاماژەیەکمان بەسە.[1]

پاشان ئیسلام ڕۆزیی تاك لە گەردنی کۆمەڵدا دابین دەکات، لەکاتی بەتواناییدا کار و کرێی گونجاوی بۆ دابین دەکات، لەکاتی پەککەوتن و نەتوانین و نەخۆشی و پیریدا، دابینکاری کۆمەڵایەتی بۆ دابین دەکات، منداڵ لەکاتی شیرەخۆرەیی و کاتی تازەپێگەیشتنندا دەگرێتە ئەستۆی خۆی، تا ئەو کاتەی توانای کاری دەبێت. لەکاتی قسەکردن لەسەر ئاشتی کۆمەڵدا، بە درێژی باسی ئەو دابینکارییانە دەکەین، لێرەدا تەنها ئەوەندەمان بەسە، کە ئاماژە بەو دابینکارییانەی تاك بدەین، کە لە واقیعی ژیاندا ئارامی دەخاتە دەرونیەوە و دڵنیایی دەخاتە گیانیەوە، ئەمە دوای ئەو ئارامیە ڕۆحییەی، لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا دەیبینێت.

ئیسلام هەموو هۆکارەکانی ئاشتی لە ناخی ویژداندا دابین دەکات، دروشمەکەشی ئەوەیە وەك لە سەرەتای ئەم بەشە گوتمان: (ئاشتی بۆ جیهانێك نابێت، کە ویژدانی تاك تیایدا بە ئاشتی نەژێت).

[1] بگەڕێوە بۆ باسی (من الواقع التأريخي) لە کتێبی (العدالة الإجتماعية في الإسلام)

# ئاشتیی ناو ماڵ

ماڵ شوێنی گەڕانەوە و ئارام بوونە، لە سایەیدا منداڵ پەروەردە دەبێت، بەرەبەرە پێدەگات، سروشت و رەفتار لە سروشتی ئەو ماڵە وەردەگرێت، لە کەش و هەواکەی هەناسە دەدات و لەسەری ڕادێت.. چەندین ڕوداو و کارەسات لەسەر شانۆی کۆمەڵ روویدا و کاری کردە سەر ڕێڕەوی مێژوو، کە وروژێنەرە شاراوەکانی لە کارتێکەرەکانی ناوماڵدایە.

ئەو تاکەی لە ماڵەکەیدا بە ئاشتی ناژێت، بەهای ئاشتی نازانێت، هەرگیز تامی ناکات، هەرگیز نابێتە هۆکاری ئاشتی، کە لە دەمارەکانیدا جەنگ و، لە دەرونیدا دڵەڕاوکێ و، لە ڕۆحیدا شپرزەیی دەبێت.

ئیسلام هەر لەو کاتەی ڕوو دەکاتە ویژدانی تاك و، کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی، لە هەمان کاتدا ڕوودەکاتە چاندنی تۆوی ئاشتی لە ماڵدا، چونکە هەمویان بازنەی هاوکاری یەکدین و، پێکەوە پەیوەستن و پەیوەندییان لە نێواندا هەیە.

## بەستنی پەیوەندیەکی پیرۆز

ئیسلام یەکەم جار دەست دەکات بە وێناکردنی پەیوەندی ناوماڵ بە شێوەیەکی بەرز و ناسك، کە سۆزی لێ دەدرەوشێتەوە، تاریکی دەرەوێنێتەوە، فێنکی دەبەخشێ و بۆنی خۆشی لێ دێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِه أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً: یەکێك لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە، کە لە خۆتان هاوجوتی بۆ وەدیهێناون، تا لەلایان بحەسێنەوە و ئارام بگرن و، سۆز و خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان.﴾الروم/٢١.

﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ: ژنەکانتان پۆشاکن بۆ ئێوە، ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان.﴾البقرة/١٨٧.

ئەمە پەیوەندیی دەروونە بە دەروونەوە، پەیوەندیی ئارامی و ئۆقرەگرتنە، پەیوەندیی سۆز و خۆشەویستی و بەزەییە، پەیوندیی داپۆشین و جوانکردنە. لە هەمان ئەم وشانەدا هەست بە سۆز و بەزەیی دەکەیت و فێنکی و سێبەرت بۆ

دێت. ئەمە دەربڕینێکی تەواوی حەقیقەتی ئەو پەیوەندییەیە، کە ئیسلام بۆ ئەو پەیوەستبونە ئادەمیە بەتینە فەرزی دەکات.

ئەمە لە کاتێکدایە، کە تێبینی هەموو پێویستییەکانی ئەو پەیوەست بوونەی تێدا دەکرێت، کە یەکێك لەوانە درێژەپێدانی ژیانە لەڕێگای منداڵەوە، هەموو ئەو پێویستییانە مۆرکی پاکی و بێگەردیی پێوە دەنرێت و، دان بە پاك و خاوێنیی و راستیەتیەکەیدا دەنێت و، هاوڕێکی لەنێوان ئاراستەکانی و پێویستیەکانی دروست دەکات، ئەمە لە کاتێکدا کە دەفەرموێت: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ: ژنەکانتان کێڵگەی ئێوەن. ﴾البقرة/٢٢٣.، هەروەها مانای چاندن و زۆرکردنی تیادا بەدی دەکرێت.

ئیسلام دەورەی ئەو شانەیە، یان بێشکەیە، یان ئارامگەیە بە هەموو چاودێری و دابینکاریەکی خۆی دەدات. بەپێی سروشتی هەمووەکی ئیسلام، تەنها بە تیشکدانەوەوی ڕۆحی ناوەستێت، بەڵکو رێکخستنی یاسایی و دابینکاری یاسادانانی بەدوادا دێت.

یەکەم: پێویستە ئەو پەیوەست بونە ڕەزامەندی و مۆڵەتی تێدا بێت، ئافرەت بەبێ مۆڵەت و رەزامەندی خۆی مارە ناکرێت: ((لا تُنْكَحُ الثَّيِّبُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ وَلا الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ وَإِذْنُهَا الصُّمُوتُ: بێوەژن مارە ناکرێت هەتا فەرمانی لێ وەرنەگیرێت، کچ مارە ناکرێت هەتا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێت و مۆڵەتەکەی بێدەنگ بوونە))[1]

ئەمەش وا پێویست دەکات، کە ببینرێت تاکو ئەو ڕەزامەندییە تەواو بێت و لەسەر راستەقینە بنیات نرابێت و لە هەستەوە هەڵقوڵابێت: ((انْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا: تەماشای بکە، چونکە تەماشاکردن خۆشەویستی لەنێوانتان دروست دەکات)).[2]

---

[1] أخرجه الشيخان

[2] لە فەرموودەیەکدا کە لە (مغیرەی کوڕی شعبە)وە هاتوە، خاوەنی (مصابیح السنه) گوتویەتی کە لەفەرمودە (حسن)ەکانە.

دووەم: پێویستە ئاشکرایی و شاهێدیی تێدابێت، نابێت وەکو تاوان بە نهێنی و شاراوەیی ئەنجام بدرێت، پێویستە وەلام دانەوە و قبولّ کردنی ڕاشکاوی تێدا بێت و شاهێدەکان ئاگادار بن، جا هیچ گومانێك یان شاراوەیی لە دامەزراندنی ئەم پەیوەستبونە نامێنێت، هەتا وا باشترە بۆ زیاتر ئاشکراکردن بەو بۆنەیەوە، تەپڵ لێبدرێت.

سێیەم: بۆ ئەم پەیوەندیە پیرۆزە پێویستە نیەتی بەردەوامی تێدا بێت، نەك تا کاتێکی دیاریکراو بێت، ئەگەر نیەتی وابوو یان رایگەیاند، کە ئەم هاوسەرگرتنە بۆ کاتێکی دیاریکراوە، ئەوا مارەی نایەت. چونکە ئەم پەیوەند بەستنە بە مەبەستی ئارام و ئۆقرەگرتنە، مەبەستی ئەوەیە کە ژن و مێرد بە دڵنیاییەوە خۆیان بدەنە پاڵی و، لە سایەیدا بەبێ ترس و دڵنیایی ژیان بنیات بنێن.

ئیسلام بۆ دابین کردنی کەشی ناومالّ و، دابین کردنی چاودێری بۆ ئەو منداڵانەی تیایدا پێدەگەن.. لەسەر پیاوی پێویست کردووە و بەپێویستی داناوە، کە بژێویان بۆ پەیدا بکات، بۆ ئەوەی دایك توانا و کات و هێمنیی بۆ بڕەخسێت بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەو منداڵە ناسکۆلانەو، هەروا ئەوەی بۆ بڕەخسێت ئەو سیستەم و بۆن و بەرام و خۆشییەی لەو ئارامگەیەدا ئامادەی بکات. دایکی کارکەر بۆ پەیداکردنی پارە و، شەکەت و ماندوو بە پێویستییەکانی کار و ، پەیوەست(مقید) بە کاتە دیاریکراوەکانی، کە تواناکانی تیایدا پەرش بوەتەوە.. ناتوانێت بۆن و بەرام و کەشی خۆش بەماڵ ببەخشێت، ناتوانێت ماف و چاودێری تەواو بە منداڵەکان ببەخشێت.. ماڵی ژنە فەرمانبەر و کرێکارەکان هەروەکو کەش و هەوای ئوتێل و میوانخانەکان وایە، بۆن و بەرامەی ماڵانی تێدا بلاو نیە. لەڕاستیدا ماڵ دروست نابێت بەبێ ئەوەی ئافرەت بنیاتی بنێت، بۆن و بەرامی ماڵ بلاو نابێتەوە مەگەر ژن بلاوی بکاتەوە، سۆزی ناوماڵ بلاو نابێت مەگەر دایك لە ئەستۆی بگرێت، ئەو ئافرەتەی، یان ژنەی، یان دایکەی کات و توانا و وزە ڕۆحییەکەی لە کارکردندا بەسەر ببات، لە کەش و هەوای ماڵدا تەنها ماندوێتی و داهێزران و بێزاری بلاو دەکاتەوە.!

دەرچوونی ژن بۆ کارکردن کارەساتێکە بەسەر ماڵدا دێت و لەوانەیە پێویستیی ڕێگای پێبدات، بەڵام ئەوانەی بە خۆشی خۆیان دەیکەن، ئەگەرچی داران، دەتوانن نەیکەن، ئەوە نەفرەتێکە و لە چەرخەکانی بەرەودواچون و بێئاگایی و گومڕاییدا، تووشی گیان و ویژدان و ژیرییەکان بووە.

لەپێناو ئارامی ماڵ و بڕینی ڕێگای بێسەروبەری و ناکۆکی تیایدا، ئیسلام سەرپەرشتی ماڵی بۆ پیاو داناوە، ئەمەش هاوتەریبی سیاسەتی ئەو ڕێکخستنەیە، کە ئیسلام زۆر مکوڕە لەسەری، ئەو ڕێکخستنەی وای لە پێغەمبەرﷺ کرد، کە فەرمان بە پیاوان بکات، کە ئەمیر و براگەورەیەك بۆ خۆیان دابنێن، هەتا ئەگەر سێ کەسیش بۆ کارێك دەرچوون با یەکێکیان ئەمیر بێت.

یەك بەڕێوەبەر بۆ ئاسایشی کەشتی پێویستە، لە کەشتیی ماڵیشدا دەبێ بەڕێوەبەرێك هەبێت، کە بەرگەی شوێنکەوتەکان بگرێت و سیستەم(نظام) لە شکست بپارێزێت، لەمەشدا هیچ ڕیزپەڕییەك لە بنەما ئیسلامییە گشتییەکەدا نییە، هەتا لە جیهانی پیاوانیشدا. ژن و مێرد کامیان ژیربێژی قبوڵیەتی، کە بەڕێوەبەرایەتی بداتە دەست؟ ئافرەت کە سۆز و هەڵچونی بەسەردا زاڵە، بەهۆی ئەو ئەرکە سەرەکیەی هەیەتی، لە چاودێری منداڵ و بۆن خۆش کردنی کەش و هەوای ناوماڵ، یان ئەو پیاوەی کە ئیسلام ڕایسپاردووە پێویستییەکان دابین بکات، تا ئافرەت یەکلابێتەوە بۆ بارگرانیە مەزنەکەی و، هەموو وزە و توانای تیادا خەرج بکات؟

ئیسلام کە سەرپەرشتیارێتی داوە بە پیاو، بۆ بەدیهێنانی سیستەمەکەیەتی، تا لە هەموو کارێکدا بەڕێوەبەرایەتی و سەرپەرشتیارێتی هەبێت، بۆیەش هەڵیبژاردووە، چونکە بە پێی چۆنیەتی دروست بونی و ئەزمونەکانی، شایانترە بەو ئەرکە.

بەم شێوەیە کاتێك مەسەلەکە بەم ڕوون و ئاشکراییە دەخرێتە ڕوو، ژاوەژاوی قسە پوچەکانی ئەو پیاو و ئافرەتە مێشك بەتاڵانەی ئەم سەردەمە سەبارەت بەم سیستەمە ئاشکرا دەبێت، بە دیاردەکەوێت کە بۆشایی لە ژیان و بۆشایی لە

دڵـەکان و بـۆ شـایی لە مێشکەکان ئەم ژاوەژاوە دروست دەکات و دەیکاتە بابەتی شەڕەقسە و گفتوگۆ.

ئـەوە سیسـتەمێکە ئیسـلام مەبەسـتیەتی بـیکات بە ئەڵقەیەك لە ئەڵقەکانی ئاشتی لەناو ماڵدا و، ئارامی و ڕێکوپێکی تێدا دابین بکات.

بـەڵام لـە سـەردەمەکانی داڕوخـاندا، لـە ماوەکـانی هەبوونی بۆشایی لە کارە گـرنگەکاندا، کۆمەڵ هیچی دەست ناکەوێت خۆی پێو خەریك بکات تەنها پەڵك و پاڵ نەبێت، هەروا تەنها دەنگەدەنگ و زۆر لەسەر ڕۆیشتن نەبێت!

## تێکەڵی و بەدەرخستنی جوانی ئافرەت بۆ پیاوی بێگانە

لەپێناو ئاشتی ناو ماڵ و بڵاوکردنەوەی متمانەبون و دڵنیایی تیایدا، ڕێگری لە بەدەرخسـتنی ئافـرەت بۆ پیاوی بێگانە کراوە، داوای خۆپاراستن لە تێکەڵی کراوە، فەرمان بە شەرم و خۆپارێزی کراوە، تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەردا بۆ دایکانی ئیماندارانیش: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلاَبِيبِهِنَّ: ئـەی پێغەمـبەر! بە ژنەکانت و کچەکانت و خێزانی بڕواداران بڵێ: با بە چوارشێوەکانیان خۆیان داپۆشن.﴾الاحزاب/٥٩.

﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ، وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوْ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلاَ يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ: بە بڕواداران بڵێ: چاو دانەوێنن و عەورەتی خۆیان بپارێزن، ئەمە بۆ ئەوان باشـترە و خوداش ئاگای لە هەموو ئاکاریان هەیە.. بە ئافرەتە بڕوادارەکانیش بڵێ بـا چـاویان دانەوێـنن و عـەورەتی خۆیـان بپارێزن و جوانیی خۆیان بەدیار نەخەن، تـەنها ئەوانـە نەبێـت کـە بەدەرەوەن، با سەرپۆشەکانیان بەسەر سینگ و بەرۆکی

خۆیـان دا بـدەن ورازاوەیی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر بۆ مێردەکانیان یان باوکانیان یان باوکانی مێردەکانیان یان منداڵەکانیان یان منداڵی مێردەکانیان، یان براکانیان یـان مـنداڵی براکانـیان، یـان مـنداڵی خوشـکەکانیان، یـان ژنەکانـیان، یـان خزمەتکارەکانـیان، یان ئەو پیاوانەی سەر بەوانن و هیچ نیازێکیان بە ژن نیە، یان ئـەو منداڵەی هیچ دەربارەی عەورەتی ژنان نازانن.. با پێیەکانیان بە زەویدا نەدەن تا بزانرێ کە خشڵی ڕازاندنەوەیان شاردوەتەوە.. ئەی بڕوادارینە! هەموو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بەڵکو ڕزگار بن.﴾نور/ ٣٠-٣١.

مـافی پـیاوە -هـەروەکو مافی ئافرەتیشە- کە لە هاوسەرەکەی دڵنیا بێت و، دوچـاری هەڵخەڵـەتاندن نـەبێ و هەسـت و سـۆزی بەلایـەکی دیکـەی دور لـە هاوسـەرەکەی بـبات، ئەمە ئەگەر ئەم لاڕێبون(انحراف) بەرەو خلیسکان و گوناهی نـەبات، کـە ئـەو پەیوەندیـیە پـیرۆزە دەخاتـە مەترسـییەوە و، دڵنـیایی تەواو و ئاسودەیی لە کەش و هەواکەی بەبا دەدات.

ئـەم لاڕێبونـە لـە هەسـت و سۆز و خلیسکان و بەرەو دورتر، هەموو ڕۆژێك و هـەموو چـرکەیەك لـەو کۆمەڵگایانـەدا ڕودەدەن، کـە تێکەڵاوی تیایدا کراوەیە و ئافـرەت تـیایدا بە ڕازاوەیی و بەرەڵایی دەردەچێت و، لەگەڵیدا شەیتانەکانی فیتنە و هەڵخەڵەتاندنـیش دەردەچن.. ئەو وڕێنە پوچانەش کە زمانی توتیئاساکانی ئێرە و زمـانی ڕێ لێونـبووەکانی ئـەوێ دەری دەبـڕن، گوایە تێکەڵاوی هەستەکان پاك دەکاتەوە و، وزە خەفەکراوەکانیش بەتاڵ دەکاتەوە و، هەردوو ڕەگەز فێری چۆنیەتی گفتوگۆ و پێکەوەژیان دەکات و، ئەزموونی پێدەبەخشێت، کە لە خزینە ناو گوناه دەیپارێزێت. هەڵبژاردنی دامەزراو و لەسەر ئەزموونی تەواو-بە توخمی هەڵەوەش-وا لە هاوسەر دەکات یەکدی بگرن، چونکە هەڵبژاردنەکەیان بە ڕەزامەندیی و دوای ئەزمون بووە.

دەڵـێم: ئەمـە وڕێـنەیەکە واقـیع دەیڕوخێنێت، واقیعی لاڕێ بوونی بەردەوام و گۆڕانی یەك لەدوای یەکی هەست و سۆزەکان و، تێکشاندنی ماڵەکان بە تەلاقدان و شتی دیکە و، بڵاوبوونەوەی ناپاکیی ژن و مێرد لەو کۆمەڵگایانەدا.

ئـەزموونی تـەواو ڕێگـا لـەوە ناگرێـت، کـە بـەهۆی تـێکەڵاوی ڕەهـاوە، کەسایەتییەکی بەهێزتر و تەواوتر و سەرنج ڕاکێشتر لە ژیانی مێرد، یاخود ژن سەر هەڵبدات. ئایـا لـەو کاتـەدا چـی ڕوودەدات؟ یـان ئەوەیـە کـە ژن یـان مـێرد دەخلیسـکێتە نـاو گوناهان و بەدەم ئەو ئارەزووە تازەیەوە دەچێت، یانیش بەرگری لـەخۆی دەکـات بـۆ پاراسـتنی ئـەوەی هەیـەتی، جـا دەکەوێـتە نـاو دڵەڕاوکێ و سەرسـامی و شـپرزەییەوە.. ئـەم دوو ڕێگایـەش هەردوکـیان بـەرەو ئاشـتی دڵ و ئاسـودەیی ڕۆح و، ئاسایشـی ماڵـەکان ناچـن.. ئەمـە جگەلـەوەی مـرۆڤایەتی دەکەوێـتە نـاو خـراپەکاری و، وەك ئـاژەڵ ڕەفـتار دەکـات و جڵـەوی حـەز و ئارەزوەکانیش بەرەڵا دەبێت!

بـەڵام ئەفسانەی پاکخویی و بەتاڵکردنی ئارەزو بەپاکی بەهۆی بەیەك گەیشتن و گفـتوگۆوە.. بـا لـەو بارەیەوە پرسیاری ڕێژەی کچە قوتابیە سك پڕەکانی قوتابخانە ئامادەیـیە ئەمریکیـیەکان بکـەن، کە لە یەك لە شارەکانیدا گەیشتوەتە ٤٨٪.[1] بـەڵام دەربـارەی ماڵـە بەخـتەوەرەکانی دوای هاوسـەرگرتنی تـێکەڵاوی ڕەهـا و ئـەزمونی تەواوەوە، با لەو بارەیەوە پرسیاری ڕێژەی ماڵە تێکشکاوەکانی ئەمریکا بکـەن بـەهۆی تەڵاقدانـەوە، کـە ئـەم ڕێژەیـە مـاوە دوای مـاوە لەگـەڵ زیادبونی تێکەڵاوی و ئەزمونەکاندا زیاد دەکات!

ئـەم ڕێـژە ترسناکە بەو هێڵانەدا دەڕوات، بەپێی سەرژمێرییەکی ئەمریکی، کە لە ساڵی ١٩٥٠دا دەرچووە:

| مێژوو | ڕێژەی سەدی |
|---|---|
| ساڵی ١٨٩٠ | ٪٦ |
| ساڵی ١٩٠٠ | ٪١٠ |
| ساڵی ١٩١٠ | ٪١٠ |
| ساڵی ١٩٢٠ | ٪١٤ |

[1] لـە سـەرژمێرییەکی شـاری (دنفـر)ی پایتەخـتی ویلایەتی (کولورادو) وەرگیراوە، وابزانم بە هەمان ڕێگادا دەڕۆین دوای ئەوەی ئەو ڕێگا نەفرەت لێکراوەمان بۆ خۆمان هەڵبژارد.

| | |
|---|---|
| ساڵی ١٩٣٠ | ١٤٪ |
| ساڵی ١٩٤٠ | ٢٠٪ |
| ساڵی ١٩٤٦ | ٣٠٪ |
| ساڵی ١٩٤٨ | ٤٠٪ |

زۆر ماڵی تێکشکاوی دیکەیش لەژێر چەپۆکی ئارەزووە سەرشێتەکان و حەزە هەمیشە گۆڕاوەکان و دڵەڕاوکێیە توندەکاندا، بەدوایدا دێن. کە گۆڕانی هەست و سۆزەکان دەیوروژێنێت، لە کۆمەڵگایەکی دروستکراودا، ئەو کۆمەڵگایەی کە شێوە رازاندنەوەی نوێی ئافرەت و پیاوی تازە پیشانی ژن و مێردەکان دەدات و، هەردولا بەدوای نێچیری تازەدا دەچن و، ماڵەکان لەبەردەم ڕەشەبادا دەهەژێن، هەرکاتێك ژن یان مێرد بریسکەیەکی درەوشاوەی لە کەسایەتیەکی تازەدا دیت، ئەوا وەك ئەوەی مێرد یان ژن کەلوپەلێکی ناو ماڵ یان بۆینباغ یان جلوبەرگێکی تازەی جیهانی مۆدیلات بێت!

کاتی ئەوە هاتوە کە مرۆڤایەتی چاوێك بەو بیردۆزە خەیاڵیە بەتاڵانەدا بگێڕێتەوە کە دەڵێت: تێکەڵاوی بەتاڵکردنێکی خاوێن و بەسۆزە، تاقیکردنەوە بەرەو هەڵبژاردنی دەبات، هەڵبژاردنیش ڕێگای ئاسودەییە.

ئەمانە چەند بیردۆزەیەکن پێدەچێ لەگەڵ ژیریدا بگونجێت، بەڵام ئەزمونی واقیعی، کە بە تایبەتی لە ئەمریکادا گەیشتوەتە ئەوپەڕی، بەسە بۆ ئەوەی گاڵتە بەو بیردۆزە رووکەشییە بریسکەدارە بکات! تێکەڵاوی نەبوە هۆی بەتاڵکردنی ئارەزوییەکی پاك، بەڵکو بوە هۆی ئاژەڵایەتیەکی تەواو، کە بەبێ سنور و پێوەند گوێڕایەڵیی حەزە لاشەییەکان دەکات.

ئەزمونی تەواو و تێکەڵاوی ڕەها، نەبوە هۆی یەکگرتویی ماڵەکان و، نەبوە هۆی ئاسودەیی و جێگیری، بەڵکو بوە هۆی لێك دابڕانی بەردەوام و، زیادبونی تەڵاق و برسیەتی و شێتی و هاری بەردەوام!

ئەزمونی ئەمریکی لەم بوارەدا بەدرۆخەرەوەی بیروڕاکانی فرۆید و هاوڕاکانیەتی. بەڕوی هەموو ئەوانەی دەیانەوێ بیبیستن هاوار دەکات، کە

تـێکەڵاوی بـەردەوام مایـەی هەڵچـوونی ئارەزوی بەردەوام دەبێت، جا یان دەگاتە ئەوپـەڕی مەبەسـتی و بـۆ ماوەیـەکی کـەم دەکوژێـتەوە، هـەتا ئـەو کاتـەی دادەگیرسـێتەوە، یـان ناگات بەم مەبەستە کرداریە ماددیە و، دەبێتە هۆی فشاری دەماری(الضغط العصبي) و ئەو نەخۆشییانەی، کە لێی دەکەوێتەوە.

بەتـەنها دڵسۆزیی زانستی بەسە بۆ چاوپێداخشاندنەوەی ئەو هەموو بیردۆزانەی لەژێـر ڕۆشـنایی ئەزمونـە ئەمریکـیە واقیعـیەکەدا، کـە شـاهێدی ئـەوە دەدات، هەڵـنەرە لاشـەییەکان ئـەوەندە بەهـێز و قوڵـن، بـەجۆرێك بەتاڵکردنی تێکەڵاوی نایکوژێنێـتەوە، هـەتا بەتاڵکـردنی تـام کردنیش نایکوژێنێتەوە، تۆ بە بۆنکردنی خواردنـی سـورەوەکراو برسـێتی گەدە ناشکێنیت، بەڵکو زیاتر تامەزرۆی دەکەیت! هـەروەها تـۆ بە خواردنی چەور و زۆر ئەم برسێتیە ناشکێنیت، مەگەر بۆ کاتێکی کـەم نەبێت، کە دوای بە ئاگاهاتنەوە زیاتر تامەزرۆ دەبێت و داوای خواردنی چەور دەکـات! برسیەتی جەستەش هەروەك برسیەتی گەدە وایە، هەردوکیان بەردەوامن.. توانـای خـوای دروسـتکار، ئـەو بەردەوامـیەی بۆیـان ویسـتوە، چونکە ئەرکێکی بەردەوامـیان پـێوە بـەندە لـە درێژەپـێدان و گەشـەپێدانی ژیـان.. ئـا ئـەمـە ئەو هاوارەیە، کە ئەزمونی ئەمریکی بەڕوی بیردۆزە و خەیاڵەکانیدا دەدات!

ئیسـلام هـەموو ئەمانەی ڕەچاو کردبوو، کاتێك ئاماژەی بە داپۆشین دەکرد و، ڕێگـری لـە تـێکەڵاوی دەکرد و، فەرمانی بە چاودانەواندن دەکرد و، بەدەرخستنی ڕازاوەیی ئافرەتی بۆ پیاوی بێگانە حەرام دەکرد. دەیویست ویژدانەکان جێگیر بن و گـیانەکان ئاسـودە بـن و ماڵـەکان هـێمن بـن.. ئیسـلام ئاشتیی بۆ ئەو هێلانەیە دەویسـت، کـە نـە هـی مـێردە و نـە هی ژنە، بەڵکو ئەوان دوو چاودێری جوجەڵە نەرمونۆڵـەکانن، سەرڕاسـتن لەسەر منداڵیە ساواکاندا، پاسەوانی ژیانێکی کراوەن، کە وەك پارێزەر وان.

## سنورەکان

ئیسلام حەزناکات خراپەکاری لە کۆمەڵگەدا بڵاو بێتەوە؛ ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيـعَ الْفَاحِشَـــةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: ئەوانەی حەزدەکەن خراپەکاری

لـەناو بڕواداران بڵاو بێتەوە، سزایەکی بەئێشیان بۆ هەیە﴾الـنور/١٩.، ﴿وَلاَ تَقْرَبُوا الــزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً: نـزیکی زینا مەکەون، ئەوە خراپەکارییەکە و خراپترین ڕێگایە.﴾الإسراء/٣٢.

بڵاوبونــەوەی خراپەکاری کاریگەرییەکی زۆر خراپی لە تێکشکاندنی بناغەکانی کۆمەڵگـەدا هەیـە، بـەڵام ئـەوەی لـێرەدا مەبەستمانە کاریگەرییەکەیەتی لەسەر ئاشتیی و هێمنی و ئاسایشی ناوماڵ و، مکوڕیی ئیسلام لەسەر ئەو ئاشتییە.

ئیسـلام بـە هۆیـەکانی خۆپاراسـتن دەسـت پێدەکات، هەروەك باسمان کرد؛ کە فـەرمان بـە خۆداپۆشـین دەکـات و دەرخستنی ڕازاوەیی ئافرەتان بۆ پیاوی بێگانە حـەرام دەکـات و، تـێکەڵاوی قەدەغە دەکات و، هەوڵ دەدات لەڕێگای ژنهێنان و شـووکردنەوە -لـە کـاتی توانیـندا- خۆپاراسـتن و داوێن پاکی ئاسان بکات، هەتا بانگەشـەی مسـوڵمان دەکـات بۆ یارمەتیدانی بە پارە بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت ژن بهێنێـت.. ئەگـەر نەیـتوانی ئەوا داوای لێدەکات، کە بەڕۆژوو بێت بۆ سوککردنی هەڵچـوونی ئـارەزو لـە جەستەدا: ((يَـا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنْ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّـهُ أَغَـضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَن لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ: ئەی گەنجیـنە، هەرکەسـێکتان لـە توانایدا هەبوو با ژن بهێنێت، ئەوە چاو دادەگرێت و دامـێن دەپارێزێـت.. ئەوەش کە پێی ناکرێت هاوسەر بگرێ، بەڕۆژوو بێت، چونکە ڕۆژوو لەگوناهان دەیپارێزێت)).[1]

هــەروەها ئیســلام وەرزش و سوارچـاکی خۆشەویسـت دەکـات، لەگـەڵ تێبینی کردنی ئەم مانایە لەگەڵ مەبەستەکانی دیکەی سوارچاکی.

بـێگومان پـەروەردەی ئیسلامیی هاوسەنگ و هاوڕێك، لەڕێگای حەرام کردنی دەرخسـتنی ڕازاوەیـی ئافـرەت بـۆ پـیاوی بـێگانە و، زیـادەڕۆیی لـە قسـە و، قەدەغەکـردنی تێکەڵ بوون بەبێ پێویستییەکی ناچاری، لەگەڵ ڕاگرتنی جەستە بە وەرزش و ڕۆژوو و، زوو ژنهێـنان و شـووکردن بەپـێی توانـا.. شـوێنەکانی ئـارەزو

---

[1] البخاري

ورووژانـدن و هۆیـەکانی فیتـنـە دوورده‌خاتـەوە.. بـێگومان هـەموو ئەمانە هۆکاری ئیجابین لە گرتنی نەفس و جەستە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو.

توتی ئاساکانی ئێرە و سەرلێشێواوەکانی ئەوێش دەڵێن: ئەو نەفس گرتنە بەرەو (گـرێی دەرونـی)ی دەبـات، ئەمـە لەبەر ئەوەیە، کە ئەوان تەنها ئەو وێنە پیس و بۆگەنـەیان بـۆ کۆمەڵگە لەبەرچاوە، وێنەی ئەو گەنجە هاروهاجانەی لەگەڵ کچانی بـەرەڵادا دەسـوڕێنەوە.. وێـنـەی ڕان و مەمکـە ڕوتـە دەڕیـەڕیوەکان. وێـنـەی تەماشـاکردنە ئاشکراکانی چاو و ئارەزووە ڕژاوەکانی لێو. هەڵنەری هەموو ئەمانە و خۆشـکەری ئاگـرەکەی بریتیـیە لـە دیمەنەکانی فیلمە بەرەڵاییەکان و، وێنەی ناو ڕۆژنامـە تاوانـبارەکان و، دەنگـی پیاوە خۆ بە ئافرەت چوێنەکان و ئافرەتە خۆ بە پـیاو چـوێنەکان لـە ئـێزگەکاندا. سەرەڕای ڕێنماییە پیسەکانی هەموو دەزگاکانی ئاڕاستە و ڕاگەیاندنی گشتی، لەپشت هەموو ئەمانەشەوە ڕابواردن و دەست بەتاڵی لەلایەك و، داهێزران و هەڵوەشانەوە لەلایەکی دیکە. بە دەوری هەموو ئەمانەشدا، بازرگانەکانی شەرەف و ناموس و نێرەموکە گەوادەکان هەیە!

... کۆمەڵگایـەکی بـەم شـێوەیە، نـەفس گرتـنی تێدا سەختە، چونکە هەموو هۆکارەکـانی فیتـنـە تـیایدا هەڵچـوو و گەرم و هار و بەرەڵایە. کۆمەڵگایەکی بەم شـێوەیە، ئاسـودەیی دەرونـی تـیادا دەسـت ناکەوێت و، ئاشتی لە ماڵەکان بەدی ناکرێـت. بـەڵام کۆمــەڵگای ئیسـلامی هــەر لــە بـنـەڕەتەوە پێچـەوانەی هــەموو ئەمانەیــە. کۆمەڵگایەکـە دژایــەتی تــێکەڵاوی و بــەرەڵایی دەکــات، دژایــەتی خۆچـواندنی ژن و پـیاو بەیـەکدیی دەکـات، دەزگاکـانی ئاراستەکردن و ڕاگەیاندن تـیایدا خەریکی ئاڕاستەکردنی خەڵکە بۆ چاکە و ڕەوشت بەرزی و، دەست و داوێن پـاکی و، خۆپارێـزی لـەخوا و چاودێری کردنی، هەروەها تەنها بەندەی خوا بن! کە ئـەوەش لـەدوای هـەموو ئەمانـە بۆشـاییەکانی ژیـان پـڕ دەکاتـەوە بـە خـەمی گەورەگـەورە لە پێناوی خوا و لە پێناوی مرۆڤایەتی.. بۆشایی کاتیش بە کارکردن پڕ دەکاتەوە، جا ئەو ئافرەت و پیاوانەی تیا بەدی ناکرێت، کە هیچیان نیە ژیانیان پـێ پـڕ بکەنەوە و، تواناکانیان تیایدا بەکار بخەن، تەنها حەز و ئارەزوەکان نەبێت،

تــەنها رابواردنێکی خراپەکاری و بەرەڵایی نەبێت لە ئاهەنگ و گەشت و سەربازگە تێکەڵاوەکان و، سەرقاڵ کردنی ئەو گەشتیارانەی خوازیاری حەز و ڕابواردنن.!

ئیسـلام لێ ناگەڕێـت پەرداخــە ئــارەق ببێــتە هــۆی هەڵچــوونی خوێــن لــە دەمارەکــاندا، لێناگەڕێـت مــەمك و لــێوی تینو و سەرنجی بەدڕەوشتانەی ئافرەتە ڕوتەکان بانگی پیاو بکەن و، پاشان داوا لە پیاوان بکرێت حەزەکانی خۆیان بگرن و ئارەزویــان خەفەبکەن!.. نەخێر، ئیسلام کارەکە لە هەموو لایەکەوە وەردەگرێت و، هــەر لــە هــەنگاوی یەکەمــەوە ڕێگــا لە هۆکارەکانی فیتنەدەگرێت، پاشان خەڵك بەقەد توانای خۆیان ئەرکبار دەکات، بەبێ سەختی و زۆرلێکردن.

ئەگــەر دوای ئــەوە خراپەکاری ڕویدا، ئەو لەپێناو ئاشتیی ناوماڵ و یەکگرتویی کۆمەڵگە، کارەکە بەوە چارەسەر دەکات، کە سزای وا لەسەر ژن و پیاوی خراپەکار دابنێـت، کە جارێکی دیکە نەگەڕێنەوە سەری: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلاَ تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِــرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، الزَّانِي لاَ يَنكِحُ إِلاَّ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِــيَةُ لاَ يَــنكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْــرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ: ئەگەر ئێوە بــڕواتان بە ڕۆژی قیامەت هەیە، داوێن پیسانی نێر و مێ-هەریەکەیان- بە لێدانی ســەد تازیانــە تەمێ کەن. لە ئایینی سەر بە خودا، بەزەیی هاتن بێجێیە. با چەند کەســێکیش لــە بڕواداران لەو لێدانە ئاگادار بن.. نێری داوێن پیس هەر دەبێ ژنی داوێــن تــەڕ بخوازێ، یان ژنی بتپەرستێ بێ. ژنی داوێن تەڕیش هەروا یان مێرد بە داوێن پیس بکا، یان بە بتپەرست، لەبۆ بڕواداران ئەم کارە بەربەست کراوە.﴾النور/ ٢-٣.

پێغەمبەریــیش ﷺ ژنــی مــێرددار و پــیاوی ژنــداری بەردباران کردوە، نەك بە جەڵدە لێدان، جێنشینەکانیشی لەدوای ئەو هەمان سزایان داوە.

جــا گوێــت لــە توتی ئاساکانی ئێرە و سەرگەردانەکانی ئەوێ دەبێت، کە دەڵێن ئەمــە ســزایەکی توندوتــیژە. بــەڵام تــێکدنی مالــەکان و، ڕاڕایــی ویژدانــەکان و، گومانــاوی گزیکــردنی کــردنی ڕەچــەڵەکەکان توندوتیژ نیە.. ئەم سزایە توندوتیژە،

چـونکە ئـەو ژن و پـیاوانەی لەو خۆشییەدا دەژین و کاریان ئەو خراپەکاریەیە، کە ئەوانن بە توندوتیژ وەسفی دەکەن، هەست بەو قامچیانە دەکەن کە بەر پێستە نەرم و شلەکەیان دەکەوێت، هەست بەو بەردانە دەکەن کە بەر لاشە نەرم و بێبەهاکەیان دەکەوێـت. ئـەوان بەرگری لە خۆیان دەکەن و بە ناوی یاسا هاوچەرخەکانەوە زمان درێـژی دەکـەن و، سـنورەکانی ئیسـلام بە توندوتیژی و وەحشیەت وەسف دەکەن، کەچی خۆیان وەحشین و بەرەو ژیانی ئاژەڵی یەکەم دەگەڕێنەوە.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئیسـلام ئـەم سـزا چاوشـکێنە جێـبەجێ ناکات، مەگەر لەو حاڵەتانـەی دڵنـیابوونی ڕەهـای تێدابێـت بەبێ هیچ گومانێك، هەروا لەو بارانەی ژنـدار یـان مـێرددار بێـت، کـە هەموو پێویستییەکی ناچارکەری نامێنێت، بەڵام ئەوانـەی کـە ژنـدار یـان مـێرددار نـین سـزاکەیان سـوکترە و لە لێدان بە قامچی تێناپەڕێت.

پێغەمـبەریشﷺ فەرمویـەتی: ((إدرأوا الحدود بالشبهات: بە گومان خۆتان لە سـنورەکان-حەددەکان- لابدەن))[1] لەبەر ئەوەی ئەو تاوانەی گومانی لەسەر بێت، ئـەو تاوانـە نـیە، کـە ڕون و ئاشـکرا و گەورە بێت و هانی خراپەکاری بدات، ئەو تاوانـە شـایانترە بە سۆزنواندن و سوککردنەوە، لە تەمبێکردنیشدا ئەوەندە بەسە، کـە ئـەو تاوانـبارەی تاوانەکـەی ئاشـکرا ناکـات، پێویسـتە شاهێد هەبن-کە لە حاڵـەتی زیـنادا چوارکەسـن-، هەمووشـیان دڵنـیا بـن لە ڕودانی تاوانەکە و هیچ یەکێکـیان گومانـیان نەبێت و، گومان لە ڕاستگۆییان نەبێت، ئەگینا نە بەردباران دەکرێت و نە دارکاری.

ئەگـەر بـزانین کـە سـیخوڕی و ئـاودیوبون بەسەر دەرگا و هەڵکوتانە ناو ماڵە تایبەتیـیەکان قەدەغەیـە، ئـەوە دەزانـین کـە گرتـنی ئەم تاوانە و بینینی لەلایەن شـاهێدەکانەوە بـەو مەرجانەی ئیسلام بۆ جێبەجێکردنی سنورەکان دیاری کردوە، زۆرجـار رونـادات، مەگـەر لەو حاڵەتانەی زۆر بە ئاشکرا و بێئابڕوانە و لە شوێنە گشـتییەکاندا و بەفـیزەوە تاوانەکـەی ئاشـکرا بکـات. ئەمانـەش بڵاوکـردنەوەی

[1] في مسند ابي حنيفة الحارثي.

خـراپەکاری و سوکایەتی‌کردنە بە شەرەف و ناموس، لەگەڵ ئەمانەدا سزادان لەلای فیترەت ڕاستەکان و سروشت ساغەکان بە توندوتیژی ناونابرێت.

بـۆ ڕێگەگـرتن لـە بڵاوبوونـەوەی تاوانـبارکردن بە هەق و ناهەق، لە ئیسلامدا هەرکەسـێك تاوانـێك بـۆ ئافـرەتی مـێرددار یـان پیاوی ژندار هەڵبەستێت و چوار شـاهێد نەهێنێت، ئەوا دارکاری دەکرێت و چی‌دیکە باوەڕی پێ‌ناکرێت و شاهێدیی لێ وەرناگیرێت:

﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلاَ تَقْــبَلُوا لَهُـــمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُم الْفَاسِقُونَ، إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْــلَحُوا فَــإِنَّ اللَّـــهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ: ئەو کەسانەش کە بوختان بۆ ژنی داوێن پاك دەکـەن، چـوار شـایەتیش ناهێـنن، هەشـتا شـەلاقیان لێ‌بـدەن. هەرگـیز نابێ بە شـایەتیان قبوڵ بکەن، ئەوانەن کە لەڕێی خودا لایان داوە. مەگین ئەوانەی پاش ئەم کارە پەشیمانی دەردەبڕن و ئاکاری خۆیان چاك دەکەن، دیاریشە کە خودا لێبوردەی دلۆڤانە. ﴾النور،٤-٥.

ئەمـەش بـو ئەوەیە تاکو بوختان کردن و، دڵەڕاوکێ لە دەرون و ماڵەکاندا بڵاو نەبێـتەوە و، قسەوقسـەڵۆکی خـراپ لـەناو کۆمەڵگە بڵاو نەبێتەوە، کە بەهۆیەوە متمانە نامێنێت و ترس و گومان جێی دەگرێتەوە:

﴿لاَ يُحِـــبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِن الْقَوْلِ إِلاَّ مَنْ ظُلِمَ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا: خـودا پـێی خـۆش نـیە هـیچ کەس بە دەنگی بەرز قسەی ناحەز بدرکێنێ، مەگین غەدری لێکرابێ. خودا بیسەر و زانایە. ﴾النساء/١٤٨.

ئەگـەر تاوانـبارکردن لەسـەر زمانی مێردەوە ژن تاوانبارکرا و، شاهێدی نەبوو، ئـەوا ئیسـلام ڕەچاوی باری ماڵەکان و نەبونی شاهێد دەکات و، لە سزا دەیبورێت، ئەگـەر چـوار شـاهێدی بـە خـودا بـدات، کـە لە ڕاستگۆیانە و، شاهێدی پێنجەم نەفـرەتی خوای لێ‌بێت، ئەگەر لە درۆزنان بێت. ژنەکەش لە سزا دەپارێزێت بەوەی، کـە چـوارجار شـاهێدی بەخودا بدات، کە پیاوەکەی درۆزنە، شاهێدی پێنجەمیش بـەوەی، کـە غـەزەبی خـوای لەسـەر بـێ، ئەگـەر پیاوەکەی ڕاستگۆ بێت، جا بەم

(نەفرەت لێکردنە) لێکدی جودا دەکرێنەوە، چونکە ژیان دوای ئەمە ڕاست نابێتەوە.

﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَات بِاللَّه إِنَّهُ لَمِن الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّه عَلَيْه إِنْ كَانَ مِن الْكَاذِبِينَ، وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَات بِاللَّه إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّه عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِن الصَّادِقِينَ: ئەو کەسانەش کە بوختانی داوێن تەڕی بە ژنانی خۆیان دەکەن و غەیری خۆیان چەند شایەتی دیکەیان نیە، هەرکامێکیان دەبێ چوارجار خودای لێ بە شایەت بگرێ کە لەم بارە درۆ ناکا، با بۆ جاری پێنجەم بڵێ: ئەگەر ئەم قسەیەم درۆیە بەر نەفرینی خوا کەوم.. ژنەکەش لە ئازاردان رزگاری دەبێ، کە ئەویش هەتا چوار کەڕەت خوا بە شایەت بێنێتەوە کە مێردەکەی درۆ دەکا، بۆ جاری پێنجەمیش بڵێ: ئەگەر قسەی کابرا راست بێ بەر غەزەبی خودا کەوم.﴾النور/٦-٩.

## تەڵاق

تەڵاق؟ تەڵاق دەرگای ئاشتیی ئەم شانەیە. بێزراوترین حەڵاڵە لەلای خودا، ناپەسەندە بەڵام پێویستی ڕێگای پێ دەدات، بۆ جێبەجێکردنی ئاشتی ڕاستەقینە لە کەشی ناومالّدا، ئەمە لە کاتێکدا، کە ئاشتی لە هەموو ڕێگاکانی دیکە مەحاڵ دەبێت. ئەمە دان پێدانانێکە بەو ڕاستییەی، کە نکوڵی لێکردنی زمان لوسەکان دادی نادات و، خەونی شاعیرەکان لەناوی نابات.. هەندێك حاڵەتی واقیعی هەیە، کە ژیانی ژن و مێردایەتی تیایدا مەحاڵە، جا بە زۆر پێکەوە بەستنی ژن و مێرد بەو پەیوەندەیە ئەنجامی باشی نابێت و، کۆتاییەکەی بە ئاشتی نایەت.

ئیسلام پەلە ناکات لە پچڕاندنی پەیوەندیی پیرۆزی ژن و مێردایەتی، هەر لەگەڵ یەکەم جار و لە یەکەم دەرکەوتنی ناکۆکی بڕیاری پچڕانی لەسەر نادات. ئیسلام ئەو پەیوەندیە توند دەکات و تا ئەوپەڕی توانا دەستی پێوە دەگرێت، بواری لەدەست دەرچوونی نادات مەگەر پاش هەوڵدان و بێئومێد بون و مەحاڵ بون.

ئیسلام بە پیاوان دەڵێت: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا: بە تەرزێکی جوان و ڕەوا لەگەڵیاندا بجولێنەوە، ئەگەر خۆشتان نەهات لێیان، شتی وا هەن ئێوە حەزی لێ نەکەن و چاکەی زۆری لە خوداوە بۆ ئێوە تێدابێ.﴾النساء/١٩.

وایان لێدەکات هەتا لە کاتی ڕك لێبوونەوەشدا چاوەڕوان بن و ئارام بگرن، ئەو پەنجەرە نەزانراوەیان بۆ دەکاتەوە: ﴿فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا: شتی وا هەن ئێوە حەزی لێ نەکەن و چاکەی زۆری لە خوداوە بۆ ئێوە تێدابێ﴾النساء/١٩.

ئەوان چوزانن ئەو ئافرەتانەی ڕکیان لێیانە چاکتر نین، خودا ئەو چاکەیەیان بۆ هەڵدەگرێت و ناشێت لەدەست خۆیانی بدەن، ئەگەر واش نەبوو پێویستە دەستی پێوە بگرن و ڕێزی لێ بگرن!

هیچ لەم دەربڕینە جوانتر نیە بۆ بەشەرمدا هێنان و وروژاندنی ویژدان و، دەستەمۆکردن و خامۆشکردنی ڕك لێبونەوە.

ئەگەر کارەکە لە مەسەلەی ڕك لێبونەوە و خۆشەویستی، سنوربەزی کرد بۆ یاخیبون و لێك دوورکەوتنەوە، تەڵاق یەکەم بیرو ئەندێشە نیە، کە ئیسلام ئاماژەی پێ بکات، بەڵکو پێویستە کەسانی دیکە هەوڵیان لەگەڵدا بدەن و چاکەخوازان هەولی گونجاندنیان بدەن: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا: ئەگەر ترسان کە ژن و مێرد دوودڵن و پێکەوە هەڵناکەن، کەیخودانێك لە کەسوکاری پیاوەکە و کەس وکاری ژنەکە با بینە ناوبژیکەر، هەرکاتێ هەردوولا ڕازی بوون پێك بێنەوە، خودا پێکیان دێنێتەوە، خودا زانا و ئاگادارە.﴾النساء/٣٥.

ئەگەر ئەم هەولانە سودی نەبوو، کەواتە کارەکە بەوپەڕی ڕاستییە و، شتێك هەیە کە بەهۆیەوە ژیانەکە ڕاست نابێتەوە و، ئارام ناگرێت. زۆرکردن لە ژن و مێرد بۆ مانەوە لەسەر ئەو بارە، هەوڵێکی شکست داره و، فشاریش زیاتر شکستیی پێ دەدات.. جا حیکمەت ئەوەیە کە خۆ بدرێتە دەست واقیع و، کۆتایی

بـەو ژیانـە بهێنرێت، ئەگەرچی ئیسلام پێی پەسند نیە، چونکە ناپەسندترین حەڵاڵ لای خـودا تەڵاقـە. ڕەنگـە ئـەم جودابونەوەیە حەزێکی تازە لە دەروونی هەردوولا بوروژێنێـت بۆ دەستپێکردنەوەی ژیان، زۆرجار پاش لە دەستدانی شتێك هەست بە گرنگیـیەکەی دەکـەین، کاتـێك لـێی بێبـەش دەبـین، ئـنجا هەست بە چاکەکانی دەکـەین.. هەڵـیش لەدەست نەچووە: ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَـــانٍ: تـەڵاقی ژن دوو کەرەتـە، ئەوسا یان ڕاگرتنێ باش و خودا پەسند، یان بەخۆشی و بێ هەرا دەست لێك بەردانە.﴾البقرة/٢٢٩.

جـا تـەڵاق لـەکاتی بێـنوێژیدا ناکەوێـت، بـەڵکو لـەو پاکـیەدا دەکەوێت، کە جوتـبونی تـێدا نەکرابێـت.. ئیسلام ئەم ماوەیە درێژ دەکاتەوە، بەڵکو توڕەبونەکە هێوربێـتەوە، ئەگـەر ئـەوە هـۆی تەڵاقدانەکە بێت.. پاشان لەدوای یەکەمین تەڵاق مـاوەی (عـیددە) هەیە بۆ ئەو ژنانەی مێردەکانیان لەگەڵیان جوتبوون، کە ماوەکە نـزیکەی سـێ مانگـە ئەگـەر سـکی نـەبوو، ئەگـەر سکیشـی هـەبوو، هـەتا منداڵـبونەکەیە و، لەسـەر مـێردەکەیە لەو ماوەیەدا خەرجیی بکێشێت و ڕەزیلیی لێ نـەکات.. لـەو ماوەیەشدا بۆی هەیە ئەگەر پەشیمان بوەوە بیگێڕێتەوە و، بەبێ هـیچ مارەبڕینـێکی دیکـە لەسـەر ژیـانی خۆیـان بـەردەوام بـن.. ئـەوە (تەڵاقی ڕەجعی)یە و، ژیانی هاوسەرایەتی بۆی هەیە بە کەمترین هۆ بەردەوام بێت.

ئەگەر ماوەی (عیددە)کە بەبێ گێڕانەوەی ژنەکە تێپەڕی، ئەوا تەڵاقەکە دەبێتە (بـائن)، بـەڵام هێشـتا هەلەکـە لەدەسـت نەچـوە، هـەرکاتێ ویسـتیان دەتوانـن بەردەوامی بە ژیانی خۆیان بدەن، بەڵام بە مارەبڕینێکی تازە.

ئـەوە یەکـەمین تاقـیکردنەوەیە، کە بەهۆیەوە حەقیقەتی هەست و سۆزی ژن و مـێرد ئاشـکرا دەبێـت، ڕاسـتیەتیی ئەو هۆیانەیان بۆ دەردەکەوێت، کە بە هۆیەوە لـێك جـیابونەوە. ئەگـەر ئـەو هۆیانـە دوبـارە بونەوە یان هی دیکە پەیدا بون و، جـارێکی دیکـە مـێرد پـەنای بـردەوە بـەر تـەڵاق، لـەو کاتـەدا تەنها یەك هەلی دەمێنێـت، ئـەوەش سـێیەمە.. لـە دووەمیشـدا ئاگادارکردنەوەیە، ئەگەر زانیان

دەتوانن جارێکی دیکە پێکەوە بژین، هەروا ئەگەر بۆیان ئاشکرابوو کەمێك لە سۆز یان خۆشەویستی لەنێوانیان ماوە، ئەوا دەتوانن ژیانەکەیان دەست پێبکەنەوە.

بەڵام ئەگەر تەڵاقی سێیەم بوو، کەواتە هۆیەکە زۆر قوڵە و، هەوڵدان بێسودە، بۆ هەردووکیان وا چاکترە هەریەکەیان ڕێگای خۆی تاقی بکاتەوە، هەروەها بۆ مێردیش -ئەگەر سەرەڕۆ، یان هەڵەشە بوو- چاکترە تا ئەنجامی سەرەڕۆیی یان هەڵەشەیی خۆی وەرگرێت: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ: ئەگەر لەپاش ئەم دووجارەش تەڵاقی دا، ژنەکەی بۆ حەڵاڵ نیە تا ژنەکە دەچێ مێردێکی دیکە دەکا.﴾البقرة/٢٣٠.

نەك بەرێگەی مارەبەجاش(المحلل) کە ئێستا بڵاوە و، ئیسلام دانی پێدا نانێت و شەریعەتەکەی بڕیاری لەسەر نادات. بەڵکو دەبێ ژنەکە مێردێکی ڕاستەقینەی تازە بکاتەوە بە نیازی هەتاهەتایی نەك بۆ کاتێکی دیاریکراو، جا ئەگەر بەهۆی شتێکەوە مێردە تازەکەی تەڵاقی دا، یان مرد، ئەوا مێردەکەی یەکەمی بۆی هەیە سەرلەنوێ مارەی کاتەوە و گەشتی ژیانیان پێکەوە دەست پێبکەنەوە.

ئاشێت لەم بوارەدا ئەو ڕاسپاردانەی ئیسلام لە هەموو هەنگاوێکدا و، لە هەموو قۆناغێکدا لەیاد بکەیت سەبارەت بە ڕەفتاری چاك و دابینکردنی بژێوی لە ماوەی (عیددە)دا، بۆ لێکنزیك کردنەوەی دڵە لێك دوورکەوتوەکان، کە لەوانەیە سۆز و خۆشەویستی بۆی بگەڕێتەوە و جەستەی ناچار بکات و سەرلەنوێ ژیانێکی بێگەرد دەست پێبکەنەوە: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُم النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوف أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوف وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِتَعْتَدُوا وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ: ئەگەر ژنتان تەڵاق دا وماوەی چاوەڕوانیەکەی بڕایەوە، یان بە تەرزێ خوداپەسند ڕایانگرن، یان بەرامبەر بە یاسای دین ئازادیان کەن، نەکا بە مەبەستی ئازاردانیان ڕایانگرن و لە هەق لادەن، هەرکەسێ وا ڕەفتار بکا، ناهەقیی لەخۆی کردووە.﴾البقرة/٢٣١.

﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُم النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ

وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لاَ تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا، فَإِذَا بَلَغْـنَ أَجَلَهُـنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِـنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَنْ يَـتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا، وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَحْتَسِبُ: ئـەی پێغەمبەر! ئەگەر ژنـتان تـەڵاق دان، ماوەیەکیان بۆ دیاری بکەن و بیبژێرن، لەخودای پەروەردگارتان شـەرم بکـەن. لـە مـاڵ خۆیـان دەریـان مەکـەن؛ دەریش نەچن. جا مەگین هەر بە ئاشـکرا کـارێکی شـورەیی بکـەن. ئەمە سنوری خودایە، هەرکێ لە سنوری خودا بەولاوەتـر چـێ، ناهـەقی لـەخۆی کـردووە، تۆ چوزانی، لەوانەیە لەپاش ئەمە خوا شـتێ دیکـە وەدی بێـنێ.. سـا هـەرکاتێ ماوەکـەی خۆیان بەسەر برد، ئەوسا بە تـەرزێکی پەسـند ڕایانگـرن یـان لێـیان جیا ببنەوە؛ بە شێوەیێ کە لەناو خۆتاندا بـاوە. دووکەسـی ڕاسـت و دروسـتیش هـەر لە خۆتان لەم کارە ئاگادار بکەن، کە شـایەتی بـۆ خـوا بـدەن، هـەرکێ بـڕوای بـە خـوا و ڕۆژی قـیامەت هەیە، بەمە ئامۆژگـاری دەکـرێن، هەرکـێش لـە خـودا بترسـێ، دەرووێکـی لێ دەکاتـەوە، لە شوێنێکەوە بژێوی بۆ دەنێرێ کە بە خەیاڵیدا نایە.﴾الطلاق/١-٣.

هـەروەها نابێـت ئەوەش لەیاد بکەین، کە ئافرەت بۆی هەیە بە مەرج دابنێت، کـە تەڵاق لەدەست خۆی بێت، جا لەو بوارەدا هەموو مافێکی پیاوی هەیە لەکاتی پێویستدا.

ئـا ئەمەیـە تـەڵاق لـە ئیسـلامدا.. زمانـەی دڵنیاییە ناکرێتەوە، مەگەر هیچ بوارێکـی نەکـراوەنەی نەبێـت، هەوڵدان دوای هەوڵدان بۆ پارێزگاری و چاکسازی و چاوپێداخشـاندنەوە، هـەل لـە دوای هـەل ڕاسـتیی هەسـت و سۆزی ژن و مێرد بۆ یـەکدیی ئاشـکرا دەکـات، هـەروا هەڵەکانیان لە ڕەفتار کردن، یان هەڵەکانیان لە حساب بۆکردن، یان هەڵەکانیان لە هەست و سۆزیان بۆ ئاشکرا دەکات.

ئـەی ئـەو سەرشـێتە نەفامانە بۆچی خویان داوەتە ئەوەی ڕەخنە لەم سیستەمە بگـرن، یان عەیبداری بکەن یان بیشێوێنن؟ دەڵێن: سیستەمێکە لێدەگەڕێ ئافرەت هـەردەم لەبـەردەم هەڕەشەی وشەیەکدا بێت، کە لە دەمی پیاوەوە دەردەچێت! ئایا

لـە حەقیقەتە ئیسلامییەکەیدا ئاوایە؟ یان بە دەرچوونی دڵەکان لە بازنەی ئیسلام، بـە دەرچـوونی کۆمەڵگـە لـە سیسـتەمی ئیسـلام، بە دەرچوونی فەرمانڕەوایی لە دەستی ئیسلام وای لێهات؟

ناپەسـندترین حـەڵاڵ لای خـوا تەڵاقە، ناپەسەند(مکروه)ێکە پێویستیی ڕێگای پـێ دەدا. ئەگـەر دڵەکان گەندەڵ و، ڕەوشتەکان داڕمان و، پەیوەندیەکان سوك بون و، بێـنابڕویی بڵاوبـوەوە، کەواتـە کۆمـەڵگای گـەندەڵ خـۆی بەرپرسـە، نەك ئەو سیسـتەمە ڕۆشـنبینە دانایـە. چارەسـەریش بـە سنورداركردنی ڕێپێدراو(مباح) و حـەرام کـردنی حـەڵاڵ نابێـت، بـەڵکو بـە گێڕانەوەی فەرمانڕەوایی و ڕێکخستن و پـەروەردە بـۆ ئیسـلام دەبێـت، ئـەو کاتـە ئیسـلام هـەموو کۆمەڵگـە بەپـێی ڕێنمونیـیەکانی خـۆی دادەڕێژێـت.. یاساکانی ئیسلام بۆ کۆمەڵگایەك دانراوە، کە ئیسـلام فەرمانـڕەوایی دەکـات، بـۆ سیستەمێك کە لەسەر ئیسلام دامەزراوە، بۆ ویژدانێك، کە ئیسلام پەروەردەی کردووە.

لـێگەڕێن بـا ئیسـلام فەرمانـڕەوایی بکـات، دەرونـەکان پـەروەردە بکـات، ویژدانـەکان وریـا بکاتـەوە و، لـە دەسـتی سـەرەڕۆ و بێـنابڕوان بـدات و، هەموو ویستەکانی ئیسلام بەدی بێنێت و لە نێویاندا یاساکانی ئیسلامە.

ئەگـەر وام دانا تەڵاق لە کۆمەڵگەیەکی وەك کۆمەڵگەی سەرگەردان و نەخۆشی ئـێمە سـنوردار کـرا. ئافـرەت چی لە خۆی و کەرامەتەکەی دەکات؟ ئایا دەیەوێت پـیاو لە دڵەوە بیدرکێنێت و یاساش پێوەی بلکێنێت؟! ئایا دەیەوێ پیاوەکە هەوڵی تـەڵاق دانـی بـدات و بـەردەوام بێـت لەسـەر هەوڵدانی و ئەمیش بە زۆر لە ماڵدا بمێنێـتەوە؟! ئەوە چ کەرامەتێکە ئەو ئافرەتە دەست بەتاڵە سەرەڕۆیانە بۆ ژنی داوا دەکـەن، خـودا ویسـتی کەرامەتـیان هەبێـت، ئەوانـیش ڕەتـیان کـردەوە و بـە سەرلێشێواوی و سوکی دەربەڕین؟!

هاوسـەرایەتی پەیوەندیـەکی پـیرۆزە، تـەنها لەسـەر ڕەزامەندی و قەبوڵ کردن بنـیات دەنرێـت، تـەنها بـە ڕەزامەندی و قەبوڵ کردن بەردەوام دەبێت. سیستەمی تـەڵاق، مانەوەکـەی لەسـەر بنەما چاکەکانی دابین دەکات، جائەگەر دوای هەموو

ئەمە ئەڵقەکانی لێکترازان، ئەوا ترازانیش ئەوە دەگەیەنێت، کە بۆ مانەوە ناشێت، ئەو کاتە بۆ هەردووکیان واچاکترە و بەڕێزترە، کە پەنا بەرنە بەر ژیانێکی دیکەی نوێ: ﴿وَإِنْ يَتَفَرَّقَا يُغْنِ اللَّهُ كُلاً مِنْ سَعَتِهِ وَكَانَ اللَّهُ وَاسِعًا حَكِيمًا: خۆ ئەگەر هەر بە یەکجاریش دەست لێك بەربدەن، خودا فراوانی لەلایە و هەردووکیان بێنیاز دەکا، بەزەیی خودا فراوانە و هەرخۆشی لەکارزانە.﴾ النساء/١٣٠.

## فرەژنی

ڕێگەدان بە فرەژنی(تعدد الزوجات)، پێویستییەکی دیکەیە لە بواری خۆیدا ئەرکی زمانەی دڵنیایی دەبینێت، وەکو پێویستیی تەڵاق لە کاتی ناچاریدا.. ئەمە لە ئیسلامدا پارێزەرێکی پەتیی کۆمەڵگایە، بەهۆیەوە لە هەڵەی گەورەتر دەپارێزێت لە میزاجی تاکەکان و، ویستەکانی ژن و مێردەکان.

شوێنی باسکردنی ئەم مژڵەتە لە بەشی باسکردنی (ئاشتی کۆمەڵگا)دا بوو، چونکە پێوەی بەستراوە و تێی ئاخنراوە، بەڵام لە بەشی (ئاشتیی ناومال)یش نامۆ نیە -کە ئێستا ئێمە تیایداین-، چونکە لە ڕاستیدا، لە دیدی ئیسلامدا بۆ ژیان، تاك و ماڵ و کۆمەڵگا و مرۆڤایەتی هەمووی تێك هەڵکێشراون و هاوکار و هاوڕێکی یەکدین.

زۆربڵێی و قسەڵۆکی دووروودرێژ و فراوان دەربارەی چیرۆکی فرەژنی لە ئیسلامدا بڵاو دەبێتەوە، جا ئایا بە ڕاستی ئەوە دەردێکی ترسناکە لە ژیانی کۆمەڵدا؟ ئایا بۆی هەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە دەردێکی ترسناك؟ ئایا پێوست دەکات یاسایەك هەبێت دژایەتی، یان سنورداری ئەو مژڵەتە بکات، کە ئیسلام هێناویەتی؟

من سەرنج دەدەم و دەبینم، کە هەموو گرفتێکی کۆمەڵایەتی پێویستی بە یاسایەك هەبێت بۆ هەموار کردن و سنوردارکردنی، تەنها پرسی فرەژنی نەبێت، کە خۆی چارەسەری خۆی دەکات، کۆمەڵگا لە هەرکوێیەکدا بێت، هەر پێویستی پێی هەیە و، ڕەوش و پێویستیەکانی ڕێگای پێ دەدەن.

ئەمە پرسێکە ژمارەکان بڕیاری لەسەر دەدەن و، تیۆر و یاساکان بڕیاری لەسەر نادەن، نازانم چۆن دروستە زمانی تێ وەربدرێ، چۆن بوە بە بوارێکی بێنەوبەردە و

گفتوگۆ. مەگەر ئامانجی شاراوەی پشت ئەم کاوێژکردنەی سەر زار و رۆژنامەکان و دەزگاکانی رێنمونی و راگەیاندنی دیکەدا، توانج گرتن و سوککردنی ئەم ئایینە بێت لە پۆخڵەواتێکی مەبەستدار، وەك پاساوێك بۆ دوورەپەرێزکردنی لە سیستەمی ژیان. هەروا بۆ دانانی سیستەمی دیکەی خراپ لە جێگایدا، بە چەندین رێگای خواروخێچ، کە ئەوەندە ئازایەتیەیان تێدا نیە بێباوەڕی و خوانەناسیی خۆیان ئاشکرا بکەن، هەروەك (مستەفا کەمال) لەپێشتر رایگەیاند!

لە هەموو نەتەوەیەکدا ئافرەت و پیاو هەیە. هەر کاتێك ژمارەی ئەو پیاوانەی گونجاون بۆ ژنهێنان و بۆی ئامادەن و دەیانەوێت هاوسەر بگرن، یەکسان بوو بە ژمارەی ئەو ئافرەتانەی گونجاون بۆ خواستن، ئەوا بە کردار هیچ پیاوێك ناتوانێت لە یەك ژن زیاتری دەست بکەوێت.. چونکە لێرەدا ژمارە بڕیار دەدات!

ئەگەر پیاوێك توانی ئافرەتێکی دیکەی دەست بکەوێت، واتە ئافرەتێکی زیاد هەیە، کە هیچ پیاوی لە بەرامبەردا نیە، جا نەبوونی ئەم پیاوە لە هەقیقەتدا بێت، یان بە نەبوو بژمێردرێت وەك یەکە.. واتە ژمارەی ئەو ئافرەتانەی لە تەمەنی مێردکردندان بە ژمارە زیاتر بێت لە ژمارەی پیاوەکان لە کۆمەڵگەدا، یان زیاتر لە ژمارەی ئەو پیاوانەی لە هەموو ڕوویەکەوە گونجاون بۆ ژن هێنان و توانایان هەیە، یان ئەوانەی کە دەتوانن و دەیانەوێت.

جا ئەگەر ژمارەی ئەو ئافرەتانەی گونجاون بۆ مێردکردن لە هەقیقەتدا، یان لە حوکمدا لە ژمارەی پیاوەکان زیاتر نەبێت، ئەوا -هەروەك گوتم- هیچ پیاوێك لە ژنێك زیاتری دەست ناکەوێت، ئەگەریش بیەوێت، جا پرسەکە لە رێگای ژمارەکانەوە خۆی خۆی چارەسەر کرد.!

بەڵام کاتێك هاوسەنگیی کۆمەڵگا تێك دەچێت و، ژمارەی ئەو پیاوانەی گونجاون بۆ ژن هێنان کەمتر بوو لە ئافرەتان، جا ئەم کەمییە لە ڕووی ژمارەوە بێت، هەروەك لەدوای جەنگەکان و، ئەو دەردو بەڵایانەی، کە پیاوان زیاتر لە ئافرەتان دوچاری دەبن، یان بە هەر هۆیەکی دیکە، یان لە ڕووی نەتوانینی ژن

هێـنانەوە بێـت لەبـەر هۆیـە ئابوریـیەکان یـان خێزانیـیەکان، یـان کۆمەڵایەتییە گشتییەکان.. جا تەنها لێرەدا بوار هەیە، کە پیاو بتوانێت چەند ژنێك بێنێت.

کەواتـە بـا سـەرنجی ئـەم حاڵەتـە بدەین، نزیکترین نمونە لەمبارەوە ئەڵمانیایە لـەدوای جـەنگی جـیهانی دووەمـدا، کـە لە بەرامبەر هەر گەنجێك کە لە تەمەنی ژنهێـناندا بێـت، سـێ کچـی عازەبی لەو تەمەنە -واتە ۲۰-٤٥ ساڵی- هەبوو.. ئەمـە حاڵەتـێکی ناهاوسـەنگیی کۆمەڵایەتیی ئاشکرایە، جا ئەو یاسادانەرەی بۆ بـەرژەوەندی کۆمەڵگـە و بـەرژەوەندی ئافـرەت و پـیاو و بـەرژەوەندی هـەموو مرۆڤایەتیدا کار دەکات، چۆن ڕوبەڕووی دەبێتەوە؟

تەنها یەك لەم سێ چارەسەرە هەیە:

چارەسـەری یەکـەم/ هەرپـیاوێك یـەك ژن بکاتـە هاوسـەری و، دوو ئافرەتیش لەژیانیاندا بەبێ پیاو و ماڵ و منداڵ و خێزان بمێننەوە..

چارەسـەری دووەم: هـەر پـیاوێك یـەك ژن بخوازێـت و ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵ بەسـەر ببات و، بە پەنهانیش بچێتە لای دوانەکەی دیکە و لەگەڵیان ڕابوێرێت، تا ئەوانیش لە ژیانیاندا پیاوێك بناسن، بەبێ ئەوەی ماڵ و منداڵ و خێزانیان هەبێت، ئەگـەریش بـەهۆی ئـارەزووی مێیینـەیی قوڵـیان منداڵـیان بـوو، ئـەوا لە ڕێگای تاوانـەوە دەیانـبێ، بـە تاوانـباری و گومانلێکراوی دەبێ، باوکێکی ناسراوی نیە، خۆیان و منداڵە بێگوناهەکانیشیان دوچاری ئەم شەرم و وێڵبوونە کردووە.!

چارەسـەری سـێیەم: ئـەو پـیاوە لـە ئافرەتـێك زیاتـر بکاتـە هاوسەری و، بۆ شـکۆمەندی هاوسـەرێتی و ئاشتیی ماڵ و دابینکاری خێزان و بونی منداڵ بەرزیان بکاتـەوە. هـەروا ویژدانـی خـۆی لـە پۆخڵەواتی تاوان و دڵەڕاوکێی گوناه و سزای ویـژدان بەرزبکاتـەوە و، کۆمەڵگـە لـە پۆخڵـەواتی بێسـەروبەری تـێکەڵ بوونـی ڕەچـەڵەکەکان و، پیسـیی خـراپەکاری بـەرز بکاتـەوە. بوارێـك بـۆ کۆمەڵگـە بڕەخسـێنێت، تـا بـە وەچەی نوێ قەرەبووی ئەو ناهاوسەنگییە بکاتەوە -کە پاش جەنگ و پەتا کوشندەکان پەیدا دەبێت- و هاوسەنگی دروست بکات.

لەو حاڵەتەدا کام لەم چارەسەرانە گونجاوترن بۆ مرۆڤایەتی و، شایستەترن بە پیاوەتی و، ڕێزدار و سودمەندترن بۆ خودی ئافرەتەکە؟

ئەمە هەڵوێستێکە و هەڵبژاردنی تێدا نیە. یان ئەوە یان ئەوە یان ئەوە، هیچ بوار نیە بۆ سۆزی شاعیرەکان یان ئارەزووی تاکەکان، یان زۆر بڵێیی وشکی بێ‌مانا، ئەمە پێویستییەکی کۆمەڵایەتی و پێویستییەکی گیانی و پێویستییەکی زیندەگییە، ڕوبەڕوبوونەوەشی دەبێت لە سنوری کردەیی واقیعیدا بێت، نەك بە خەون و خەیاڵ.. ئەڵمانیای گاور(نصراني)، کە ئایینەکەی فرەژنی حەرام دەکات، زۆر گەڕا بەدوای چارەسەردا و هیچ چاری نەبوو تەنها ئەوە نەبێت، کە ئیسلام هەڵی بژاردووە، ئەگەرچی ئەڵمانیا ئایینەکەی ئیسلام نیە! جا ئافرەتان لەوێ داوای فرەژنیان کرد، ئەم داوایەش لەلایەن پیاوانەوە نەکرابوو.

لەوانەیە کەسێك بڵێت: ئێستا ئافرەت توانای کارکردنی هەیە، دەتوانێت بەبێ پیاو بژێت!

ئەم قسەیەش ناڕاسترین درۆیە سەبارەت بە سروشت و فیترەت و واقیع دەکرێت، پێویستی ژن بۆ پیاو، وەکو پێویستی پیاوە بۆ ژن، کە هەمووی لە خۆراکدا کورت هەڵنەهاتووە، بەڵکو هەمووی لە داواکارییەکانی جەستەش کورت هەڵنەهاتووە.. ئەگەرچی ئەو ئافرەتە سامان و خۆراك و داواکارییەکانی جەستەی هەبێت، بەڵام ئەمانە بەهرەی نادات، لە بون و کەسایەتی هەموو ئافرەتێکیشدا پێویستییەکی دەروونی قووڵ هەیە، کە پیاوی هەبێ. ئەوی پێویستە بۆ ئەوەی خۆی تەواو بکات.. کە قووڵترینی پێویستییەکانە.. هەروەها هەستی پیاویش لەمە کەمتر نیە، ئەمە ئەو فیترەتەیە، کە سیستەمی (هاوسەرگەریی) لە زیندەوەران و هەموو شتێکی وەك یەك لەسەر دامەزراوە! کە ئەفسانەی هۆکاری ئابوری پوچ دەکاتەوە، کە هەندێك لە خاوەن بۆچوونە مادديەکان، ئەوانەی تەنها بە ڕووکەش دەڕواننە هەستی ئافرەت بەوەی، کە پێویستیی بە پیاو هەیە بۆ ئەوەیە، کە بژێوی بدات و بەخێوی بکات.. پیاو، ئەگەرچی ئافرەت نایژێنێت، هەرگیز ئەوەندە دڵخۆش و چالاك و لەخۆڕازی نابێت وەك ئەو کاتەی ئافرەتێك ئەوی بەدڵ

بێت. هەرگیز هەست بەو دڵنەوایی و دڵنیایی و ئارامیە ناکات، کە لەگەڵ نیوەکەی دیکە هەستی پێدەکات. ئەمە ویستێکی بەرزە کە ئەم پێویستییەی لە دەروونی هەردوولا داناوە تا لە هەردووکیان ژیان بنیات بنێت و، هەڵیان بنێت بۆ ئاوەدان کردنەوە و بنیات نان و گەشەسەندن.

کەواتە هەتا لەم زەویەدا ڕەوشی وا هەبێت، کە هاوسەنگی نێوان ژمارەی هەردوو ڕەگەز کەم بکاتەوە، یان نەیهێڵێت، ئەوا باشترین چارەسەر و، چاکترین خۆپاریزی، ئەو مۆڵەتەیە، کە ئیسلام دایناوە و، بە ژمارەکانی بەستۆتەوە و، لێگەڕاوە خۆی خۆی چارەسەر بکات، چونکە ئەمە بوونی نابێت مەگەر لە ناخی واقیعە ژمارەییەکەدا پێویستیەك هەبێت بۆ بوونی، جا ئەگەر هەڵنەری ژمارەکان نەبێت، ئەوا بوونی نابێت ئەگەریش ئادەمیزاد بیەوێت!

من ڕوو دەکەمە ئەو چەنەبازانەی لای خۆمان، ئەوانەی کە ژاوەژاو و قسە دەکەن هەست بە بەڵگەنەویستەکان ناکەن.. پێیان دەڵێم: ئایا ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕوویداوە، کە گەنجێکی میسری ویستبێتی ژن بهێنێت، بەڵام کچێکی دەست نەکەوتبێت، لەبەر ئەوەی پیاوێکی دیکەی چاوچنۆك، یان ئارەزووباز یان دەوڵەمەند، زیاد لە ژنێکی دەستکەوتوە و، لەبەر نەبوونی کچ وەك پێویست، هاوڕێیەکەی لە ژنهێنان بێبەش بکات؟!

بەڵێ! من ئاگادارم حاڵەتی وا هەبووە کە حەزێکی لەناکاو، یان دەوڵەمەندییەکی لەپڕ، یان ئارەزوویەکی ئاژەڵی، بەتەنها بۆتە هۆی ئەوەی پیاو چاو ببڕێتە فرەژنی -ئیسلامیش بۆ ئەم حاڵەتە بۆچوونی خۆی هەیە، کە پاشان پەردەی لەسەر هەڵدەدەینەوە-، بەڵام پرسیار دەکەم: ئایا ئەو پیاوە ئافرەتێکی بەردەستی پیاوێکی دیکەی داگیرکردووە، یان لەناو کۆمەڵگەدا ئافرەتێکی بێمێردی دۆزییەوە؟ ئەو ئەگەر ئەو ئافرەتە بێمێردەی نەدۆزیایەتەوە نەیدەتوانی ئارەزووە ئاژەڵییەکەی، یان حەزە لەناکاوەکەی، هەتا هەڵچوونی دەوڵەمەندییە لەپڕەکەشی لەڕێگای ژنهێنانەوە جێبەجێ بکات.. ئایا ئەمە جێگای مشتومڕە؟

لێرەدا دەوترێت: هۆکارە ئابورییەکان و هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە، کاریگەرییان هەیە لەوەی هەندێك پیاو توانای یەکجار زۆریان هەبێت لە پەیداکردنی زیاد لە ئافرەتێك و، پیاوی دیکەش لەو هەلە بێبەشی دەکات.. چونکە بوونی ئافرەتی بێمێرد، بەڵگە نیە بۆ کەمییەکی راستەقینە لە ژمارەی پیاوان، بەڵکو بەڵگەیە بۆ کەمیی توانای ئابوری و کۆمەڵایەتی هەندێك پیاو.

ئەمە ڕاستە، بەڵام چارەسەرەکەی دەبێ لەڕێی چارەسەرکردنی ئەو بارە کۆمەڵایەتی و ئابورییانە بێت، کە ئەم ناهاوسەنگییە لە جەستەی کۆمەڵدا دروست دەکات، نەك چارەسەرکردنێکی کاتی بەستراو بە مافی ژنهێنان، کە نەگاتە سەرچاوەی دەردەکە.

ئەگەر کاروبار بدرێتە دەست ئیسلام، ئەوا لێناگەڕێت ئەم ناهاوسەنگی کۆمەڵایەتی و ناهاوسەنگی ئابورییە بمێنێت، چونکە ئیسلام بە سروشتی خۆی، ئەو هاوڕێکی و هاوسەنگییە لە هەموو ڕوویەکی کۆمەڵگادا بەدی دەهێنێت و، دڵنیایی تەواو بە هەموو هاوبەشەکان دەدات، یەك لە دڵنیاییەکانیش ئەوەیە ژن مەرج بکات کە مێردەکەی ژنی بەسەردا نەهێنێت، جا ئەوکاتە دەبێ مەرجەکەی بۆ بەجێ بهێنرێت، یان داوای تەڵاق دەکات.

ئیسلام کاروبارەکە بە تێکڕایی چارەسەر دەکات، بەش بەشەکانیش خۆیان خۆیان ڕاست دەکەنەوە، ئیسلام نایەت هەڵوێستەکان بەش بەش و لێك جودا و، بە چارەسەری ئاسۆتەسك چارەسەر بکات، کە لە شوێنی پێیەکان دوورتر نەڕوات، هەروەك نەفامە چەنەبازەکان دەیانەوێت!

ئیسلام بێئاگا نیە لەوەی، کە هەندێك سروشتی نائاسایی لە پیاواندا هەیە کە بە ژنێك تێر نابێت، بەڵکو چاو دەبڕێتە یەکێکی دیکە و یەکێکی دیکە. جا ئەگەر لە جیهانی ژن هێنانی ئاشکرا و ڕێزدارانە دەستی نەکەوێت، ئەوا بە شێوەیەك لە شێوەکان لە جیهانیلەشفرۆشی ئافرەتان و بەرەڵاییدا دەستی دەکەوێت، بەمەش کۆمەڵ دێتە لەرزە، هەروەك ژن و ماڵیش دێنە لەرزە، پڕ دەبێت لە گومان و دڵپیسی و، ئاشتی و ئاسایشی تێدا نامێنێت.

ئایا بۆ چارەسەری ئەم حاڵەتانە، لە بازنەی ژنهێنانی ڕێکوپێك و ڕێزدارانەدا، باشتر نیە بوار بۆ ئەو جۆرە سروشتانە بکەینەوە، لەوەی بە نهێنی هەوڵی بۆ بدات و، خۆی و غەیری خۆی پیس بکات و، خراپەکاری لەنێوان خەڵك بڵاو بێتەوە؟! هەروەك لە ئەوروپا ڕوویدا، کە فرەژنی ڕێزدارانەی حەرام کرد، تا لە هەموو کونج و لە هەموو لایەکەوە ڕووبەڕووی چەندژنی پیس و بێزراو ببێتەوە!

ئیسلام دەیتوانی ئەم جۆرە ئارەزوانە فەرامۆش بکات و، بە خەفەکردن و سزا ڕووبەڕووی بێتەوە تا بە یەکێك دابمرکێت، یان ئەگەر لایدا بەهیلاك بچێت! ئەگەر بەرامبەر بەم ئارەزوانە لە واقیعی ژیاندا ناهاوسەنگی نێوان ژمارەی پیاوان و ژمارەی ئافرەتان هەیە، کارەکەش لە کۆتاییدا -هەروەك وتمان- بۆ ژمارەکان دەگەڕێتەوە، کە ئەو دادوەرە تیایدا بەبێ دیاریکردن و سنوردارکردن!

لێرەدا لەوانەیە بوترێت: ئەگەر کارەکە وایە، ئەی بۆچی ئیسلام بەرزترین رادەی فرەژنی دیاری کردووە، بۆچی بۆ سروشتی ژیان و بڕیاری ژمارەکان بەجێی نەهێشتووە؟

ئەم ڕەخنەیەش تەنها قسەیە، ئەگەر ئا با بزانین، کە ئەم مۆڵەتە لە ئیسلامدا لەبەر پێویستی و ناچارییە، شوێنی ناچاریش تەنها بۆ پێویستییە، ئەوپەڕی پێویستیش چوارە؛ چونکە ناهاوسەنگی لەو رادەیە تێپەڕ ناکات، بەڵکو کەمجار دەیگاتێ. لەبەر ئەوەی سنووردارکردنەکە ئەو هەستە دەدات، کە دەرگاکردنەوەکە بۆ ناچارییە نەك بنەمایەك بێت، مۆڵەتی فرەژنیش، کە هاتووە بە مەرجی دادوەریی(عدل) بەپێی توانا سنووردار کراوە: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً: ئەگەر ترسان کە دادوەر نەبن ئەوا هەر یەك ژن بهێنن.﴾النساء/٣.

دادوەر(عدل)یش لێرە، دادوەریی کردنە لە خەرجیکێشان و، دادوەرییە لە چاودێری، دادوەرییە لە دابینکردنی بەشی پێویست لە هەموو لایەنەکانی ماددی و جەستەیی و دەروونی.. بەڵام سۆزی دەرونیی تایبەت، کە کاریگەری لەسەر ڕوکارەکانی ژیاندا نیە، دادوەری لەوەدا بەدەستی مرۆڤ نیە، تەنها ئەوەندە

داواکراوه، که ئەو دڵ بەلادا چوونه ئاشکرا نەکرێت و، ئەوی دیکه وەکو هەڵواسراو لێ بکرێت:

﴿وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلاَ تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَـةِ: ئـێوه هەرچـەند هەوڵـیش بدەن، هەرگیز ناتوانن لەگەڵ ژنانی خۆتاندا دادوەر بـن، سـا ئـەوەندە بەلای هەندێکدا مەچن و لەوانی دیکه دوور بکەونەوه و بیانکەنه هەڵپەسارده..﴾النساء/١٢٩.

ئەوانـەی لـە یـەك گۆشەوه تەماشای کارەکان دەکەن، بەهەڵەداچوون. لەوانەیه ژنـی یەکـەم زیانی لێ بکەوێت، بەڵام ئەو ژنه دادوەر نابێت، هەتا خۆی له شوێنی ژنەکـەی دیکـه دانەنێت، که پێشتر بێمێرد بووه. ئایا ئەگەر له جێگای ئەو بوایه ڕازی نـەدەبوو پیاوێك داوای بکات، تا به هاوسەرێتیەکی پاك و ڕێزدار بیخاته پاڵ ژنەکەی دیکه، نەك بەشێوەی دۆست و دڵدارێکی پیس؟! هەروەها پێویسته تێبینی زۆر بـارودۆخی دیکـه بکـەین؛ بـارودۆخی ئـەو ژنه نەخۆشەی مێردەکەی نایەوێت تـەڵاقی بـدات و ژیانیشـی لەگەڵـیدا ناچـێته سـەر، یـان ئەو ژنەی نەزۆکه و لای مێردەکەی خۆشەویسته.. یان و یان...

ئیسـلام بـەم مۆڵەت پێدانه ویستی ئاشتی دابین بکات، ویستی ژیان به هەموو ڕەوش و ڕوداوەکانـیەوه هـاوڕێك بکات و، حیسابیشی بۆ حەز و پێویستییەکانیش کـردووه، هاوسـەنگیی لەنـێوان زیانـەکان و ئازارەکـاندا ڕاگرتووه، جا سوکترین و ڕێزدارترینـیانی هەڵـبژاردووه، بـەڵام مێشـك بەتاڵـەکان له حیسابی ئیسلامدا له چەنەباز و زۆروەڕێك زیاتر نین.

## هاوبەرپرسیاریی خێزانیی

کـه لـە ژن و مێرد تێدەپەڕین، دەبینین ئیسلام گرنگی به ئاسایشی هەموو ئەو خـێزانه دەدات، که ماڵ لەخۆیان دەگرێت، پەیوەندی نێوان هەموویان ڕێك دەخات، بڕیاری بەرپرسیاری نێوان هەموویان دەدات. له بەرپرسیاریشدا ماف و ئەرك هەیه، تایبەتمەندی و داواکاری هەیه، هەمووی به متمانەبون به بەرامبەر و، دڵنیابوون له ژیان و ئایینده و، هەستکردن به ئاسایش و ئاسودەیی تیایدا کۆتایی دێت.

سۆزی دایکایەتی بە تەنها بەسە بۆ چاودێریکردنی کۆرپە، سۆزی باوکایەتی بە تەنها بەسە بۆ دابین کردنی خەرجیی کۆرپە و دایکی، بەڵام ئیسلام لەگەڵ ئەو سۆزە سروشتییەدا، داواکاری ڕاشکاو زیاد دەکات. ئەمەش وەك هەموو لایەنێکی دیکەی ژیان. ئیسلام بیروباوەڕ بڵاودەکاتەوە و ویژدان دەوروژێنێ، بەڵام ئەرکەکان بە شاراوەیی و ئاڵۆزی ناهێڵێتەوە و، تەنها بۆ ویژدان و سۆز بەجێی ناهێڵێت، بەڵکو بە دەق دیاریی دەکات و بە دەستور و شەریعەت پشتگیریی دەکات. هەروا بۆ مافی کۆرپەلەیش هەمان شت دەکات.

﴿وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاَقٍ نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئًا كَبِيرًا: مندالی خۆتان لە ترسی لەبرسامردن لەناو مەبەن، ئێمە ڕۆزیی ئەوان و ئێوەش دەدەین.. کوشتنی ئەوان هەڵەیەکی گەورەیە.﴾الإسراء/٣١.

﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ: دایکان دوو ساڵی تەواو منداڵەکانیان شیر دەدەن، بۆ ئەو کەسەی بیەوێ بە تەواوی شیری دەداتێ، لەم ماوەیەدا ڕۆزی و جل وبەرگی دایکەکە -بەپێی دابی مسوڵمانانی ئەو شوێنە- لەسەر باوکەکەیە، کەس لە توانای خۆی زیاتر ئەرکبار ناکرێت.. نابێ هیچ دایك و باوکێك لەبەر کۆرپەکەیان زیان بە یەکتر بگەیەنن.﴾البقرة/٢٣٣.

لە بەرامبەردا دایك و باوکیش مافیان هەیە -لە ئیسلامدا هەموو مافێك ئەرکێکی لە بەرامبەردایە-، ئەو مافەش زیاتر دەکرێت، کە لەگەڵ دایکایەتی و باوکایەتیدا بگونجێت، هەر لە ڕێز و گوێڕایەڵی و ئەدەبەوە بگرە تا سۆز و نەرم و نیانی لەکاتی بەتەمەندا چوونیاندا.. ئەو دەستەواژانەی کە قورئان ئەو مانایانەی پێ دەردەبڕێت پڕیەتی لە سۆز و نەرم و نیانی و دڵڕوونی: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا، وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا: پەروەردگارت فەرمانی دا کە بێجگە لەوی

مەپەرستن، سەبارەت بە دایك و باوكیش چاكە بكەن، هەركاتێك یەكیان یان هەردوكیان –تا لەلای تۆن– توشی تەمەنی پیری بون، هەرگیز ئۆفیشیان پێ مەڵێ و تێیان مەخوڕە و بە زمانی خۆشیان بدوێنە، بەبێ فیزی بیانخە ژێر باڵی بەزەیی و، بڵێ: ئەی پەروەردگاری من! وەكو ئەمان منیان بە كۆرپەیی پێگەیاند، تۆش وەبەر بەزەیی خۆتیانخە.﴾الإسراء/٢٣-٢٤.

دایكیش بەقەد ماندووبوون و سۆزدارییەكەی مافی هەیە: ﴿وَوَصَّيْنَا الإنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ: ئامۆژگاریی مرۆڤمان كرد سەبارەت بە دایك و باوكی، دایكی كە بەو زگپڕبوە، چەندی كوێرەوەری دیوە، لەشیر بڕینەوەشی دوو ساڵی خایاندووە، دە تۆش سوپاسی من بكە و، سوپاسی دایك و باوكت بكە، دواجار دێنەوە لای من.﴾لقمان/١٤.

پێویستە ئاوڕێكی خێرا لەو دوو ئایەتە بدەینەوە، لە یەكەمیان چاكە لەگەڵ دایك و باوك لەگەڵ پەرستنی خودا هاودەم و بەیەك بەستراوە و، لە دووەمیان سوپاسی دایك و باوك لەگەڵ سوپاسی خودا هاودەم و بەیەك بەستراوە، لەم هاودەمی و بەیەك بەستنەدا ئاماژەیەكی ئاشكرای تێدایە، كە ئاشاردرێتەوە.

ئەم هاوبەرپرسیاریەتیە لەنێوان گشت ئەندامانی خێزان دەگەڕێنرێتەوە، جا نزیكترین كەس بە ئەركەكان هەڵدەستێت، ئنجا ئەوەی دوای ئەو، هەتا دەگاتە خزم و كەسەكان. میراتیش لەسەر هەمان سیستەم بۆ نێزیكترین كەس دەبێت، ئنجا ئەوەی دوای ئەو.. تاكو جۆرە دابینكردنێكی كۆمەڵایەتی لەناو خێزاندا هەبێت، كە ئەمە جگە لە لەو دەستەبەر(ضمان)ە كۆمەڵایەتییانەی لەسەر كۆمەڵ، یان دەوڵەت دانراوە، كە لە شوێنی خۆی باسی دەكەین.

ئەم هاوبەرپرسیاریەتیە خێزانییە بوار فراوانە، لەگەڵ سیستەمەكانی ئیسلامیی بۆ كاروباری ناو ماڵ–كە پێشتر باسمان كردن– كۆڵەگەی ئاشتی و ئاسایشی ناوماڵن. دروشمی ئیسلامیش لەوەدا ئەوەیە، كە لە سەرەتای ئەم بەشە باسمان كرد: ((ئەو تاكەی لە ماڵەكەیدا بە ئاشتی نەژێت، نرخی ئاشتی نازانێت و، تامی

ناچێژێت و، نابێـتە هـۆکارێکی ئاشـتی و، لـە دەمـاریدا جـەنگ و، لـە دەرونیا دڵەڕاوکێ و، لە گیانیدا شپرزەیی هەیە.

# ئاشتیی کۆمەڵگە

لە کۆمەڵگادا بەرژەوەندییەکان تێکهەڵکێش دەبن و پاڵنەرەکان بەسەر یەکدا پڕ و کەڵەکە دەبن و، بگرەوبەردە زۆر دەبێت و، وەرگرتن و بەخشین دوبارە دەبێتەوە. لە کۆمەڵگادا تاکەکان ئاڵوگۆڕ دەکەن و، کۆمەڵەکان مامەڵەو ڕەفتار لەگەڵ یەکتر دەکەن و، هێزەکان کارلێك دەکەن و، تواناکان پێشبڕکێ دەکەن. لە کۆمەڵگادا تاکەکان تێکەڵ دەبن و، ماڵەکان یەکدەگرن و، خێزانەکان ئاوێتە دەبن و، هەمووشیان بەو شورە مەزنە دەورە دراون، کە هەموو چالاکییەکانی دەگرێتەوە و، هەموو لایەنەکانی دەنوێنێت و، لە هەموو لایەکەوە کاری تێ دەکرێت و کاریگەریی دەبێت.

کاتێك هەندێك لە بۆچونە کۆمەڵایەتییەکان وا دادەنێن، کە پەیوەندی نێوان تاك و تاك هەردەم پەیوەندیی ململانێ و ناکۆکیە و، پەیوەندی تاکەکان و دەسەڵاتەکان هەردەم پەیوەندی خەفەکردن و ناچارکردنە. ئیسلام بڕیار دەدات کە پەیوەندی نێوان هەموویان -لە کۆمەڵگایەکی مسوڵماندا- پەیوەندیی خۆشەویستی و بەزەییە، پەیوەندی هاوکاری و هەرەوەزییە، پەیوەندی ئاسایش و ئاشتییە. بڕیار دەدات کە ئەو بناغەیەی ژیانیان لەسەری بنیات دەنرێت، بناغەی هاوڕێکیی نێوان ماف و ئەرکەکانە، هاوتاییە لەنێوان دەستکەوت و لەدەستدان، هاوسەنگیە لەنێوان کۆشش و پاداشت. بڕیار دەدات کە مەبەستی دیاریکراوی هەمویان درێژەپێدان و، گەشەپێدانی ژیان و، ڕووکردنە لای خوای دروستکاری گەردون و ژیانە، بە هەموو چالاکی و نیەت و کارێکەوە.

دوای ئەوەش هەموو چالاکییەکی تاك و، هەموو چالاکییەکی بەکۆمەڵ کۆتایی دێت، هەروەك هەموو ڕێکخستن و بەرهەمێك کۆتایی دێت، کۆتاییەکەشی بە ئاشتیی گشتی دێت، کە هەموو ویست و لایەنەکان و، هێز و وزە جیاوازەکان و،

تــاك و كۆمەڵــە جیاوازەكان ڕێك دەخات. چونكە ئاسۆیەك هەیە بەرزترە لە ئاسۆی بەرژەوەندییــە كاتییــەكان، كــە ڕقەبەرایــەتی دەورووژێنێــت و دوژمــنایەتی توندتــر دەكات.

بۆچــوونە ڕۆژئاوایــیەكان لەگەڵ ئەو ژینگەیەی تیایدا گەشەیان كردووە گونجاون. ژیــنگەی شارســتانیەتی ڕۆژئــاوای مــاددی، ئــەو شارســتانیەتەی لەژێاندا هەموو ئامانجــێكی دوورتــر لــە ئامــانجی بەرژەوەندی ڕاستەوخۆی نزیك ڕەت دەكاتەوە، لە مرۆڤایەتیشدا ڕەگەزێك نابینێت بەرەو دوورتر لە خود بڕوانێت.. كاتێك ئەو بیرۆكە ماددیــە فەرمانــڕەوایی هەموو ژیان دەكات، هیچ بوارێك نامێنێت بەبێ ململانێی توندوتــیژی نــێوان چــینەكانی كۆمەڵگە، بوار نامێنێت بێجگە لە یاساكانی كار و ڕەوشی بەرهەمهێنان، ئەو كاتەش پرسی (ململانێی چینەكان) دەبێتە هەقیقەتێكی مــاددی بەرجەســتە و ڕزگــاربوون نــیە لــێی و، هــیوای خۆدورخســتنەوەی نــیە و، ناتوانرێت فەرامۆش بكرێت.

بــەڵام كاتــێك بەرنامەیــەك وەك بەرنامــەی ئیسلام فەرمانڕەوایی ژیان دەكات، كاتــێك سیســتەمی كۆمەڵایــەتی ئیســلام بــەرەو جێبەجێكردنی كردەیی دەڕوات، كاتــێك یاســای ئیســلامی وەكــو خوا دەیەوێت جێبەجێ دەكرێت، نەك وەك ئەوەی پــیاوە ئایینیە لەڕێ دەرچووەكان لێكی دەدەنەوە.. ئەو كاتە (ناچاركردنی ماددی= الجبرية المادیــة) و (حەتمیەتی ململانێی چینەكان) دەبێتە پرسێكی بەردەست كراو و پشــت بــە هــیچ واقــیع و ژیریێژییەك نابەستێت، چونكە فەرمانڕەوایی ژینگەیەكی دیكــە و، سیســتەمێكی دیكــە دەكــات، فەرمانڕەوایــیەك هەڵقوڵاوی ژینگەیەكی دیاریكــراوە، كــە بیرۆكــەی مــاددی، فەرمانــڕەوایی دەكــات و، بیرۆكــەی ئامانجە بەرزەكانی ژیان ڕەت دەكاتەوە.

ئیسلام ئەو ئاشتییە گشتییە لەسەر حیسابی تاك، یان حیسابی كۆمەڵە(جماعة) بنــیات نانێت، هەروا لەسەر بناغەیەك لە بەرژەوەندی چینێك دژی چینێكی دیكە، یــان دەســەڵاتێك دژی دەســەڵاتێكی دیكــە دانامەزرێــنێ.. بەڵكو لەسەر حیسابی هــەموویان بەرپای دەكات، پاداشتی هەموو كۆششێك دەداتەوە، پێویستیی هەموو

کەسێك دابین دەکات، بۆ هەموو تاك و هەموو کۆمەڵە و هەموو دەسەڵاتێك، سنور دیاری دەکات بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا دادوەری(عدالة)یەکی ڕەها بەدی بهێنێت.. ئەو یاسا ئیسلامییەی تاك داینەناوە، چینێك داینەناوە، دەسەڵاتێك داینەناوە، یاسایەکە دوورە لە لارکردنەوە بەلای ڕیزی تاکێکدا، لە دۆستایەتی چینێك بەسەر چینێکی دیکەدا، لە ڕەچاوکردنی دەسەڵاتدار. لەگەڵ ئەوەشدا بەربەستێکە لەبەردەم سنوربەزاندنی چینێك بەسەر چینێکی دیکەدا، هەروا پارێزەرە لەو ململانێیەی، کە بۆچوونە ماددییەکان بە لێدانێکی لکێنراوو نەگەڕاوەی دادەنێن، چونکە لەو کۆمەڵگایانەی کە خۆیان بە ئیسلام دادەنێن- ئیسلامیش لێیان بەرییە- وەك لێدانێکی نەگەڕاوە بۆ ئەوانیش دەبینێ.. ئەمە دیاردەیەکی ناوچەیی ژینگەیەکی تایبەتە، ژینگەیەك کۆڵەگە بنچینەییەکانی لە کۆڵەگەکانی ژیان لە ئیسلام جودایە.

ئێستاش با تەماشا بکەین ئیسلام چۆن بیرۆکە گشتیەکەی دەربارەی ئاشتیی گشتگیری بنیاتنراو لەسەر دادوەریی تەواو لە چوارچێوەی ژیاندا بەدی دەهێنێت.

## ویژدانی خۆشەویستی و بەزەیی

ئیسلام لە بنیاتنانی کۆمەڵگەدا لە ویژدانی تاکەوە دەست پێدەکات، لە ناخی ڕۆحەوە تۆوی خۆشەویستی دەچێنێت و، شنەبای بەزەیی دەنێرێت.. خۆشەویستییەکی مرۆڤانەی پوخت، بەزەییەکی مرۆڤانەی بێگەرد.

ئیسلام خەڵك دەگەڕێنێتەوە بۆ دروست بوونی یەکەمیان، کە لە تاکە کەسێکەوە هاتونەتە بوون، لە ویژدانیان هەستی ڕەچەڵەك و خزمایەتی بەخەبەر دێنێ، بەیادیان دێنێتەوە کە لەبەر خودا و، لە دروست بوون و دوارۆژیان بران.. ئەگەر دەروونیان بەم هەستە ناسکانە نەرم بووەوە، ئەوا لە لێبوردەیی و ئاشتی نزیکتر دەبن و، هۆکارەکانی جیاوازیی و ناکۆکی دور دەبێت و، ئەو سیستەم و یاسایانەی بۆ بەدیهێنانی ئەم ئاشتییە داڕێژراوە، سەرکەوتوو دەبێت. ئەو ویژدانەش دەبێتە دابینکاریەکی توندو تۆڵ بۆ دەستوور و ڕێکخستنەکان و، ڕەورەوەی ژیان بە ئاسانی و نەرم و نیانی و لێبوردەیی بەڕێوە دەچێت: ﴿يَاأَيُّهَا

النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُم الَّذي خَلَقَكُمْ منْ نَفْسٍ وَاحدَة وَخَلَقَ منْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ منْهُمَا رجَالاً كَثيرًا وَنسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذي تَتَسَاءَلُونَ به وَالأَرْحَامَ إنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقيبًا: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگاری خۆتان ترستان هەبێ، کە هەر ئەوە ئێوەی هەر لە یەك کەسەوە خستۆتەوە و جووتەکەشی هەر لەو کەسە خستۆتەوە و لەو دوانەوە پیاوی زۆر و ژنی زۆری وەدی هێنا. لەو خودایە ترستان هەبێ، بەناوی ئەو ئێوە یەکتری سوێند دەدەن؛ ئاگاتان لە خزمانیش هەبێ، خوا هەمیشە چاودێرە بەسەرتانەوە.﴾النساء/١.

بەم شێوەیە هەموو مرۆڤایەتی لەیەك بنەچە و یەك خودا ڕێك دەکەون، ناکۆکی و جیاوازیەکان نامێنن، تا ئەو پەیوەندیە مەزنە توندە قووڵە بەدیار بخات، کە هەموو خەڵك بە جیاوازی گەل و نەتەوە و، رەگەز و ڕەنگ و زمان و کۆمەڵەکان دەگرێتەوە.

بەڵام بڕواداران بە سروشتی خۆیان پەیوەندیان پێکەوە نزیکترە، ئەمەش بەهۆی برایەتیان لەبەر خودا و، بەیەك گەیشتنەوەیان لە بیروباوەڕێك، کە ئیسلام بە پتەوتری دادەنێت لە پەیوەندی خوێن و، خزمایەتیەکی تێکەڵ و قوڵ: ﴿إنَّمَا الْمُؤْمنُونَ إخْوَةٌ: خاوەن باوەڕ هەموویان هەر برای یەکن.﴾الحجرات/١٠

((مَثَلُ الْمُؤْمنينَ في تَوَادِّهمْ وَتَرَاحُمهمْ وَتَعَاطُفهمْ مَثَلُ الْجَسَد إذَا اشْتَكَى منْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائرُ الْجَسَد بالسَّهَر وَالْحُمَّى: نموونەی بڕواداران لە خۆشەویستی و بەزەیی و سۆزیان، وەکو جەستەیەك وان، ئەگەر ئەندامێکی تووشی ئازارێك بوو، هەموو جەستە تووشی بێخەوی و تا دەبێت)).[1]

ئەوان کە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگیان دەکا و پێیان دەڵێ: ((لا تَبَاغَضُوا وَلا تَحَاسَدُوا وَلا تَدَابَرُوا وَكُونُوا عبَادَ اللَّه إخْوَانًا: رق و قینتان نەبێت و، ئێرەیی بە یەك مەبەن و، پیلان بۆ یەکتر دامەڕێژن، ببنە بەندەی خوا و برای یەکتر)).[2]

[1] رواه الشيخان.
[2] متفق عليه.

جا لەناویاندا ئیمان بە خۆشەویستیەوە پەیوەست دەکان، تا کەس جیاوازی لەنێوان خۆی و براکەی نەکات ((لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ: کەستان بڕواتان تەواو نابێت هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش نەبێت.))[1]

لەسەری حەرام کردوون کە زیاد لە سێشەو ناکۆکی لەنێوانیاندا بمێنێت، کە لەو سێ شەوەدا تووڕەیی خۆیان دادەمرکێننەوە و دەگەڕێنەوە لای دۆستایەتی و خزمایەتی؛ ((لا يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ يَلْتَقِيَانِ فَيُعْرِضُ هَذَا وَيُعْرِضُ هَذَا وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ: بۆ هیچ مسوڵمانێك حەڵاڵ نیە زیاد لە سێ شەو پشت لە براکەی بکات، بە یەك دەگەن و پشت لە یەکتر دەکەن و روو وەردەگێڕن، چاکترینیان ئەوەیانە کە بە سەلام کردن لەوی دیکە دەست پێدەکات.))[2]

بەزەییش هاودەمی خۆشەویستییە، خوا زۆرجار بەوە وەسفی خۆی دەکات و دووبارەی دەکاتەوە و، بەوە منەت بەسەر پێغەمبەرەکەیدا دەکات، کە بەزەیی لە دڵیدا داناوە، بۆیە نەرم و نیان و بەسۆزە: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ: لە بەزەیی خوایە کە تۆ هێندە نەرم و نیانی لەگەڵیان، ئەگەر توند و تووڕە و دڵڕەق بویتایە، بڵاوەیان لێ دەکردی.﴾ال عمران: ١٥٩

هەروا منەت لەسەر مسوڵمانان دەکات، کە ئەو پێغەمبەرە بە بەزەییەی بۆ ناردوون: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ: پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە لەخۆتانە، هەر بەڵا و ناخۆشییەك بەسەرتاندا بێت لای ئەو گرانە، زۆر دڵی بە ئێوەوەیە، بۆ بڕواداران بەسۆز و بەزەییە﴾التوبة/١٢٨.

---

[1] متفق عليه.
[2] أخرجه الستة الا النسائي.

دڵڕەقیش بە نیشانەی کوفر و بەدرۆخستنەوەی ڕۆژی دوایی دادەنێت: ﴿أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ، فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ، وَلاَ يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ: ئایا ئەو کەسەت دیت کە ڕۆژی جەزای لا درۆ بوو؟ هەر ئەوە کە هەتیو دەڕەنجێنێ، هانی نان دان بە هەژاران نادات. ﴾الماعون١-٣.

بەزەییش تەنها بۆ مسوڵمان نیە، بەڵکو بۆ هەموو ئادەمیزادە: ((ارْحَمُوا أَهْلَ الْـأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ: بەزەییتان بە خەڵکی زەویدا بێتەوە، ئەوەی لە ئاسمانەکاندایە بەزەیی پێتاندا دێتەوە.))[1]

نا؛ بەڵکو ئیسلام بە ویژدانی بەزەیی هەنگاوی مەزنی دەنێت و بەهۆیەوە لە جیهانی هەموو ئادەمیزاد تێدەپەڕێت بەرەو جیهانی زیندەوەران، گەشی و نەرم و نیانی و لاکردنەوەی ویژدان بەرامبەر هەمو گیاندارێك لە دڵی مرۆڤایەتیدا بڵاودەکاتەوە.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْرًا فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ، ثُمَّ خَرَجَ فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ بِي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ، ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ: پیاوێك بەرێگادا دەڕۆیشت و تینوویەتی زۆری بۆ هێنابوو، بیرێکی دۆزیەوە، دابەزییە ناوی و ئاوی خواردەوە، پاشان هاتە دەرەوە، دیتی سەگێك لە تینویەتیدا زمان دەردێنێ و خۆڵ دەخوا، پیاوەکە وتی: ئەم سەگەش وەك من تینویەتی زۆری بۆ هێناوە، جا دابەزیە ناو بیرەکە و پێڵاوەکەی پڕ ئاو کرد و بەدەم گرتی و، هاتە دەرەوە و سەگەکەی ئاودا، خوای گەورەش سوپاسی کرد و لێی خۆش بوو)).

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! لە ئاژەڵیش پاداشتمان هەیە؟

فەرمووی: ((نَعَمْ فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ: بەڵێ؛ لە هەموو خاوەن جەرگێکی تەڕ پاداشت هەیە..))[2]

---

[1] ابوداود والترمذي.

[2] أخرجه الشيخان

ئـەوە ئاسـتێکە لە جۆش و خرۆشی ویژدانی بەزەیی، هیچ شتێك نایگاتێ تەنها بیروبـاوەڕێکی بـڕوادار بە لقو پۆپە قوڵ و ئاڵۆزە گەورەکانی نێوان هەموو بڕواداران و، یەکـیەتی بەدیهێنەر و یەکیەتی بەدیهێنراو لەم بوونە فراوانەدا، نەبێت.. ئەوەیە ئـەو بیروباوەڕە شایستەیەی، کە دەروونی (ئادەمیزاد) داپۆشێت، کە پایەدارترینی ئەو زیندەوەرانەیە و جێنشینی خوایە لەسەر زەوی بەسەر هەموویاندا.

## ئەدەبی دەرونی و کۆمەڵایەتی

ئیسـلام بـۆ ئـەوەی خۆشەویسـتی و بـێگەردی دڵ و دەرون بـەدی بهێنێـت، مسـوڵمانان لەسـەر ئـەدەبی دەرونی و ئەدەبی کۆمەڵایەتی رادەهێنێت، تا هاوکار بێـت لـە گەیشـتن بـەو مەبەسـتە و.. ڕێ دەگرێـت لـە وروژاندنـی ڕق و قیـنە لە دەرونـەکان، یـان بوغـز و قیـنە دڵـەکان داپۆشێت، پێش ئەوەی پشت بە یاسا و دەسـتور ببەستێت، پشت بەو ئادابە بەرزانە دەبەستێت، ئەگەریش هەردوکیان وەك ئامـێرێك بەکاربهێنێـت، چـونکە ڕەفـتاری پاك و ئەدەبی جوان و مامەڵەی چاك، هـەموویان ڕەزامـەندی و خۆشـحاڵی و دڵنـیایی لـە کەشـی کۆمەڵایـەتی ژیـاندا بڵاودەکەنەوە، کە لە دەستور و یاسا بێ پێویست دەبن.

ئیسـلام رکـی لـە لوتبەرزی و فیز و شانازکردنە بەسەر بەندەکاندا: ﴿وَلاَ تُصَعِّرْ خَـدَّكَ لِلـنَّاسِ وَلاَ تَمْـشِ فِي الأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ، وَاقْصِـدْ فِـي مَشْـيِكَ وَاغْضُضْ مِنْ صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ: بەفـیزەوە ڕوو لە خەڵك وەرمەگێڕە، بە لوتبەرزی بەسەر زەویدا مەڕۆ، خوا ئەوانەی خۆش ناوێت، کە لە ڕێگە خۆیان بادەدەن و شانازی بەخۆیانەوە دەکەن، بە شێنەیی بـە ڕێـدا بـڕۆ و بـە دەنگـی نـزم بـدوێ، چـونکە دەنگـی هـەرە نـاخۆش دەنگـی کەرە.﴾لقمان/١٨-١٩

﴿وَلاَ تَمْـشِ فِي الأَرْضِ مَرَحًا إِنَّكَ لَنْ تَخْرِقَ الأَرْضَ وَلَنْ تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً: بەفـیزەوە بەسـەر زەویـدا هـەنگاو مـەنێ، تـۆ ناتوانی ئەم زەوییە ببڕیت و، بەقەد چیاکان درێژ نابیت.﴾الإسراء/٣٧.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ اللَّـهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لا يَبْغِيَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ وَلا يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ: خودا نیگای بۆ ناردم کە بێفیز و خۆبەکەم زان بن، تا کەس ستەم لە کەس نەکات، کەس شانازی بەسەر کەسدا نەکات.)).[1]

ئیسلام لەمەدا تێبینی سروشتی دەروونەکان دەکات، رقی لە خۆبەگەورەزانانە، قینی لە لوتبەرزانە، دڵی دەگوشرێ بەوانەی شانازی بەخۆیان دەکەن و خۆیان هەڵدەدەن، بێزاری و ناڕەحەتی بەرامبەر ئەوانە دەردەبڕێت، ئەگەریش هیچ زیانێکی تایبەتیان بەکەس نەگەیاندبێت، چونکە تەنها خۆنیشاندانیان بەو شێوەیە، هەستی بەرامبەرەکانیان دەوروژێنێت و، هانیان دەدات تا بە رِك لێبوونەوە و بێزاری لێیان وەڵامیان بدەنەوە، بەبێ ئەوەی هەست بەخۆیان بکەن.

ئەگەر ئیسلام رقی لە لوتبەرزی و خۆ بەگەورەزانین ببێتەوە، کە لەوانەیە ئازاری خودی هیچ مرۆڤێك نەدات، ئەوا هەرچی هەست و سۆزی خەڵك بریندار دەکات و، تانە لە هەست یان بەها بەرزەکانیان دەدات، بە حەرامی دادەنێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ يَسْخَرْ قَومٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلاَ نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ وَلاَ تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ بِئْسَ الاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الإِيمَانِ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ، يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلاَ تَجَسَّسُوا وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ: ئەی گەلی بڕواداران! با هێندێکتان گاڵتە بە هێندێکتان نەکەن، لەوانەیە ئەوانەی گاڵتەیان پێدەکەن، لە گاڵتەپێکەرەکان باشتر بن.. ژنانیش با هێندێکیان گاڵتە بە هێندێکیان نەکەن، لەوانەیە ئەوانەی گاڵتەیان پێدەکەن، لە گاڵتەپێکەرەکان باشتر بن.. دەست لە لاچاو داگرتن و تانەلێکدان و ناووناتۆرە لێك هەڵدان هەڵگرن، چونکە لەپاش بڕواهێنان، لەرێلادان، بەدناو و ناپەسندە.. کێش پەشیمان نەبێتەوە، لەریزی ناهەقەکانە. ئەی گەلی بڕواداران! لە زۆرێك لە گومانان خۆ بپارێزن، چونکە هێندێك گومانی وا هەن گوناهن.. سیخوڕی بەسەر یەکترەوە

[1] رواه مسلم وأبوداود.

مەکـەن و لـەکاری یـەکتر مەکۆڵـنەوە، لـە پاشملـە لە خراپەی یەکتر مەڵێن، ئاخۆ کەسـتان حـەز دەکـات گۆشـتی بـرای خـۆی بە مردوویی بخوات؟ دیارە قێزتان لێ دەبێتەوە، لە خودا بترسن و پارێزکار بن، ئەو پەژیوانی قبوڵە و دلۆڤانە.﴾الحجرات/ ١١-١٢.

ئیسـلام ڕەچاوی وردترین هەستەکانی دەروون دەکات، هەتا ڕێگری لەوە دەکات کـە دوو کـەس لـە ئامـادەبوونی سـێیەم کەسـدا بە نهێنی و بەچپە قسە بکەن و بەشـداریان نـەکات، پێغەمـبەرﷺ فەرمویەتی: ((إِذَا كُنْـتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِـثِ فَـإِنَّ ذَلِـكَ يُؤْذِيـه..: ئەگـەر سـێ‌کەس بوون، دوان پێکەوە بەچپە قسە نەکەن، چونکە ئەمە سێیەم کەس ئازار دەدا)).[1]

ئەمە ئەدەبێکی دەروونی بەرز و جوانە.

هـەر لـەبارەی ڕەچـاوکردنی هەستەکان، ڕێگری لە منەتکردن بە خێر و چاکەوە دەکـات، مـنەت کردن لە خودی خۆیدا خویەکی پیس و ناشیرینە، هەروەها ئازاری کەرامـەتی کەسـانی دیکـە دەدات، بۆیـە مـنەت کردن خێر بەفیڕۆ دەدات و چاکە ناهێڵێـت و، تورەیـی و گلـەیی جـێگەی سـوپاس و دانپێدانان دەگرێتەوە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالأَذَى كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَاءَ النَّاسِ كَالَّذِي يُـنفِقُ مَالَهُ رِئَاءَ النَّاسِ وَلاَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَـابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا لاَ يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِمَّا كَسَبُوا وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ: ئـەی گەلی بڕواداران! خێرەکانتان بە منەت لەسەرکردن و ئازاردان بەفیڕۆ مـەدەن.. نەکـەن وەك ئـەو کەسـانە بن کە بڕوایان بە خوا و ڕۆژی دوایی نیە و بۆ ڕوبیـنی لـە ماڵی خۆیان دەبەخشن، ئەم کارەیان لەوە دەچێت کە تاتەبەردێکی زۆر لووس هێندێ خۆڵی لەسەرە و بارانێکی توندی پێدەکەوێت و دەیشواتەوە و بە ڕەق و ڕوتـی بەجـێی دەهێڵێـت.. هیچ بەهرەیەکیان لەو بەخشینە دەستگیر نابێ، خودا گرۆی خوانەناسان لەڕێگە شارەزا ناکا.﴾البقرة/٢٦٤.

[1] رواه الثلاثة وأبوداود.

ئیسلام لەو ئەدەبانەدا، هەر لە سنوری سلبیبوون و خۆدوورگرتن ناوەستێت، بەڵکو هەڵیان دەنێت بەرەو لایەنە ئیجابی و خۆپێشخەرەکانیش، تا هەستی خۆشەویستی و پێکەوە ڕاهاتن جۆش بدات، بۆیە داوای بڵاوکردنەوەی قسەی چاك لەنێوان خەڵکدا دەکات: ﴿وَقُلْ لِعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ: بە بەندەکانی من بڵێ چی باشترە ئەوە بڵێن.﴾الإسراء/٥٣.. ﴿وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا: بۆ خەڵك قسەی چاك بکەن.﴾البقرة/٨٣.. ﴿وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا: هەرکەسێك چاك و خۆشیتان لێدەکا، ئێوە چاکتر چاك و خۆشی لەگەڵدا بدەن، یان وەکو خۆی وەڵامی بدەنەوە.﴾النساء/٨٦.

هەروا داوای بڵاوکردنەوەی سڵاو و ئاشتی لە هەموو شوێنێك و بۆ هەموو کەسێك دەکات، ناسیار بێت یان نەناس، تاکو دڵەکان هۆگری یەکتر بن و دڵنیایی بڵاوببێتەوە. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ وَالْمَارُّ عَلَى الْقَاعِدِ وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ: بچوك سڵاو لە گەورە دەکات، ڕێبوار سڵاو لە دانیشتوو دەکات، کەم سڵاو لە زۆر دەکات)).[1]

پرسیار کرا لە پێغەمبەری خواﷺ: چ شتێکی ئیسلام لە هەمووی چاکترە؟ فەرموی: ((تُطْعِمُ الطَّعَامَ وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ: خەڵك نان بدەیت و، سڵاو لە ناسیار و نەناس بکەیت.)).[2]

هەروا ئیسلام داوای وەڵامدانەی خراپە بە چاکە دەکات: ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ: هەمیشە بە چاکتر وەڵام بدەرەوە، ئەوسا ئەو کەسەی دوژمنایەتیت لەگەڵیدا هەیە وەك دۆستی نزیکی لێ دێت.﴾فصلت/٣٤.

﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُم الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا: بەندە ڕاستەقینەکانی خوای ڕەحمان ئەوانەن کە بە سوکی و بەبێ دەعیە

[1] البخاری
[2] البخاری

بەسەر زەویدا دەڕۆن و، هەر کاتێکیش نەزانەکان بیاندوێنن، بە نەرم و نیانی وەڵامیان دەدەنەوە.﴾الفرقان/٦٣.

ئیسلام بانگەشە بۆ لێبوردن و خۆگرتنی کاتی توڕەیی دەکات و، جیهادەکەی بۆ ڕق و قین نیە، بەڵکو بۆ لێبوردن و لێخۆشبوونە، هەڵچوون لەخۆی دوور دەخاتەوە و، پاك بوونەوە و لێبوردن شوێنی دەگرێتەوە: ﴿وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الأُمُورِ: بۆ کەسێکی خۆڕاگر بێت و لە تۆڵە چاوپۆشی بکات، ئەمە یەکێ لە کارە پەسندەکانە.﴾الشوری/٤٣. ﴿وَإِنْ تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ: ئەگەر چاویان لێ بپۆشن و وازیان لێ بێنن و بیانبەخشن، خوداش لە گوناهتان دەبورێ و دلۆڤانە.﴾التغابن/١٤.

﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ: ئەوانەی ڕکی خۆیان دەخۆنەوە و چاوپۆشی لە خەڵك دەکەن.﴾آل عمران/١٣٤. ﴿وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ: لەکاتی توڕەبونیاندا خەڵك دەبەخشن.﴾الشوری/٣٧.

هەروا بانگەشەی نەرم و نیانی لە کڕین و فرۆشتن و قەرزدا دەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((رَحِمَ اللَّهُ رَجُلًا سَمْحًا إِذَا بَاعَ وَإِذَا اشْتَرَى وَإِذَا اقْتَضَى: خودا بەزەیی بە کەسێکدا دێتەوە کە لەکاتی فرۆشتن و کڕین و قەرزداندا نەرم و نیانە.))[1]

هەروا دەسپاکی لە شت گۆڕینەوەدا: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ: ئەگەر لەیەك دڵنیابوون، با قەرزدارەکە قەرزەکە بداتەوە.﴾البقرە/٢٨٣.

هەروا دڵڕاستی لە بازرگانیدا: ((الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا: کڕین و فرۆشتن بە ویست و هەڵبژاردەی خۆیانە تا لە یەك جودا دەبنەوە، ئەگەر ڕاستیان کرد و ڕاستەقینەیان ڕوون کردەوە، بەرەکەت دەکەوێتە کڕین و فرۆشتنەکەیانەوە،

---

[1] البخاري والترمذي.

ئەگـەریش راسـتەقینە بشـارنەوە و درۆ بکەن، بەرەکەت لە کڕین وفرۆشتنەکەیاندا نامێنێت))ر[1]

ئیسـلام مسوڵمانان لە هەموو ورووژێنەرێکی ڕق و کینە و هۆکارەکانی ناخۆشی بـەدور دەخـات، هۆکـاری وەك کۆڕی قومار و لگاو، کە تیایدا پلەی رق و کینە لە دەرونـەکان بەپـێی دەسـتکەوتی حەرام و زیانی بێشومار زیاد و کەم دەکات، وەك کـۆڕی ئـارەق خواردنەوە، کە تیایدا هیچ عەقڵ یان ویستێك نیە حەز و ئارەزوەکان رێـك بخـات: ﴿إِنَّمَـا يُـرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُم الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنتَهُونَ: شـەیتان مەبەستی ئەوەیـە بـە شـەراب خـواردن و قومار ئاژاوە بخاتە ناوتانەوە، لە نوێژ و یادی خودا دورتان بخاتەوە، ئاخۆ ئێوە دەست لەو کارانە بەردەدەن؟﴾المائدة/٩١

بەم شێوەیە ئەدەبی دەرونی و کۆمەڵایەتی رۆڵی لە پاککردنەوەی کەشتی ژیاندا و، بڵاوکـردنەوەی خۆشەویسـتی و هۆگـری لـە دەرونـەکاندا دەبینێت و، یارمەتی بنیاتنانی ئاشتی لەناو کۆمەڵگادا دەدات، لەجیهانی واقیع و بەرهەستدا..

## هەستکردن بە هاوکاری و یارمەتیدان

پاشـان ئیسـلام تاکـەکان لـە کۆمەڵگـەدا بـە پەیوەندی بەرژەوەندیی هاوبەش پـێکەوە دەبەستێت و، هەستی هاوکاری و یارمەتیدان لە دەرونیاندا بەهێز دەکات، هەسـتی ئـەرکی سەر شانی هەموان بۆ بەرژەوەندی هەموان بەهێز دەکات، سنوری سەربەسـتی تـاك لـە ئاستی بـەرژەوەندی هاوبەشدا دیاری دەکات و، ئەو هەستە دەدات بـە هـەموان، کـە هـەندێك ئامـانجی هاویـەش هەیـە تـاك بەتـەنها پـێی هەڵناسێت، پێویستە بە هاوکاری نێوان هەموان پێی بگەن:

((كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَـنْ رَعِيَّتِهِ الْإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِـي أَهْلِـهِ وَهُـوَ مَسْـئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَمَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا وَالْخَادِمُ رَاعٍ فِـي مَـالِ سَيِّدِهِ وَمَسْـئُولٌ عَـنْ رَعِيَّتِهِ قَالَ وَحَسِبْتُ أَنْ قَدْ قَالَ

[1] رواه الخمسة.

وَالـرَّجُلُ رَاعٍ فِـي مَـالِ أَبِـيهِ وَمَسْئُولٌ عَـنْ رَعِيَّـتِهِ وَكُلُّكُـمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ: هــەمووتان شــوان و بەرپرســن و، هــەمووتان دەربــارەی ژێردەســتەکانتان لێــتان دەپرسـرێتەوە، پێشـەوا و سەرکردە بەرپرسە و لە ژێردەستەکانی لێی دەپرسرێتەوە، پـیاو بەرپرسـە لـە خـێزانەکەی و لە خێزانەکەی لێی دەپرسرێتەوە، ژن بەرپرسە لە مـاڵی مێردەکەی و لەسەر ژێردەستەکەی لێی دەپرسرێتەوە، خزمەتکار بەرپرسە لە مـاڵی گەورەکـەی و لـە ژێردەسـتەکەی لـێی دەپرسرێتەوە، پیاو بەرپرسە لە ماڵی بـاوکی و لەژێردەسـتەکەی لـێی دەپرسـرێتەوە، هــەموتان بەرپرســن و لەســەر ژێردەستەکانتان لێتان دەپرسرێتەوە)).(١)

((مَـثَلُ الْقَـائِمِ عَلَـى حُدُودِ اللَّـهِ وَالْوَاقِـعِ فِـيهَا كَمَثَلِ قَوْمٍ اسْتَهَمُوا عَلَى سَفِينَةٍ فَأَصَـابَ بَعْضُـهُمْ أَعْلَاهَـا وَبَعْضُـهُمْ أَسْفَلَهَا فَكَـانَ الَّذِينَ فِي أَسْفَلِهَا إِذَا اسْتَقَوْا مِنَ الْمَـاءِ مَـرُّوا عَلَـى مَـنْ فَوْقَهُـمْ فَقَـالُوا لَـوْ أَنَّـا خَرَقْنَا فِي نَصِيبِنَا خَرْقًا وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَـنَا! فَـإِنْ يَـتْرُكُوهُمْ وَمَـا أَرَادُوا هَلَكُوا جَمِيعًا وَإِنْ أَخَذُوا عَلَى أَيْدِيهِمْ نَجَوْا وَنَجَوْا جَمِـيعًا..: نمونـەی ئەو کەسەی لە سنورەکانی خودا رادەوەستێت و ئەوەی دەکەوێتە ناویەوە، وەك کۆمەڵە کەسێك وایە لەسەر کەشتییەك تیروپشکیان کرد، هەندێکیان سـەرەوەیان بەرکـەوت و هەندێکـیان ژێـرەوە، ئەوانـەی ژێرەوە بۆ ئاوهێنان بەسەر ئەوانــەی ســەرەوەدا تێدەپەڕین، گوتیان ئەگەر لە بەشی خۆمان کونێك بکەینەوە و ئەوانـەی سەرەوە ئەزیەت نەدەین! ئەگەر لێیان بگەڕێن بە ویستی خۆیان بکەن ئەوا لەناو دەچن، ئەگەریش دەستیان بگرن هەموویان رزگار دەبن.)).[٢]

کۆمـەڵ(جماعـة) بەرپرسە لە چاودێریکردنی ئەو بێدەسەڵاتانەی کە لەناویاندایەو بەرپرسـە لـە دەسـتەبەرکردنی بژێویـان و خۆیان و سامانەکەیان دەپارێزێت: ﴿فَأَمَّا الْيَتِـيمَ فَلاَ تَقْهَرْ، وَأَمَّا السَّائِلَ فَلاَ تَنْهَرْ: دەسـا تۆش هەتیو مەڕەنجێنە، دەرۆزەکەر مەتارێنە.﴾الضحى/٩-١٠.

---

١ رواه الخمسة.

٢ البخاري والترمذي.

﴿أَرَأَيْـتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ، فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ، وَلاَ يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ: ئـاخۆ ئـەو كەسەت دیت كە ڕۆژی دوایی بەدرۆ دەزانی، هەر ئەو بوو كە هەتـیوی دەرەنجـاند، هـانی نـان دان بـە هەژارانی نەدەدا.﴾الماعون/١-٣. ﴿وَابْتَلُوا الْيَـتَامَى حَـتَّى إِذَا بَلَغُوا النِّكَاحَ فَإِنْ آنَسْتُمْ مِنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَلاَ تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَنْ يَكْبَرُوا وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ: هەتـیوان تاقی بكەنەوە تا دەبنە گەنجێكی تەواو، جا ئەگەر دیتان چاك و خـراپ لـێك جودا دەكەنەوە، ئەوا ماڵەكانیان بدەنەوە.. لە ترسی ئەوەشدا نەبادا گەورە بن -بەدەر لە ئەندازە و بەلەز- ماڵیان مەخۆن، كێ زەنگینە خۆی بپارێزێ، كێش نەدارە، هەر ئەوەندەی لێ هەڵگرێ كە پێویستی ژیانیەتی.﴾النساء/٦.

لـە فەرمودەشـدا هاتووە: ((مَـنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اثْنَيْنِ فَلْيَذْهَبْ بِثَالِثٍ وَإِنْ أَرْبَعٌ فَخَـامِسٌ أَوْ سَـادِسٌ..: هەركەسـێك خواردنـی دوو كەسـی لایـە بـا بـە سێ كەس بیخۆن.. ئەگەر هی چوار كەسە بە پێنج یان شەش كەس)).[1]

((مَـنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لا ظَهْرَ لَهُ، وَمَنْ كَانَ لَهُ فَضْلٌ مِنْ زَادٍ فَلْـيَعُدْ بِـهِ عَلَـى مَـنْ لا زَادَ لَـهُ..: هەركەسـێك كەل و پەلێكی ناوماڵی زیادەی هەیـە، بـا یارمـەتی كەسـێكی پـێ بدات كە كەلوپەلی نیە، هەركەسێك خۆراكی زیادەی هەیە، با یارمەتی كەسێكی پێ بدات كە خۆراكی نیە)).[2]

بـۆ بەدیهێـنانی بنەمای هاوكاری‌سودخواردن(ربا)ی حەرام كردووە، بەهۆی ئەو ڕق و كیـنەیەی لـەناو كۆمـەڵدا دەیوروژێنێـت.. دەروون لـەوە بـێزارتر نابێت، كە كەسێكی نەدار پەنا بباتە بەر خاوەن سامانێك، ئەویش هەلی ڕەخساو و پێویستیی نـەداریی بقۆزێتەوە و، باجێكی حەرام لەسەر براكەی بەسەپێنێت وەك نرخێكی ئەو پارەیـەی بەقەرز وەری دەگرێت: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَـبَّطُهُ الشَّـيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ: ئـەو كەسانەی سوو دەخۆن، ڕاست بوونەوەیان لەو دونیا، وەك ڕاپەڕینی كەسێكە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ.﴾البقرة/٢٧٥.

---

[1] متفق عليه.

[2] رواه مسلم وابوداود

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِن الرِّبَا إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِن اللَّهِ وَرَسُولِه: ئەی گەلی بڕواداران! لەخوا بترسن و پارێزکار بن، ئەگەر بڕوادارن ئەوا دەست لەو سووەی ماوە هەڵگرن.. ئەگەر وانەکەن، ئەوا ئاگاداری جەنگێك بن لەگەڵ خودا و پێغەمبەرەکەی.﴾البقره/٢٧٨-٢٧٩.

پێویستە سامان بە قەرزی بێ سوو بدرێت بە نەداران، تا لەو ناو کۆمەڵەدا گیانی خۆشەویستی و بەزەیی و، گیانی هاوکاری و یارمەتی بڵاو بێتەوە: ﴿وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ: ئەگەر قەرزارەکە لە تەنگی و نەداریدابوو، ئەوا ماوەی بدەن هەتا بۆی فراوان دەبێت.﴾البقرة/٢٨٠. بۆ ئەوەی لێبوردەیی مۆرکی قەرزدان بێت بەبێ تەنگاو و ماندووکردنی قەرزارەکە، ئا ئەمە شایستەیە بە کۆمەڵی ئادەمیزاد!

هەروەها بۆ بەدیهێنانی ئەم بنەمایە قۆرخ(احتكار)کردنی حەرام کردووە و نەفرینی لە قۆرخکاران کردوە، چونکە ئەوانە هەل دەقۆزنەوە و، قازانجە بێشومارەکەیان لە خوێنی بەکاربەرەکان(مستهك) بەدەست دێنن، جا تووڕەییان دەورووژێنێت و گیانی ڕق و کینە لەناو کۆمەڵدا بڵاو دەکەنەوە و، تۆوی هاوکاری لەناو دەبەن: ((مَنْ احْتَكَرَ فَهُوَ خَاطِئٌ: هەرکەس قۆرخ بکات گوناهبارە))[1].. گزی و سوك کێشان و کەم پێوانیشی حەرام کردوە: ﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ: هاوارە لە سوك فرۆشان، ئەو کەسانەی بە پێوانە شتێ لە مەردم دەسێنن، دەشێ هەموویان پێ بدەن، ئەگەر خۆشیان بۆیان پێوان، یان بە کێشانەیان پێدان، لێی کەم دەکەن.﴾المطففين/١-٣.
((من غشنا فليس منّا: هەرکەس گزیمان لێ بکات لە ئێمە نیە))[2].

حەرامی کردووە کەلوپەلی خەڵك سوك و بێنرخ بکرێت و کەمتر لە شایستەی خۆی پێبدرێت، ئەمەش بە خراپەکاری لەسەر زەوی داناوە: ﴿وَلاَ تَبْخَسُوا النَّاسَ

[1] رواه مسلم وابوداود والترمذي.
[2] مسلم وابوداود والترمذي.

أَشْـيَاءَهُمْ وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ: کەلوپەلی خەڵك بەکەم مەگرن و بەهای خۆیان پێ بدەن و، لەسەر زەویدا خراپەکاری مەکەن.﴾هود:٨٥.

پاشان فەرمان بە مسوڵمانان دەکات، کە هەرهەمویان دەست بە گوریسی خوداوە بگرن و، لەو تەوەرەیەدا بەیەك بگەن و، ئەو ئەلقەیە بگرنە خۆ، جا بەمە هەست دەکەن کە لە خوادا و، لە هاوکاریيان لە پێناویدا و، کۆبونەوەیان لە گوێڕایەڵی ئەودا یەکن: ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا: هەموو لاتان دەست لە ڕشتەی پەیمانی خوا وەرێنن و بڵاو مەبن، بیر لەو چاکە بکەنەوە کە خودا دەربارەی کردن، کە ئێوە دژ بەیەکدی بوون، هۆگری خستنە نێوان دڵەکانتانەوە، لە سایەی چاکەی خوداوە، ئێستا بوونەتە برا، لەسەر لێوی ئاگر بوون، هەر ئەو بوو رزگاری کردن.﴾ال عمران/١٠٣.

﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ: لەسەر چاکە و پارێزکاری هاوکاری یەکدی بکەن، نەك لەسەر تاوان و دوژمنکاری.﴾المائدة/٢.

ئەوەش گرێی گرێیەکانە، پەیوەستی پەیوەستەکانە، کە هەموان لەسەری کۆدەبنەوە و، هەست بەو یەکێتییە دەکەن، کە کۆیان دەکاتەوە، هەست بەو ئەرکە دەکەن کە هانیان دەدات، بێگومان ئەوە خشتێکی بەهاداری بونیاتنانی ئاشتیی کۆمەڵایەتییە.

## ئامانجە بەرزەکانی ژیان

دوای هەموو ئەمانە -یاخود پێش هەموو ئەمانە- ئیسلام ئاشتی لە کۆمەڵگەی ئیسلامی بەدی دێنێت، کە بەجارێك بۆ تاك دەگوازێتەوە و، بۆ کۆمەڵ(جماعة) دەگوازێتەوە، لە جیهانی خودی سنوردارەوە، بەرەو ئاسۆی بەرزتر و فراوانتر لە خود.. زۆر جار ململانێ لەو وزە خەفەکراوە دروست دەبێت، کە بوارێکی دەرچوون نادۆزێتەوە، هەروا لەو بوارە تەسکەی، کە ڕێگە بە بەرزبونەوەی ئەو توانایە نادات.. ئەوە لە کاتێکدا ئاسۆکانی دەرون تەسك دەبێتەوە و، ئامانجەکانی ژیان دەپوکێتەوە و، واقیعی تاکی بچووك، یان واقیعی چینایەتی

سـنوردار، یان واقیعی نەتەوەیی داخراو دەبێتە بواری چالاکی و، بواری کارکردن و، بواری ئەندێشەو بیرکردنەوە..

ئیسـلام دەرك بـە هـەموو ئەمانە دەکات، بۆیە تاك و چین و نەتەوە لە کەلێنی ئامانجە بچـوکە نـزیکەکان دەردەکـات، تا لە بواری ئامانجە هەرەبەرزەکانی ژیانی بەرفـراوان رەهـاو بـەرەڵای بکات.. لە تەنگەبەری ژیانی تاکیی کورت دەریدەکات بـەرەو ئاسمانی ژیانی گشتیی گەورە، لە بواری بۆچوونی چینایەتی، یان نەتەوایەتی تەسکەوە، بۆ ئاسۆ بەرز و گشتگیرەکانی مرۆڤایەتی..

ئـا لـەو کاتـەدا تـاك هەسـت دەکـات بۆ خودی خۆی ناژێت، بەڵکو بۆ هەموو مـرۆڤایەتی دەژێـت.. هـەروا لەو کاتەدا کۆمەڵ هەست دەکات، کە بۆ ئەم نەوەیە ناژێـت، بـەڵکو بـۆ سەرتاسـەری مرۆڤایەتی دەژێت. ئەو کاتە مسوڵمان وا هەست دەکـەن کـە بەرپرسـن لـە زەوی و، جێنشینی خودان، خودی خۆیان موڵکی خۆیان نـیە، کۆششـەکانیان بـۆ خۆیـان نـیە، ژیانـیان هۆکارە و ئامانج نیە.. کەواتە لە کاتـێکدا مەبەسـتە مەزنەکان و ئامانجە گشتگیرەکان چاوەڕوانی هەموانن، کات و بواری ململانێی تاکی، یان چینایەتی، یان نەتەوایەتی بچوکی تەسکی لاواز نیە..

ئیسـلام بـە مسـوڵمانان دەڵێـت: ﴿كُنـتُمْ خَـيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْـرُوفِ وَتَـنْهَوْنَ عَـنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ: ئـێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مرۆڤایەتـیدا سـەرتان هـەڵدا، فـەرمان بەچـاکە دەکەن و ڕێگری لە نارەوا دەکەن، بڕواشـتان بـەخودا هەیـە.﴾ال عمـران/١١٠. پێـیان دەڵێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِـنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْـدًا عَلَـيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ: خـودا گیان و سامانی بڕوادارانی کـڕیوە و لەباتیاندا دەیانخاتە بەهەشتەوە.. بڕوادارانیش ئەوانەن کە لەڕای خوا شەڕ دەکـەن و دەکوژن و دەکوژرێن، لە تەورات و لە ئینجیل و قورئانیشدا بەڵێنی وەها دراوە.﴾التوبة/١١١. پێـیان دەڵێـت: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْـرُوفِ وَيَـنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ: بـا لە ئێوەدا کۆمەڵێك

هەبن، فەرمان بەچاکە بکەن و ڕێگری لە خراپە بکەن.. هەر ئەوانەشن کە ڕزگار دەبن.﴾ال عمران/١٠٤.

بەم شێوەیە ویست و سەرنجیان بەرز دەکاتەوە بەرەو چاکسازیی گەردوونی گشتی، بەرەو ڕزگارکردنی تێکڕای مرۆڤایەتی لە پەرستنی زۆرداران، بەرەو فەرمان کردن بە چاکە و بەرگریکردن لە خراپە، بەرەو بەدیهێنانی چاکسازی مرۆڤایەتی گشتگیر.. بەڵام خودی خۆیان و، سامانەکانیان و، بەرژەوەندییە نزیکەکانیان، هەر هەموویان بە ویستی خۆیان فرۆشتوە، بەڵکو فرۆشتویانە بە چاکتر و بەردەوامتر، ئەوەی لێی کڕیون خودایە..

ئەوان ڕاسپاردراون، کە جیهاد بۆ خوا بکەن، تا وتەی (الله) لە هەرە بەرزیدا بێت، تا زەوی ببێتە ئاشتییەك ئاژاوەی تێدا نەبێت، تا خەڵك ببنە بەندەی خوای تاك و تەنها.. لە پێناوی ئەم مەبەستە مەزنەدا، خودی تاکەکان و بەرژەوەندی و چاوچنۆکی و ئارەزوەکان بایەخیان نامێنێت: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ: لەگەڵیاندا بجەنگن، تا ئاژاوە نەمێنێت و دین هەمووی بۆ خوا دەبێت.﴾الأنفال/٣٩. ((مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ: هەرکەس جیهاد بکات تا وتەی (الله) لە بەرزتریندا بێت، ئا ئەوە لەپێناوی خودایە)).[1] ((هەر کۆمەڵێك واز لە جیهاد لەپێناوی خودا بێنێ، ئەوا خودا سەرشۆڕیان دەکات)).[2]

ئەوان ڕاسپێردراون بە پاراستنی بێدەسەڵاتان و لابردنی ئازار لەسەریان و بەخشینی دڵنیایی پێیان: ﴿وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَـذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا: چیتانە بۆ ناجەنگن لەپێناوی خودا و لەبەر پیاو و ئافرەت و منداڵە بێدەسەڵاتەکان، ئەوانەی دەڵێن: ئەی

---

[1] رواه خمسة.

[2] لە وتەکانی خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکر.

پـەروەردگارمان! لـەم شـارەی کـە خەڵکەکەی ناهەقیکارن رزگارمان کە و، لەلای خۆتەوە یار و یاوەر و سەرخەرێکمان بۆ پەیداکە.﴾النساء/٧٥.

ئـەوان راسـپێردراون کـە خـراپە بگـۆڕن، جـا چ لە فەرمانڕەوا ڕوبدات، یان لە ژێردەسـت، لـە تـاك ڕووبـدات، یـان لـە کۆمەڵ، چونکە ئەوان پێشمەرگەی خوان لەسەر زەوی، بەوان زەوی چاك دەبێت، لەسەریانە خراپەکاری لێ لابەرن: ((مَنْ رَأى مِـنْكُمْ مُـنْكَرًا فَلْيُغَـيِّرْهُ: هەر کەسێکتان خراپەیەکی دیت با بیگۆڕێت))[1]، ئەگەر نا تووشـی کاولکـاری دەبـن و سـزایان لەسـەر پێویست دەبێت: ((إِنَّ الـنَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّـالِمَ فَلَـمْ يَـأْخُذُوا عَلَى يَدَيْـهِ أَوْشَـكَ أَنْ يَعُمَّهُـمُ اللَّـهُ تعالى بِعِقَابِهِ: خەڵك ئەگەر ستەمکاریان بیـنی و دەسـتیان نەگـرت، نـزیکە خوای گەورە بە تێکڕایی سزایان بدات))[2].. ((وَاللَّه لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوف وَلَتَنْهَوُنَّ عَنْ الْمُنْكَرِ وَلَتَأْخُذُنَّ عَلَى يَدَيْ الظَّالِمِ وَلَـتَأْطُرُنَّهُ عَلَى الْحَـقِّ أَطْـرًا وَلَتَقْصُـرُنَّهُ عَلَـى الْحَـقِّ قَصْـرًا أَوْ لَيَضْـرِبَنَّ اللَّـهُ بِقُلُوبِ بَعْضِكُمْ عَلَى بَعْضٍ: سوێند بەخوا! دەبێ فەرمان بە چاکە و، رێگری لە خراپە بکەن و، دەستی ستەمکار بگرن، بۆ هەق ملکەچی بکەن، بەزۆر هەقی پێ ئەنجام نەدەن، ئەگەر نا خودا بەدڵی هەندێکتان لە هەندێکتان دەدات.))[3]

ئیسـلام کاتـێك مسـوڵمان بـەو ئەرکـە بەرزانـە رادەسـپێرێت، دەروون و ئامانجەکانـیان بـەرز دەکاتـەوە و، وزە شـاراوەکانی دەرتەقێنێتەوە بۆ بەکارهێنان لە بـواری مرۆڤایەتی، نەك بواری تاکەکەسی. هیچ گومانی تێدا نیە، کە تەقاندنەوەی ئـەم وزەیە سەرقاڵیان دەکات لە دوژمنایەتیە بچوکەکانی ناو کۆمەڵگە و، ئەو رق و قیـنەی، کە ئارەزو و چاوچنۆکیەکان دەیورووژێنێت. ئەو ئەم ئامانجە هەرە بەرزانە لەلایـەك دادەنێـت و، ئـارەزوو و چاوچـنۆکیەکانیان لەلایـەکی دیکـە، جا هەر لە سـەرەتاوە لەنـێوان هـەردوو لایەکـەدا سەرپشـکیان دەکات: ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْـنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ

---

[1] البخاري

[2] ابوداود والترمذي.

[3] ابوداود والترمذي

كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِن اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ: بڵـێ: ئەگەر باب و کوڕ و برا و ژن و هۆزەکانـتان و، ئـەو سامانەی پەیداتان کردووە و، ئەو بازرگانیەی دەترسن لە بـرەو کـەوێ و، خانوبەرەیەکی بەدڵی خۆتان بێ، لاتان گرنگتر و خۆشەویستتر بێت لـە خـودا و پێغەمـبەرەکەی و جـیهاد لـە پێـناویدا، ئـەوا چـاوەڕوان بن تا خودا فـەرمانی خـۆی دەردەکات، ئەوانەی لەڕێ لادەرن، خودا ڕێنمونیان ناکات.﴾التوبة/٢٤..

ئەوانـە ئەرکەکانی راسپاردنە لەسەر هەموو مرۆڤایەتی، کە خودا کردویەتی بە بەشـی ئـەم ئوممەتـە: ﴿الَّذِيـنَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ: ئەوانـەی وا ئەگەر لەم زەمینە دەسەڵاتدارمان کـردن، نوێـژ دەکـەن و زەکات دەدەن و فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکـەن.﴾الحج/٤١.. ﴿وَكَذَلِـكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُـونَ الرَّسُـولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا: هـەر ئاواش ئێمە ئێوەمان کردوەتە ئوممەتێکی ناوەڕاسـت و هەڵبژاردە، تا ببنە شاهێد و ئاگادار بەسەر خەڵکەوە و، پێغەمبەریش ببێتە شاهێد و چاودێر بەسەر ئێوەوە.﴾البقرە:١٤٣.

ئـەوە ئەرکـێکی خواپەرستییە، کـە هـەموو ژیـان بـە ئاسـۆی هەرەبـەرزەوە دەبەسـتێتەوە: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ، مَا أُرِيدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وَمَا أُرِيـدُ أَنْ يُطْعِمُونِ: هەر بۆیە جنۆکە و مرۆڤم دروست کرد، کە بمپەرستن، من هیچ ڕۆزیم لەوان ناوێت و نامەوێت خۆراکم پێ بدەن.﴾الذاريات:٥٦-٥٧

لە کەشێکی ئاوادا، تاك دەتوانێ خودی خۆی بەدی بێنێت، ویستی بەرزبوونەوە لـە دەروونـی خۆیـدا بەدەسـت بێنێـت، بەبێ ئەوەی ناچاری ململانێ و هەڵچوونی نـاکۆکی بێت، یان ناچاری جەنگێکی ناوەکی و رق و قین بێت.. لەم بوارەدا شوێنی هەموان دەبێتەوە، زەویش فراوانە و دوورە لە شەڕە کەڵەشێر لە پێناوی ژیاندا!

## سیستەمی فەرمانڕەوایی

لەوانـەی رابـرد باسـی ئـەو ویـژدان و هەستانەمان کرد، کە ئیسلام بناغەکانی ئاشـتی نـاو کۆمـەڵگای لەسـەر بنـیات دەنێـت، کە ئەوانەش کۆمەڵە هۆکارێکن گومـان لـەم بابەتـەیدا نـیە و بـواری نکوڵی لێکردنی نیە.. بەڵام ئیسلام بەتەنها پشـت بەوانــە نابەسـتێت و، ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی بەگشتی تەنیا بۆ ئەو هۆکارانــە لێناگەڕێت.. دیدی گشتیی ئیسلام، هەموو کاتێك ئەرکباری(تكليف) و خۆبەخشـی(تطـوع) پـێکەوە کۆدەکاتـەوە، دەستور و ئاڕاستەکردن(توجيه) پێکەوە کۆدەکاتـەوە، کۆمەڵگـە بـەهۆی سیسـتەم و یاسا بەڕێوە دەبات، هەروەك چۆن بە هـاندان و خۆشەویسـت کـردن بەڕێوەی دەبات.. لەبواری ئاشتیی کۆمەڵایەتیشدا، ئیسـلام هـەمان نەریـت دەگرێـتە بـەر، سیسـتەمی فەرمانـڕەوایی و، دابینکاری دادگـەری داوەری و، دابیـنکاری ئاسـایش و سـەلامەتی، لەگەڵ دابینکاری ژیان و هاوسـەنگی کۆمەڵایەتـیی گشتی، هەموویان دەکاتە هۆکاری دامەزراندنی ئاشتی لـەناو کۆمەڵگـەدا، ئەمـەش لـەڕێگای دەسـتوردانان و ڕاهێـنان و بەسـەردا سەپاندنەوە.

سیسـتەمی فەرمانـڕەوایی لـە ئیسـلامدا، دامـەزراندنی پـەیوەندی لەنـێوان سەرپەرشـتیار و بەردەسـتەکان لەسـەر بنەمای ئاشتی و دادگەریی و دڵنیایی دابین دەکـات، لەسـەر ئـەو بـنەمایانە ئاشتی کۆمەڵایەتی بە ڕێك و پێکی و چەسپاوی بنیات دەنێت.

سەرپەرشتیار ناگات بەو پایەیە، تەنها لە یەك ڕێگاوە نەبێت: ئارەزووی ڕەها و هەڵـبژاردنی ئازادانـەی ژێردەسـتەکان، لەو پایەشدا نامێنێتەوە تەنها بە یەك ڕێگا نەبێت؛ گوێڕایەڵی خودا و کارکردن بە دەستورەکەی.

فەرمانڕەوایـیش لەسـەر ڕەزامـەندی و هەڵـبژاردن دادەمەزرێـت، پاش ڕاوێژ و مۆڵـەتدانی خـەڵك، تـەنها بـەوەش حوکـم دەکـات، کە خوا ناردویەتیە خوارەوە. فەرمانڕەوایـیەك، کـە بـڕوا و دڵنیایی لە دەرونەکان و، ڕەزامەندی و ئاسودەیی لە دڵـەکان بڵاو دەکاتەوە، بواری بێزاری و، دڵ پێتەنگ بوون و، هەڵگەڕانەوە بەکەس

نـادات، مـادام بـەو ڕێگایـە هـەنگاو بنێـت کـە ئیسلام نەخشەی کێشاوە و، لەو سنورەدا بێت کە ئیسلام بۆی دیاری کردووە.

جـا کەوایە ڕێگای ئیسلامی لە فەرمانڕەواییدا چیە؟ ئەو ڕێگایە ڕێگای ڕاوێژە؛ ﴿وَأَمْــرُهُمْ شُــورَى بَيْــنَهُمْ: کاروبارییان لەنێو خۆیان بەڕاوێژە.﴾الشوری/٣٨... ﴿وَشَــاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ: لەکاروباردا ڕاوێژیان پێبکە.﴾ال عمران:١٥٩.. ئەگەرچی شـەریعەت ڕێگایـەکی دیاریکـراوی بـۆ ڕاوێـژ دانـەناوە، ئەمـە بەجێهـێڵراوە بۆ پێویسـتی و زەرورەت و، شێوازی ژیانی هەر چەرخێك. بەڵام بنەمای بۆ بڕیاردراوە و، ڕێگـای بـۆ دیاریکـراوە، دەبێ مسوڵمانان لە کاروباری خۆیان بەشدار بکرێن و، لەو کاتەدا بواری ڕق هەڵگرتن نابێت، چونکە خۆیان لە تەگبیر و ڕایەکە بەشدارن.

ئـەی سـنوری ئیسـلامی لـە فەرمانڕەوایـیدا چـییە؟ چـێبەجێکردنی یاسـای ئیسـلامییە، ئـەو یاسـایەی خـودا بۆ تێکڕای بەندەکانی دایڕشتوە، تیایدا ڕەچاوی بـەرز ڕاگرتـنی تاکـێك بەسـەر تاکـێکی دیکـەدا، یان بەرژەوەندی چینێك زیاد لە چـینێکی دیکـە، یـان بەرزڕاگرتـنی کۆمەڵـێك بەسـەر کۆمەڵـێکی دیکـەدا، یان جوداکـردنەوەی فەرمانـڕەوا لـە فەرمان بەسەردادراو، نەکراوە.. هەموویان بەندەی خودان و، شەریعەت یاسای خودایە و هەموویان لە بەرامبەریدا یەکسانن..

گوێـڕایەڵی خـەڵك بـۆ فەرمانـڕەوا پەیوەسـتە بـە پەیڕەوکردنی ئەو دەستورە و جێبەجێکـردنی ئـەو یاسایە، ئەگەر لەوە لایدا، ئەوا گوێڕایەڵی بۆ نیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویـەتی: ((اسْـمَعُوا وَأَطِـيعُوا وَإِنْ اسْتُعْمِلَ حَبَشِيٌّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ مَا أَقَامَ فِـيكُمْ كِـتَابَ اللهِ تعالى: گوێ ڕاگرن و گوێڕایەڵ بن، ئەگەریش بەندەیەکی حەبەشی کـرایە ئـەمیرتان، سـەری وەکـو مـێوژ ڕەش بێ، مادام ئەو بەکتێبی خوای گەورە لەناوتان فەرمانڕەوایی دەکرد)).[1]

جـا گوێـڕایەڵی فەرمانـڕەوا تـەنها بەجێبەجێکردنی کتێبی خودا دەچەسپێت، قورئانـیش بـە ڕاشـکاوی حوکمـی کوفر بەسەر ئەو کەسانەدا دەدات، کە حوکم بە کتێـبی خـودا ناکـەن: ﴿وَمَــنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُم الْكَافِرُونَ: ئەو

[1] صحيح البخاري.

کەسـەی فەرمانـڕەوایی بـەوە نـەکات، کـە خـوا دایـبەزاندووە، ئـەوا ئەوانـە کافرن. ﴾المائدة/٤٤.

بەڕاشـکاوی حوکمـی بێـبڕوایی بەسەر ئەوانەدا دەدا، کە دەیانەوێت یان ڕازین فەرمانـڕەوایی بـە بـێجگە لـە شەریعەتی خوا بکرێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُـمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَـدْ أُمِـرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا: ئەی ئەوانەت نەدیـت، کـە وایان هەڵەبەستووە کە بڕوایان هێناوە بەوەی بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە و بەوانـەش کـە بـەر لـەتۆ نـێردراوە، کەچی دەیانەوێت کێشەیان بەرنە لای تاغوت، ئەگەرچـی فەرمانـیان پـێکراوە کـە حاشـای لیٚبکـەن، دیـارە شەیتان دەیەوێت بە یەکجاری گومڕایان بکات. ﴾النساء/٦٠.

﴿فَـلاَ وَرَبِّـكَ لاَ يُؤْمِـنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا: بەڵام نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت، ئەمانە بڕوا ناهێنن، مەگەر وەختێ کە لە کێشە و هەرای نێوخۆیان بتکەنە دادوەر و لـە دڵەوە بە هەر فەرمانێ تۆ بیدەی ڕازی بن و بەتەواوی ملکەچی بن. ﴾النساء/ ٦٥.

هـەروەها ئیسـلام بـە راشکاوی جیهاد واجب دەکات دژی ئەو کەسەی حوکم بە کتێبی خواناکات و، گوێڕایەڵی مسـوڵمان بۆی، بەڕەهایی حەرام دەکات.

جێبەجێکـردنی ئـەم یاسـا خوداییەی کە خاترانەی کەسی لەلا نیە و، پلەیەکی تایـبەت بـە هـیچ تـاك و چـینێك نـادات، جـا ئـەو تاکـە فەرمانـڕەوا بێت، یان بەرفـەرمان، ئەو چینە دەوڵەمەند بێت، یان هەژار.. زامنی بەدیهێنانی ئاشتییە لە کۆمەڵگادا، چونکە هەموان بۆ بەرژەوەندی گشتی بەڕێوە دەبات.

موحەممـەدی پێغەمـبەری خوداﷺ و گەورەترین فەرمانڕەوای مسوڵمانان، خۆی لـەوە دور دەگـرت کـە هیچی بۆ کەس پێ بکرێ، هەروەك عومەری کوڕی خەتاب دەیگێڕێـتەوە، بـە خـزم و کەس و کارەکەی دەفەرموێ: ((يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَـا اشْـتَرُوا أَنْفُسَـكُمْ لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لَا أُغْنِي

عَـنْكُمْ مِـنْ اللَّهِ شَيْئًا، يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لَا أُغْنِي عَنْكَ مِن اللَّهِ شَيْئًا، وَيَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ لَا أُغْنِي عَنْكِ مِن اللَّهِ شَيْئًا، وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي مَا شِئْتِ مِنْ مَالِي لَا أُغْنِي عَنْكِ مِن اللَّهِ شَيْئًا: ئەی خەڵکی قورەیش، خۆتان بکڕنەوە، مـن نـاتوانم لـەلای خـودا هیچـتان بۆ بکەم.. ئەی نەوەی (عبدالمناف) ناتوانم لەلای خودا هیچتان بۆ بکەم، ئەی عەباسی کوڕی عبدالمطلب، ناتوانم لەلای خـودا هیچـت بـۆ بکـەم، ئەی صفیەی پوری پێغەمبەری خوا، ناتوانم لەلای خودا هیچـت بۆ بکەم، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد، لە سەروەت و سامانم چیت دەوێ داوا بکە، ناتوانم لەلای خودا هیچت بۆ بکەم))[1].

ئەبوبەکـر، جێنشـینی یەکـەم و هـاوەڵی پێغەمـبەری خـواﷺ، پاش بەیعەت پێدانی هەڵدەستێتەوە و دەڵێت: ((خەڵکینە! من کرامە ئەمیری ئێوە و چاکترینتان نـیم، ئەگـەر چـاکم کـرد پشـتیوانم بن، ئەگەر هەڵەم کرد ڕاستم کەنەوە))... هەتا وتـی: ((گوێـڕایەڵم بـن هەتا ئەو کاتەی گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەی دەکەم، ئەگـەر سەرپێچی خودا و پێغەمبەرەکەیم کرد، لەسەرتان نیە گوێڕایەڵم بن)).. ئاوا بڕیار لەسەر مەزنترین بنەمای ئیسلامی لە فەرمانڕەوایی و سنورەکانی دەدات.

ئـەم سیسـتەمە ئیسـلامییە ڕاسـتڕەوی سەرپەرشـتیاران و ڕەزامـەندی بەرفـەرمانان(رعیة) و، بـڕیاردانی ئاشـتی لەنێوانـیان و توندوتۆڵ کردنی دەگرێتە ئەسـتۆ، بـە زۆری زۆرداری نـا، بـە سـەرکوتکردن و زۆر لـێکردن نا، بە دڵڕەقی و کەڵەگایـەتی نـا، بـە تـرس و سەرشـۆڕی نا، بەڵکو بە ڕەزامەندی و قەبوڵکردن و گوێڕایەڵـیەکی هـەڵقوڵاو لـە نـاخی دەروونـەوە، بـەبێ مـەرایی و دووڕوویـی و دەرخستنێکی درۆزنانە.

ئـەوە هۆکارێکـە لـە هۆکارەکـانی جێگیری و ئارامی، هیچ هۆکارێکی دیکەی باشـتر یـان هاوتـای نـیە، ئـەوە ئەڵقەیەکە لە ئەڵقەکانی ئاشتیی گشتگیر، لەیەك زنجـیرەی یەکگـرتوودانە و ، لـە بیرۆکە هەرە گەورەکانی ئیسلام بۆ ژیان لێك جودا نابنەوە..

---

[1] متفق علیە.

## دابینکاریەکانی دادگەریی یاسایی

فەرمانڕەوایی ئیسلامی دادوەرییەکەی پێش هەموو شتێك لە دادوەریی خودی یاساکەوە وەرگرتووە، ئەو یاسایە-وەك پێشتر وتمان- لە دەستکردی تاك نیە، لە دەستکردی کۆمەڵێکیش نیە، تا گومانی پێببرێت و، ترسی ئەوەی هەبێت بەپێی ئارەزوو دابنرێت، یاخود بە هەڵە دابنرێت و، بەدیهێنانی دادوەریی ڕەهای لەدەست بچێت.

بەڵام لەکاتی جێبەجێکردندا، ئیسلام ئەوەی بە ڕوونی یاساکە و ویژدانی داوەر و چاودێری کۆمەڵ پەیوەست کردوە، ئەو چاودێرییە لەسەر شانی هەموو تاکێکە لە کۆمەڵی ئیسلامیدا، لەسەریەتی ستەم لەکاتی ڕوودانی لابەرێت، کاتێك فەرمانڕەوا لە سنور دەرچوو هۆشیاری بکاتەوە، کاتێك داوەر هەڵەدەکات هۆشیاری بکاتەوە، گوناهبارە کاتێك شاهێدیەك دەشارێتەوە، یان کاتێك بڕیار لەسەر هەڵەیەك دەدات، کە دەیبینێت و هۆشیاریی نادات.

ئەو دادگەرییەی ئیسلام داخوازیەتی، دادگەرییەکی ڕەهایە و خۆشەویستی و ڕق لێبوونەوە کاری تێناکات، سامان و پایە و فەرمانڕەواییش کاری تێناکات.. جا ئایەتەکانی دادگەریی لە قورئاندا توند و یەکجارەکی و یەکلاکەرەوەیە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِنْ يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَاللَّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلاَ تَتَّبِعُوا الْهَوَى أَنْ تَعْدِلُوا وَإِنْ تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا: ئەی گەلی بڕواداران! بە یەکسانی و بێجیاوازی کاری خەڵك ڕاپەڕێنن، بۆ خودا شایەتی بدەن، ئەگەریش لەسەر خۆتان یان دایك و باوکتان یا خزمانتان بێ، ئەوەی شایەتی بۆ دەدەن دەوڵەمەند بێت یاخود هەژار، خودا بۆ ئەوان نێزیکترە، مەکەونە شوێن ئارەزووتان و لەڕێگە لابدەن، ئەگەر زمانتان خوار بکەنەوە، یاخود خۆتان لە شاهێدی بدزنەوە، خودا هەمیشە ئاگادارە لە هەرکارێ ئێوە دەیکەن.﴾النساء/١٣٥.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ: ئەی

گەلی بڕواداران! بۆ خوا ڕاست و بێخەوش بن و بە هەقانەت شایەدی بدەن، دوژمنایەتی و قینی دەستەیەك هەڵتان نەبێ بە هەقانەت ڕەفتار نەکەن، بە یەکسانی و بێجیاوازی لەگەڵ خەڵکا ڕەفتار کردن دەبێتە هۆی پتر نزیك بوونەوە لە پارێزکاری، ترسیشتان لەخودا هەبێ، چونکە لە هەرکارێ ئێوە دەیکەن ئاگادارە. ﴾المائده/٨.

﴿وَلاَ تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَبِعَهْدِ اللَّهِ أَوْفُوا ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ: خۆتان لە قەرەی ماڵی هەتیو مەدەن، مەگەر بە چەشنێ کە باشتر بێ، تا کاتێ کە خۆی پێدەگا.. با پێوانە و تەرازوشتان بەرامبەر بێ و کەم و کوڕی تێدا نەبێ.. ئێمە هیچ ئەرکێکی لەتوانابەدەر ناخەینە سەر کەس.. کاتێ قسە دەکەن-بۆ ناوبژی یان شایەتی دان-دادوەریتان لەبەر چاو بێ، جا با لەسەر خزمی خۆشتان بێت.. پەیمانی خوداش بە تەواویی بەجێبێنن.. خوا ئەمانەی بەئێوە ڕاسپاردووە، بەڵکو هەردەم لەبیرتان بێ. ﴾الانعام/١٥٢:

﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ: ئەگەر داوەریت کرد، بەیەکسانی کێشەکەیان بۆ یێك بهێنە، خودا کەسانی ڕاست و ڕەوا و داوەری خۆش دەوێ. ﴾المائدة/٤٢.

﴿فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنْتُ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لأَعْدِلَ بَيْنَكُمْ: سا بۆ ئەمە بانگەشەی خەڵك بکە و ڕاستڕەو بە هەروەك فەرمانت پێکراوە، شوێن ئارەزوەکانیان مەکەوە.. بڵێ بڕوام هێنا بەو کتێبانەی خودا ناردویەتە خوارێ، فەرمانم پێدراوە بە دادگەریی کاروبارتان ڕاپەڕێنم. ﴾الشوری/١٥.

﴿وَلاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالإِثْمِ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ: ماڵی یەکتر بەناڕەوا مەخۆن، مەیشی دەن بە

کاربەدەســتان تا بەناڕەوا و بە ئاگاداری خۆتان بەشێك لەماڵی خەڵك بخۆن.﴾البقرە/ ۱۸۸.

لــە فەرمودەشــدا هــاتووە: ((إِنَّ أَحَبَّ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَقْرَبَهُمْ مِنْهُ مَجْلِسًا إِمَـامٌ عَـادِلٌ، وَإِنَّ أَبْغَـضَ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَبعدهُمْ مِنْهُ مَجْلِسًا إِمَـامٌ جَائِـرٌ: خۆشەویستترین کەس لای خودا لە ڕۆژی دوایی و لەهەموویان نێزیکتر لەخودا، پێشەوا و سەرۆکی دادوەرە، بێزراوترین کەس لای خودا لەڕۆژی قیامەت و لە هەموویان دوورتر لە خودا، پێشەوا و سەرۆکی زۆردارە.)).[1]

مــێژووی ئیســلام نمونــەی بێشــوماری لەســەر دادوەری رەها هەیە، کە حوکمی ئیســلامی وەدیهێــناوە، هەتا لەو ڕۆژانەشدا، کە (جێنشینەکان!) لە ڕێنماییەکانی ئیســلام لایاندا، بەڵام ویژدانی دادوەرەکان و وریایی کۆمەڵ وەك پارێزەری دادوەری هــەر مــابوو، ئەگــەر نــەرمی بــنواندبا، یــان گزیی کردبا، یان لە زوڵم و زۆرداریی بێدەنگ با، دەسەڵاتەکانیان لە ترسی خودا و ترسان لە تووڕەبوونی وەردەگرت.

لــێرەدا بــواری ئــەوە نیە لەسەر دادوەری لە ئیسلامدا بدوێین، بۆیە بە دوو نمونە لەو نمونە زۆرانەی مێژوو وازدەهێنین:

(عەلی) قەڵغانەکەی خۆی لەلای پیاوێکی گاور(نصرانی) بینی، کابرای هێنا بۆ لای (شــورەیحی قازی) و وتی: ئەوە قەڵغانی منە، نە فرۆشتومە و نە بەخشیومە.. (شــورەیح) لە گاورەکەی پرسی: چی دەڵێی دەربارەی ئەوەی ئەمیری بڕواداران وتی؟ نەصــرانیەکە وتی: قەڵغانەکە قەڵغانی خۆمە، ئەگەریش وا نازانم ئەمیری بڕواداران درۆزن بێــت.. (شورەیح) ئاوڕی لە (عەلی) دایەوە و پرسیاری لێکرد: ئەی ئەمیری بــڕواداران! هــیچ بەڵگەیەکت هەیە؟ (عەلی) پێکەنی و وتی: شورەیح پێکای، هیچ بەڵگەیەکم نیە!

بــەم شــێوەیە قازی قەڵغانەکەی دایەوە نەصرانیەکە و، ئەویش بردی و ڕۆشت.. پــیاوەکە تــەنها چەند هەنگاوێکی نا و گەڕایەوە و وتی: ئێستا شایەدی دەدەم، کە ئەمــە لــە حوکمی پێغەمبەرانە.. ئەمیری بڕواداران لای قازییەکەی سکاڵام لەسەر

[1] أخرجه الترمذي.

دەکـات و قازییەکەشی حوکم بەسەر ئەودا دەدات! (أشهد ان لا اله الا الله، وأشهد أن محمداً عـبده ورسـوله)، ئەی ئەمیری بڕواداران! قەڵغانەکە هۆی خۆتە، ئەوکاتەی لـە (صفین) بەڕێکەوتیت، شوێن سوپاکەت کەوتم و لەسەر پشتی حوشترە بۆرەکەت دەرم کرد.. (عەلی) وتی: بەڵام ئەگەر مسوڵمان بیت ئەوا بۆ خۆت.

(ئـەبو یوسـف) دانیشت بۆ داوەریکردن، پیاوێك ناکۆکییەکەی لەگەڵ (هادی)ی پاشـای عەبباسـی لەسـەر بێستان هێنایە بەردەستی، (ئەبو یوسف) رای وابوو، کە هـەقی پـیاوەکەیە، ئەگەرچـی پاشـا شاهێدیشـی هەبوو.. بۆیە وتی: پیاوەکە داوا دەکـات (هـادی) سـوێند بخـوات لەسەر راستیی شاهێدەکانی!.. لێرەدا (هادی) لە سـوێندخواردن پاشەکشـەی کرد-چونکە وایدەزانی کە سوکایەتییە بۆ ئەو-، (ئەبو یوسف)یش بێستانەکەی گەڕاندەوە بۆ خاوەنەکەی.

کاتـێك تاکـەکان لـە کۆمـەڵگادا دڵنـیا دەبـن، کـە ئەو یاسایەی پێی داوەری دەکـرێن دانراوی خودای دادوەریانە و، ئەو فەرمانڕەوایەی کاروباریان بەڕێوە دەبات مـافی لـەوان زیاتری نیە ، ئەویش وەك ئەوان ملکەچی ئەو یاسایەیە، ئەو قازی و داوەرەی کاروبـاری داوەری بەدەسـتە، حوکمەکەی لە ئارەزووەوە دەرناکات، بەڵکو لـە یاسـای خـودا و ترسـان لـەخوداوە دەریدەکـات.. ئەو کاتە دەروونەکانیان دڵنیا دەبێـت و ئـارام دەگرێـت، ئاشـتیی کۆمەڵایەتـیش لەسـەر یەکـێك لـە کۆڵەگـە دروسـتەکانی دروسـت دەبێـت، کۆڵەگـەی دابیـنکاری دادگـەر لە فەرمانڕەوایی و داوەریدا.

## دەستەبەری ئاسایش و سەلامەتی

ناکرێـت ئاشـتی لـە کۆمەڵێکدا جێگیر بێت، کە ئاسایشی گشتیی تیادا نەبێت و، سـەلامەتی بـۆ هـەموو تاکـەکان دابـین نەکرابێـت.. پێشـتر لەباسـی (ئاشـتی ویـژدان)دا وتمـان، کە ئیسلام لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ئاسایش و سەلامەتی بۆ تاك دابین دەکات، تا لەوەوە ئاشتی لە ویژدان و بیرکردنەوەیدا بڵاوبکاتەوە.

ئەم ئاسایش و سەلامەتییە دابینکاری کۆمەڵگاشە، لە ئیسلامدا تاك و کۆمەڵ دوژمـنی یەکدی و پێچەوانەی یەکدی نین، بەڵکو یەك شانە(خلیة)ن لە دوو وێنەدا،

تـاك وەكـو تـاك و، تـاك بـە هاوبەشـی لـە كۆمـەڵدا.. ئـەم وێنەیە لە سروشتی ئیسلامەوە دروست بووە و، دەرهێنانی دەستور و شەریعەتەكەی لە خوداوەیە، نەك لـە ئادەمیزاد. لە ئیسلامدا تاك دەستور بۆ كۆمەڵ دانانێت، كۆمەڵیش دەستور بۆ تـاك دانانێـت، بـەڵكو تـاك و كۆمـەڵ ملكەچی ئەو یاسا خوداییەیە، كە ڕەچاوی هەموویان دەكات..

كاتـێك ئـەو راسـتییە بڕیار دەدرێت، ئاسایشی تایبەتیی تاك دەبێتە ئاسایشی گشـتیی كۆمەڵـە، ئاسایشـی گشـتیی كۆمەڵیش ئاسایشی تاكە، بەبێ دژیەكی و بەش بەش بون لەنێوانیاندا.

هـەموو تاكـێكی ڕێـك و پـێك بـەرژەوەندی راسـتەوخۆی لە ئاسایشی گشتیی كۆمـەڵدا هەیـە، جـا ئـەم ئاسایشـە سـەركوتی ناكـات و، لەسـەر حیسـابی ئەو دانامەزرێـت و، لـە ئامانجـێكی چـاكدا، یـان لە مەبەستێكی ڕێپێدراودا دژایەتی ناكـات.. كۆمـەڵ كاتێك ڕۆڵی خۆی بە تەواوی دەبینێت، كە هەریەك لە تاكەكانی لـە ئاسـایش و سەلامەتی و خۆشیدا بن، هیچ بەرژەوەندیەكی لە سەركوتكردنیان، یان ستەم لێكردنیان، یان ڕێگرتن لە چالاكیەكانیاندا نیە.

بـەڵام ئـەو ڕێـزپەڕانەی فیترەتـیان لاڕێ بوە، بەو وەسفە وەسف ناكرێن، چونكە ئەوانـە بـە یاسـایەك ڕێچـكەیان شكان، كە تاك بۆ بەرژەوەندی خۆی دایناوە، یان چـینێك بۆ سودی خۆی دایناوە، هەروەك حاڵی یاسای زەوی. ئەوانە لە ملكەچی بۆ خـودا و فەرمانـەكانی دەرچـوون، كـە بۆ ئەوانەی فیترەت ساغن دانراوە، هاوڕێكە لەگەڵـیان، چ وەك تـاك و چ وەك ئـەندامی كۆمەڵـێك، بەرژەوەندیەكـەیان دابـین دەكات.. ئەگەر سزادران، ئەوا بەناوی تاكێك یان بەناوی كۆمەڵێكەوە سزا نادرێن، بـەڵكو بـەناوی خـودا و بـە یاسـای خودا سزا دەدرێن، سزادانەكەیان تۆڵەیەك نیە لەسـەر دەسـتی كۆمەڵ ئەنجام بدرێت، لەبەر ئەوەی لەو بەرژەوەندیانە دەرچووە، كە بۆ خۆی بڕیاری داوە، بەڵكو بۆ بەدیهێنانی وتەی خودایە و، بۆ چاكسازی گشتییە، كـە خـودا دەیەوێـت.. ئـەو سـزایە هەرچـەند توندوتـیژ بێـت، هـیچ مانایـەكی تۆڵەسـەندنەوەی تێدا نیە.. خوای گەورە لە دارشتنی دەستور و شەریعەتدا داكۆكی

لـە بەرژەوەندیـیـەکی تایـبەتی خـۆی ناکات، بەڵکو چاکسازی گشتیی بۆ بەندەکان دەوێـت، دەیەوێـت هۆکارەکـانی خـراپەکاری لابـبات، کـە رێگـرن لەپـێش ئـەو چاکسـازییە گشـتییە، بـەبێ ڕەچـاوکردنی بـەرژەوەندی تایـبەت یان ئارەزوویەکی شاراوە!

جـا لەژێـر سـایەی ئـەم بیرۆکەیـەدا، ئـەو دابیـنکاریانەی خودا لەسەر هەموو خـەڵکی پێویسـت کـردووە و، ئـەو سـزایانەی لـە زەویـدا وەبـەر خراپەکارەکانیان دەکەوێت، بەهۆی لادانیان لە فەرمانی خودا، کە دەیانگەیەنێتە چاکەی گشتی.

یەکەمیـنی ئـەو دابیـنکاریانە، دابینکاری ژیانە: ﴿وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّـهُ إِلاَّ بِـالْحَقِّ: کەسێ مەکوژن کە خودا کوشتنی حەرام کردووە، مەگین لەڕوی هەقەوە بێ.﴾الأنعام/١٥١.

هـەر کەسـێکیش وەکـو کەسـەکان، ئـەو مافـە ڕەهایەی هەیە، مەگەر بەهۆی خەمـێکەوە بێـت، کوشـتنی یـەک کـەس وەکو کوشتنی هەموو خەڵك وایە، لەبەر ئـەوەی دەسـترێژی کردنە بۆ سەر مافی ژیان لەخودی ئەو کەسەدا، بەچاوپۆشین لەو کەسـەی ئەو مافەی هەڵگرتووە. شەریعەت و دەستوری بەردەوامی خودا لە هەموو سـەردەمێکدا ئەم بنەمایەی تێدایە: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَنْ قَـتَلَ نَفْسًـا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا: لەپێناوی ئەوەدا لەسەر بەرەی ئیسرائیلمان فەرزکرد، کە هەرکەسـێ کەسـێکی دیکـە بکـوژێ، بـەبێ ئـەوەی کەسـێکی کوشـتبێ یـان خـراپەکاریەکی لـە زەویـدا کـردبێ، وەك ئەوەیە کە گشت خەڵکی سەرزەوی لەناو بـردبێ، هەرکەسـێکیش کەسـێك رزگار بکات و زیندوی بکاتەوە، وەك ئەوەیە کە هەموو خەڵکی لە مردن رزگار کردبێ.﴾المائدة/٣٢.

﴿وَمَـنْ يَقْـتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَـدَّ لَـهُ عَذَابًا عَظِيمًا: هەرکەسێك هەر بە ئانقەست بڕوادارێك بکوژێت، لەبری ئەوە تاهەتایە هەر لە دۆزەخ بە نەمری دەمێنێتەوە و، خودا لێی توڕەیە و نەفرینی لێکردووە و ئازاردانێکی دژواری بۆ داناوە.﴾النساء/٩٣.

ئیسلام دەستەبەری ئەم جۆرە مافە بنچینەییە تەنها بۆ ویژدان و ئاگادارکردنەوە لــە سزای قیامەت لیّ‌ناگەڕێت، بەڵکو دەستەبەری یاسایی، بە دەق و وردەکارییەوە بـۆ داناوە، بڕیاری تۆڵەی داوە لەکاتی ئەنقەست و، خوێن دانیش لەکاتی هەڵەدا و، تۆڵەشـی بـە هاوتـای ئەو دەستدرێژییە داناوە، کە کراوەتە سەر ژیان. جا ئەگەر دەســتدرێژییەکە بگاتــە ئاســتی کوشتن، ئەوا تۆڵەی کوشتنە، ئەگەریش لە سنوری بریندارکردن وەستا، ئەوا تۆڵەکەش وەك ئەوە و بەپێی ئەوەیە:

﴿يَاأَيُّهَـــا الَّذِيـــنَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەمەڕ ئەوانەی کوژراون تۆڵەمان بۆ بڕیارداون.﴾البقرة/١٧٨.

﴿وَلَكُـــمْ فِـــي الْقِصَـــاصِ حَيَاةٌ يَاأُوْلِي الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ: ئـەی خاوەن دڵە هۆشـیارەکان، تۆڵەسـەندنەوە مایـەی ژیانـە بۆ ئێوە، بەڵکو پارێزکار بن.﴾البقرة/ ١٧٩.

﴿وَكَتَبْـــنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِـــالأُذُنِ وَالسِّـــنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ: لــە تەوراتدا بۆ ئەوانە بڕیارماندا، کە گیانـێك لەباتی گیانێك، چاو بە چاو و، لوت بە لوت، گوێ بەگوێ و، ددان لەباتی ددانە و، برینیش تۆڵەی هەیە..﴾المائدە/٤٥.

((مَـنْ قَـتَلَ عَـبْدَهُ قَتَلْـنَاهُ وَمَـنْ جَدَعَ عَـبْدَهُ جَدَعْـنَاهُ: ئەو کەسەی بەندەی خۆی بکوژێت دەیکوژینەوە، هەرکەس لوتی بەندەی خۆی ببڕێت لوتی دەبڕینەوە)).[1]

﴿وَمَـــنْ قُـــتِلَ مَظْلُومًـــا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلاَ يُسْرِفْ فِي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنصُـــورًا: هەرکەسێ بەناهەقی بکوژرێت، دەسەڵاتمان داوەتە دەست خوێنگرەکەی، ناشێ لە تۆڵەسەندنا هەڵەڕۆیێ و لەو بارەوە ئاریکاری بۆ کراوە.﴾الإسراء/٣٣.

﴿وَمَـــا كَـــانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلاَّ خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَـــتَحْرِيرُ رَقَـــبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيـــرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ

---

[1] رواه الخمسة.

عَلِيمًا حَكِيمًا: هیچ بڕوادارێك بۆی نیه بڕوادارێكی دیكه بكوژێ، مەگەر بە هەڵە بێ، هەركەسێكیش بڕوادارێك بە هەڵە بكوژێت، دەبێ لەبری ئەو كوشتنە كۆیلەیەكی بڕوادار ئازاد بكات و خوێنبایيش بدا بە كەس وكارەكەی، مەگەر بیبەخشن.. ئەگەریش كوژراوەكە لە هۆزێكی دوژمنان بوو و بڕوادار بوو، ئەوا لەسەریەتی كۆیلەیەك بڕوادار ئازاد بكات.. ئەگەر لە هۆزێك بوو كە پەیمانتان لەنێواندا هەبوو، دەبێ خوێنبایيەكەی بدرێ بە كەس وكارەكەی و بەندەیەكی بڕوادار ئازاد بكرێ.. هەركەسێ ئەو كارەی لەدەست قەوماوە و ناتوانێ بەندەیەك ئازاد بكا، ئەوا لەسەریەتی دوو مانگ لەسەریەك بەرۆژوو بێت، هەتا خودا تەوبەی لێ قەبوڵ بكا، خودا زانای كارزانە.﴾النساء/٩٢.

دوابەدوای دەستەبەری ژیان، دابینكاری ناموس و سامان دێت:

((كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ: هەموو شتێكی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان حەرامە، خوێن و ناموس و سامانی)).[1]

بۆ دەستەبەری خوێن، ئەوە باسمان كردوە، دەستەبەری ناموسیش، سزاكانی زینا و بوختان هەڵبەستن لەخۆی دەگرێت: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلاَ تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ: ئەگەر بڕواتان بەخودا و ڕۆژی دوایی هەیە، زیناكەری ژن و پیاو، هەریەكەی سەد جەلدەیان لێبدەن و، لە ئایینی خوادا بەزەیی هاتن بەوانە بێجێیە، با چەند كەسێكیش لە بڕواداران ئاگاداری ئەو لێدانە بن.﴾النور/٢.

﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ: ئەوكەسانەی بوختان بۆ ژنی داوێن پاك هەڵدەبەستن و، چوار شایەتیش ناهێنن، هەشتا جەلدەیان لێبدەن و، هەرگیز شایەتییان لێ قەبوڵ مەكەن، ئەوانە لەرێیخودا لایانداوە.﴾النور/٤.

[1] رواه الستة الا النسائي.

بـەڵام دەسـتەبەری سـامان-ئـەو سـامانەی حەڵاڵـە و لەو ڕێگایانەوە وەدەست هێـنراوە، کە ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە، بەبێ فێڵ و سو و قۆرخ(احتکار) کردن و دزی و تالان و لێسەندن و هاوشێوەکانی- سزادانی دز بەبێ ناچاری دابینی دەکات: ﴿وَالسَّـــارِقُ وَالسَّـــارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِن اللهِ وَاللهُ عَزِيزٌ حَكِـــيمٌ: هەرکەسـێکی دزی بکـا-نێر بێ یان مێ- لە سزای دزیکردنەکەدا دەبێ هـەردوو دەسـتیان بـبڕن، ئەمــە تەمبێکردنـێکە لەخواوە، خودا خاوەن دەسەڵاتی کارزانە. ﴾المائدة/٣٨.

دوابـەدوای دەسـتەبەری گیان و ناموس و سامان: شکۆمەندی و پیرۆزی شوێنی نیشـتەجێبوون دێـت، چـونکە چـونە ژوورەوە بـۆ ماڵی کەس، بەبێ مۆڵەتی خۆی نابێـت. نابـێ کـەس لـە پەنجەرەوە یان بەسەر دیواردا لێی بچێتە ژوورەوە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَـــيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلاَ تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُم وَإِنْ قِـــيلَ لَكُم ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ: ئـەی گەلی بـڕواداران! جـیا لـەوە ماڵی خۆتان بێ، سەر بە هیچ ماڵێکدا مەکەن، هەتا ئیزنێ نـەخوازن و سـڵاو لـە خەڵکەکـەی نەکـەن، ئەمە بۆ ئێوە باشترە، بەڵکو پەندی لێ وەرگـرن.. ئەگـەر کەسـتان تـیادا نەدیـت، مەچـنە ژووری هـەتا خـاوەنی ئیزنتان پێنـەدا. ئەگـەر گوتیشیان بگەڕێنەوە، پێویستە بگەڕێنەوە، ئەمە بۆ ئێوە باشترە، خودا لەهەر کارێ دەیکەن ئاگادارە. ﴾النور/٢٧-٢٨.

پاشـان ئـازادی کەسـێتی بـۆ دابـین دەکرێـت و چـاودێری و سـیخوڕی بەسەردا ناکرێت: ﴿وَلاَ تَجَسَّسُوا: سیخوڕی مەکەن. ﴾الحجرات/١٢..

هــەروا دەسـتەبەری دڵنـیایی لە پاشمله قسەپێوتن: ﴿وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا: لەپاشملە خراپەی یەکدی مەڵێن. ﴾الحجرات/١٢.

هــەروا لەبــەردەم خـەڵکدا ڕێـز و کەرامەتی ناشکێنرێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ يَسْـــخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلاَ نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَـــيْرًا مِـــنْهُنَّ وَلاَ تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ: ئـەی گـەلی بڕواداران! با

هەندێکـتان گاڵـتە بـە هێندێکتان نەکەن، لەوانەیە ئەوانەی گاڵتەیان پێدەکەن، لە گاڵـتەکەرەکان باشـتر بن، ژنانیش هەروا، لەوانەیە ئەوانەی دەبنە گاڵتەجاڕ، لەوی گاڵـتەیان پێدەکـەن پەسـندتر بـن، لـە سیلەی چاوداگرتن و تەشەر لەیەك گرتن و ناوو ناتۆرە لێك هەڵدان دەس هەڵگرن.﴾الحجرات/١١.

قورئـان باسـی سـزای ئەو دەستدرێژیانەی نەکردووە، بەڵام شەریعەتی ئیسلامی بـڕیاری سەرزەنشـت کـردن(تعزیـر)ی داوە، سەرزەنشـتیش چـەند سزایەکە لەخوار (حـەد)ەکانەوەیـە، کـە بۆ دەستورە لاوەکیەکان جێهێڵراوە و، قازی بەپێی بارودۆخ حوکمی تیادەدات.

بـەڵام ئـەو چـەتانەی بەکۆمـەڵ خراپەکاری لە زەویدا بەرپا دەکەن و، کۆمەڵێك تـاوان پـێکەوە ئەنجام دەدەن، ئیسلام دڵنیابوون لەوانە بۆ کۆمەڵی مسوڵمانان دابین دەکات بە بڕیاردانی سزای توندوتیژ بەسەریاندا، سزای وا، کە شایستەی تاکێك نیە لەسـەر تاوانـێك بەتـەنها کردبێـتی، بەڵام ترسناکیی کۆبوونەوە لەسەر خراپەکاری تایـبەتە و سـزایەکی تایـبەتی دەوێـت: ﴿إِنَّمَـا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْـعَوْنَ فِـي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِـلاَفٍ أَوْ يُـنفَوْا مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِـيمٌ: بـێگومان سـزای ئەوانـەی دژایەتی خودا و پێغەمبەری دەکەن، لە زەویدا خراپەکاری دەکەن، کوژرانە یان لەداردانە یان بڕینی دەست و قاچە بەپێچەوانە، یان لـە وڵات دوورخـرانە، کـە ئـەم سـزایە بـۆ ئـەوان ریسـوابوونە لە دنیا و لە ڕۆژی دواییشدا ئازارێکی بەژانیان بۆ هەیە.﴾المائدة/٣٣.

پاشـان دابیـنکاریی تاوانـبارکردن هەیە، لەو بوارەشدا مەزنترین بایەخی هەیە، پێویسـتە خەڵك لە تاوانبارکردنی ناڕەوا دڵنیا بن، بەهۆی گومان، یان هەڵبەستنی بەڵگـەی بێیەقین تاوانبار نەکرێن.. لەم ڕووەوە ئیسلام بناغەیەکی پتەو دادەڕێژێت، کـە زۆر بـە ئاسـانی لەسـەر ئـەو بناغەیە لێکۆڵینەوەی تاوانەکان دەکرێت، لەگەڵ ئەوپەڕی دابینکاری بۆ ڕاست و دروستی ڕەفتارەکان.

بــنەمای سەرەکیشــی ئەوەیــە، کە کەس بەگومانێك تاوانبار نەکرێت، پێویستە شـایەتەکە دادوەر بێـت و، بەڵگەکـەی ڕوون بێـت، گومانـیش ڕێگـری لە سزادان دەکـات.. ئەمــەش بەپێی فەرمودەی خوا گەورە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِــنَ الظَّــنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلاَ تَجَسَّسُوا: ئـەی گەلی بڕواداران! لە زۆرێك لە گومانــان خۆ بپارێزن، چونکە هێندێك گومانی وا هەن گوناهن، هەروا لە کاروباری یەکتر مەکۆڵنەوە.﴾الحجرات/١٢.

﴿يَاأَيُّهَــا الَّذِيــنَ آمَــنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ: ئەی گەلی بڕواداران! هەرکاتێك لە فەرمان لادەرێك دەنـگ وباسـێکتان بـۆ دەهێنێـت، بـە وردی لێ وردبنەوە، نەکا لە ڕوی نەزانیەوە گەلێکان تووشی زیان بکەن و لەکردەتان پەشیوان بن.﴾الحجرات/٦.

پێغەمـبەریشﷺ دەفەرموێـت: ((أدرءوا الْحُدُودِ بِالشُّبُهَاتِ: بەهۆی گومانەوە خۆتان لە سزادان ڕزگار بکەن.))[١]

بینـیمان کـە سزای زینا پێویستی بە چوار شاهێدی ڕاستگۆ هەیە، ئەو کەسەی ئافرەتـێکی داوێـن پـاك بـە زیـنا تاوانبار دەکات و چوار شاهێد ناهێنێت، هەشتا جەلدەی لێ دەدرێت.

بـەڵام دان پـیانان(اعتراف)، ئیسلام بە بەڵگەی دادەنێت، ئەگەر گومانی لەسەر نەبێـت، کـە بەوە دەگەڕێتەوە سەر بنەماکەی پێشو. ئەوەتا (ماعزی کوڕی مالك) دێـتە لای پێغەمــبەرﷺ و داوای لێدەکـات حـەددی لێ دەربکـات و دان بــەوەدا دەنێـت، کـە زینای کردوە، پێغەمبەریشﷺ دانپیانانەکەی قەبوڵ نەکرد هەتا لێی دڵنـیابوو.. ئەوەبوو سێجار ڕەتی کردەوە و ئەویش دەگەڕایەوە و دانی پیا دەنا، لە چـوارەم جـار پێغەمبەرﷺ پرسیاری کرد: ئایا ئەوە شێتە؟ هەواڵیان پێدا کە شێت نـیە. فـەرمووی: ئـارەقی خواردوەتـەوە؟ پیاوێك هەستا و بۆنی دەمی کرد و هیچ بۆنی ئارەقی نەکرد.. پێغەمبەرﷺ لێی پرسی: ئایا زینات کردووە؟ وتی: بەڵێ..[٢]

---

[١] في مسند ابي الحنيفة للحارثي.
[٢] عن بريدة وقال صاحب مصابيح السنة انه من الصحاح.

جـا تـەنها لـێرەدا حەددی لەسەر جێبەجێ کرد، دوای ئەوەی هیچ گومانێك لەسەر دانپیانانەکەی نەما.

دان پـیانان لـە کەسێك وەرناگیرێت، کە ئازار درابێت، چونکە ئەو کاتە لەخۆی دڵنیا نابێت!

ناچاریش گومانێکە و رێگری لە جێبەجێکردنی حەد دەکات، بەپێی فەرمودەی خـوای گـەورە: ﴿فَمَـــنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ: هەرکەس ناچار بوو، بەبێ زیادەڕۆیی و دەستدرێژی، هیچ گوناهی لەسەر نیە.﴾البقرة/١٧٣.

(عومـەری کـوڕی خەتاب) لە ساڵی (رمادة) واتە ساڵی بەهیلاکچوون، حەددی دزیـنی بـە گشـتی جێـبەجێ نەکرد، هەروا لە تاکەکەسیشدا جێبەجێی نەکرد، کە کۆیلـەکانی (ئیبن حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە) وشترێکیان دزیبوو. جا دوای ئەوەی روون بـوەوە، کـە گەورەکـەیان بەشی پێویست خواردنیان ناداتێ، بۆیە دوو هەندی نـرخی وشـترەکەی لـە گەورەکـەی سەند و دوو کۆیلە دزەکەی بەرەڵا کرد، ئەمەش بەپێی ئەوەی، کە ناچاری بەعوزر دادەنرێت، یان گومان و حەد لادەبات.

ئا بەم شێوەیە دەستەبەریی گیان و ناموس و سامان و هەمو مافەکان بۆ تاك و کۆمـەڵ دابین دەکرێت، لەگەڵ ئەوانەشدا دابینکردنی تەواوی شێوازی رەفتارکردن و راستیی بەڵگەکان لەکاتی تاوانبارکردندا.[١]

ئـەم دەسـتەبەریانە دەبـنە چـەند خشتێك لە بنیاتنانی ئاشتیی کۆمەڵایەتی لە سـنووری کۆمـەڵدا، لەژێـر سایەی ئەو یاسایەی بۆ هەموان و بەرژەوەندی هەموان دارێژراوە، بەبێ هیچ مەبەست و ئارەزو و خۆشەویستیەك.

## دەستەبەریەکانی گوزەرانی ژیان

ئیسـلام لایـەنی بژێـوی بە ئابووری و پێویستییەکانیەوە، لەژیانی تاك و ژیانی کۆمـەڵدا، بەبـەرز دەنرخێنێت، ئەم نرخاندنەی هیچی لەو بۆچوونە ماددیانە کەمتر

[١] پێشـتر باسـی ئـەوەمان کرد کە (عمر کوڕی خەتتاب) سزای ژن و پیاوێکی نەدا، ئەگەرچی بینـیانی کـە گۆزەی ئارەقیان بەدەستەوەیە.. ئەمەش دوای ئەوەی بەسەر دیواردا ئاودیو بوو، لەبەر ئەوەی رەفتارەکەی ناتەواو بوو.

نـیە، کـە زۆرترین گرنگی پێدەدەن، بەڵام ئادەمیزاد تەنها لەسەر ئەوە بەند ناکات و، لایەنـەکانی دیکـەی ئـارەزوە مەزنەکانی فەرامۆش ناکات، ئا ئەمەش دورِیانی نێوان ئەو بۆچونانە و نێوان ئیسلامە.

ئیسـلام ئادەمـیزاد وەك ئادەمـیزاد دەناسـێت، دەزانێـت کە پێویستیەکانی لە کیانـیدا چـەند قوڵـە و لـە سروشـتەکەیدا ڕەسەنە، بۆیە سورە لەسەر ڕەچاوکردنی ئـارەزو و پێویسـتیییەکانی، هەریەکیان لەشوێنی خۆی، هەریەکیان بەپێی قوڵی و ڕەسـەنایەتیەکەی، بـەم شـێوەیە ئەندازەگیریـەکانی بـۆ مـرۆڤایەتی دروسـتتر و، لـێکدانەوەکانی بـۆ ژیـان راستتر و، ئامادەکاریەکانی رێکتر و، جێبەجێکاریەکانی تەواوترە.

ئیسلام ئەوە فەرامۆش ناکات کە یاساکان هەموی و، دەستەبەریەکان هەمووی، بـەفیرۆ دەڕوات، ئەگەر تاك بەشی پێویستی لە بژێوی دەست نەکەوت. ئارەزوەکانی گیانیشـی نامێنێ و، گەشاوەیی بیری دادەمرکێتەوە، ئەگەر ئەو بەشە پێویستییەی لەدەست دا.. لێرەوە دەستەبەریەکان لە تەنیشت رێنماییەکان دادەنێت، تا لە پێشا بەشـی پێویسـتیی بژێـوی دابین بکات، پاشان هاوسەنگیی کۆمەڵایەتی ڕەها وەدی بهێنێت.

ئـێمە ئێستا لەبارەی ئەو دەستەبەریە بژێویانە(الضـمانات المعيشية) دەدوێین، با سەرنج بدەین بزانین ئیسلام چۆن دابینی دەکات و چۆن لە ئەستۆی دەگرێت؟

یەکـەم هۆکـاری ژیـان لـە ئیسـلامدا کارکـرنە. ئیسـلامیش پیرۆزیـەك بەکار دەبەخشێت، کە بەبەرزی ڕادەگرێ و کرێکارانیشی لەگەڵ بەبەرز ڕادەگرێ: ((إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ الْمُؤْمِنَ الْمُحتَرِف: خودا بەندەی بڕواداری پیشەزانی خۆش دەوێت)).[1]

((مَـا أَكَـلَ أَحَـدٌ طَعَامًـا قَـطُّ خَـيْرًا مِـنْ عَمَـلِ يَـدِهِ: کـەس لەئێوە خواردنێکی نەخواردووە چاکتر بێت لە کاری دەستی خۆی)).[2]

[1] من حديث ذكره القرطبي في التفسير.
[2] البخاري.

پێغەمبەرﷺ داوا دەکات کە کرێکار کرێی خۆی بەتەواوی پێبدرێت، پێش ئەوەی ئارەقەی وشك بێتەوە.. هەندێك لە شەرعناسانی مەزهەبی مالیکی وا دەبینن، کە کرێی کرێکار نیوەی قازانجی کارە، پێغەمبەریشﷺ لەسەر بناغەی نیوەی دەستکەوت کاری بە خەڵکی خەیبەر دەکرد.

هەرچۆنێك بێت، ئیسلام کارکردن بەهۆکاری خاوەندارێتی و، هۆکاری دابینکردنی بژێوی ژیان دادەنێت. ئەگەر تاك لەبەر هەر هۆیەك نەیتوانی کار بکات، پێویستە لەسەر (بيت المال)، واتە دەوڵەت ژیان و بژێوی دابین بکات.

عومەر سەد درهەمی بۆ منداڵی ساوا دانا، کە گەورەتر دەبوو بۆی دەکردە دووسەد درهەم، کە گەورەتر دەبوو زیادی دەکرد، سەد درهەمی بۆ منداڵی هەڵگیراوە دادەنا و، مانگانەش برە رۆزییەکی بۆ سەرپەرشتیارەکەی دەبڕیەوە، تا هاوکاری بکات، شیرپێدان و خەرجییەکەشی لەسەر (بيت المال) دادەنا، کە گەورە بوو لەگەڵ منداڵە هاوتەمەنەکانی یەکسانی دەکات..

هەروەها بۆ ئەو جولەکە و نەصرانیانەی بەهۆی پیری، یان ناتەواویەکیەوە توانای کارکردنیان نیە، وەك هەر ئەندامێکی کۆمەڵ، برەپارەیەکی لە (بيت المال) بۆ بڕینەوە.

ئەگەر کارەکە بەشی پێویستی نەکات، هەروەك حاڵەتی ئەو نەدارەی کەمتر لە حەددی زەکاتی هەیە، یان ئەو هەژارەی هیچی نیە، یان ئەو رێبوارەی پارەی لێ براوە، یان ئەو قەرزدارەی قەرز هەموو ماڵەکەی بردووە، بەو مەرجەی لە خراپە و خراپەکاری خەرجی نەکردبێت، ئەوانە (بيت المال) لە ئەستۆیان دەگرێت، ئەو زەکاتەی دەوڵەت لە سەرمایەدارەکان وەری دەگرێت، بەپێی زانیاری خۆی بەسەر پێویستەکان(المحتاجين) دابەشی دەکات، ئەوانەش دەگرێتەوە.

ئیسلام رێی داوە بە جەنگان و کوشتنی کەسێك، کە خواردن و خواردنەوەی کەسێکی دیکەی داگیرکردووە و ئەویش ئەوپەڕی پێویستیی پێیەتی، چونکە وەك مافی بەرگریکردن لەژیان وایە.

پێشەوا (ابن حزم) لەمبارەیەوە وای بۆچووە، کە خەڵکی ئەو گەڕەکەی یەکێکیان لەبرسا دەمرێ، بە بکوژ دادەنرێن و دەبێ خوێنی ئەو کەسەیان لێ بسەنرێت، لەبەر ئەوەی پێویستە لەسەر کۆمەڵ هەموو تاکێکی لە ئەستۆ بگرێت و، بەشی خۆی بژێوی بۆ دابین بکات، ئەم بژێوی دابین کردنەش پێویستە و فەرزە، نەك وەك خێر پێکردن بێت.

لێرەدا هاوبەرپرسیارێتی خێزانیش هەیە، کە بەپێی یاسا، بژێوی کەسی پەککەوتە و نەدار لە هەموو خێزانێکدا، دەکەوێتە سەر نزیکترین کەسەکانی، بەم شێوەیە سامانی گشتیی خێزان، بەشی پێویستی هەموو تاکێکی لەئەستۆ دەگرێ، ئەمە داواکراوە و پێویستە، نەك خێر پێکردن بێت.

هەموو ئەمانە بێجگە لەو مافەی دەوڵەتی مسوڵمان، کە بۆی هەیە بە ئارەزووی خۆی باج دابنێت و، بە ئارەزوی خۆی ماڵ لە دەوڵەمەندەکان بسێنێت، - بەبێ ئەوەی بنەمای خاوەنداری تاکی بشکێنێت، کە لە ئیسلامدا سیستەمی کۆمەڵایەتی لەسەری دادەمەزرێت-، ئەمەش بۆ پڕکردنەوەی پێویستیەکانی تاکەکان، یان بۆ دامەزراندنی دام ودەزگا و ئەو شوێنانەی رۆزیان بۆ دابین دەکات.. لەگەڵ چەندین شێوازی دیکە کە لە شوێنی خۆیدا و لەکاتی باسکردنی (هاوسەنگی کۆمەڵایەتی) بەدرێژی باسی دەکەین.

ئەوەی مەبەستمانە ئەوەیە، کە سیستەمە ئیسلامییەکان، بەشی پێویستی بژێوی بۆ هەموو تاکێك دەگرێتە ئەستۆی خۆی، کە توانای کاری هەبێت یان پەککەوتە بێت، پەککەوتەیەکی گشتی و بەردەوام بێت، یان کەم و کات دیاریکراو بێت، ئەم لە ئەستۆگرتنە دابینکردنی ئاشتیی ناو کۆمەڵە و یەکلاکردنەوەی ئەو پشێویەیە، کە کۆمەڵ دروستی دەکات.

بەڵام ئەو پشێویانەی، کە ناهاوسەنگی لە دابەشکردنی سامانی گشتیدا، لە دابەشکردنی دەسکەوت و قازانجدا، لە دابەشکردنی ماف و ئەرکەکان لە سنوری کۆمەڵدا، بەگشتی دروستی دەکات، وا باسیان دەکەین:

## هاوسەنگیی کۆمەڵایەتی

لەئەستۆگرتنی ڕۆزی بۆ هەموو تاکێك و، دابینکردنی بژێوی پێویست بۆ هەموان، لە سیستەمی ئیسلامیدا تەنها هەنگاوی یەکەمی سەرەتاییە لە ڕێی وەدیهێنانی دادوەری کۆمەڵایەتی گشتگیردا و، هەنگاوێکە لەسەر بنەمایەکی ئیسلامی بنچینەیی دادەمەزرێت، کە دەڵێت: ((الرجل وبلاؤه والرجل وحاجته: هەر پیاوە و بەپێی ئەوەی تووشی بووە، هەر پیاوە و بەپێی پێویستی خۆی))[1]، ئەو بنەمایەی، کە عومەری کوڕی خەتتاب لە ڕۆژەکانی یەکەمی ئیسلامدا دەسکەوتی جەنگ(الفيء)ی بەو پێیە دابەش دەکرد، ئەوەی تا ئێستاش مرۆڤایەتی هەوڵی بۆ دەدات، بەڵام شکست دێنێت، چونکە هەردوولای وەرناگرێت، ڕێچکەیەك لە ڕێچکەکانی لایەکی وەردەگرێت، ڕێچکەیەکی دیکە لایەکەی دیکە وەردەگرێت، هیچیان ناتوانن وەکو ئیسلام بە ڕێگا تێکڕاییە گشتگیرەکەی، لە چارەسەری ژیاندا پێکەوە کۆیان بکەنەوە.

بەهەر حاڵ، ئەمە -وەکو وتم- هەنگاوێکە لە هەنگاوەکانی ئیسلام لەڕێگای بەدیهێنانی دادوەریی کۆمەڵایەتی گشتگیر، کە ئاشتییەکی کۆمەڵایەتی گشتگیر بەدی بهێنێت.

هاوسەنگیی کۆمەڵایەتی، مەزنترین بناغەیە، کە ئیسلام داوەریی کۆمەڵایەتیی لەسەر بنیات دەنێت، کە ئاشتیی کۆمەڵایەتی لەسەر ئەو بناغەیە هەڵدەستێتەوە. هەموو ئەو دەستەبەری و دڵنیاکردنەوانەی لەم بەشەدا تێپەڕین، بەشێوەیەکی گشتگیر تەنها پێشەکی و هۆکاری بەدیهێنانی ئەو هاوسەنگییەن.

ئەم هاوسەنگییە لە سیستەمی فەرمانڕەوایی و شێوازەکەی و، لە سروشتی یاسادانان و شێوازی دادوەری و، لە لەئەستۆگرتنی ئاسایش و لە ئەستۆگرتنی رزق و ڕۆزی لەبەرچاو دەگیرێت، بەڵام لەلایەنی ئابووریی گشتیدا، لەلایەنی دابەشکردنی سامانی گشتی و لە چوارچێوەی کۆمەڵدا دەگاتە چڵەپۆپە.

[1] وتەیەکیعمری کوڕی خەتتابە

گەیشتنیشی بەو چلەپۆپەیە بەهۆی جۆرەها هۆکارە، کە بە کورتی گرنگترین و دیارترینیان دەخەینە ڕوو، چونکە ئەم کتێبە تایبەتە بە ئاشتیی جیهانی و ئیسلام، نەك بە دادگەریی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا.[1]

ئیسلام ئەم هاوسەنگییە لەسەر چەند بنەمایەکی سەرەکی گشتی بنیات دەنێت و، وەك بنەمایەکی بیردۆزە داراییەکەی بڕیاری لەسەر دەدات:

**بنەمای یەکەم: سامان تەنها لە دەستی دەوڵەمەندەکان نەبێت و هەژارەکان لێی بێبەری بن:**

ئەمەش بە دەقێکی ڕاشکاوانە بڕیاری ئەمە دەدات: ﴿كَيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ: تا نەبێتە سەرمایە ئاڵوگۆڕکردن لەنێوان دەوڵەمەندەکانتان.﴾الحشر/ ٧. جا لەبەر ڕەفتارێکی واقیعی لە ڕەفتارەکانی پێغەمبەرﷺ، حوکمەکەشی دەبێتە بنەمایەکی گشتی، جا ئەو کاتەی هەموو دەستکەوتەکانی (بەنی نەضیر)ی دا بە کۆچ کردووەکان و ئەنصارە دەوڵەمەندەکانی بێبەش کرد -تەنها دوو پیاوی هەژار نەبێت، کە وەسفی کۆچکردووەکانیان تێدابوو-، بۆ ئەوەی هاوسەنگی ئابووری لەنێوان هەردوو دەستەی مسوڵمانان لەوکاتەدا چاك بکاتەوە. ئەگەرچی ئەو ئەنصاریانە کۆچکردوەکانیان حەواندبوەوە و داڵدەیان دابون بەشداریان کردبوون لە سامان و کەلوپەل و پێویستییەکانیان، کردنیان بە برایەکی تەواوی خۆیان، هەروەك برای دایك و باوکی، ئەگەرچی ئیسلام هیچی لەسەر فەرز نەکردبوون، تەنها ئەوەی کردیان لە هاوبەشکردنی برا هەژارەکانیان لە هەموو ئەو شتانەی خوا پێی دابوون، لەخود و ئارەزوی خۆیانەوە بوو.

هەروەها ئەو عەزم و نیازەی (عمری کوری خەتتاب)ﷺ ئەم بنەمایە دەچەسپێنێت، ئەگەریش ئەو خەنجەرە زۆردارەی لێی درا بواری جێبەجێ کردنی پێنەدا، ئەو بڕیارەی ئاشکرا کرد و، هیچ یەکێکیش لە مسوڵمانان نارەزایی دەرنەبڕی. بەم شێوەیە دەبێتە بنەمایەکی ئیسلامی گشتی: ((ئەگەر بە قەد ئەوەندەی لەم کارەدا بەسەرم برد، ئەوەندەشم مابێت، ئەوا زیادەی ماڵی

[1] بۆ درێژەدان بەم بابەتە بگەڕێوە بۆ (العدالة الإجتماعية في الإسلام).

دەوڵەمەندەکانم وەردەگرت و دەمگەڕاندەوە بۆ هەژارەکان))، عومەر نیازی وابوو لە ساڵی داهاتوو ئەمە جێبەجێ بکات و، لە دەستکەوتی جەنگدا بەشی مسوڵمانان بە یەکسانی ڕەها بدات.

ئەم بنەمایە بناغەی سەرەکی دادەنرێت بۆ دابەشکردنی سامان لە ئوممەتی ئیسلامیدا. گرنگ نیە کە ئەم بنەمایە لە هەندێك ماوەدا لەکارخراوە، دەوڵەتی مسوڵمان-کە بە شەریعەتی خوا حوکم دەکات- بەدەست خۆیەتی بەو شێوەی، کە ڕەوشی ئابووری لەهەر سەردەمێکدا دەیخوازێت، جێبەجێی بکات و، بەپێی داخوازی ئاشتیی کۆمەڵایەتی بێت لە هەمو کات و شوێنێکدا.

ئەم بنەمایە بنەمای مافی خاوەندارێتی تایبەت دەکات و سنورداری دەکات، وای لێدەکات بەردەوام لەبەردەستی دەسەڵاتی دەوڵەتی مسوڵماندا بێت لە دووبارە دابەشکردنەوەی سامانی گشتی بەپێی پێویستیەکان و بارودۆخدا.. ئەگەریش خاوەندارێتی تاك بەزایە نادات و نایگۆڕێت بە بنەمایەکی دیکە.. بنەمای خاوەندارێتی تاك-وەك وتمان- بناغەی سیستەمی کۆمەڵایەتییە لەئیسلامدا.

**بنەمای دووەم: بنەمای (المصالح مرسلة):**

واتە ئەو بەرژەوەندیە گشتیانەی دەقیان لەسەر نەهاتووە و، ئیسلام دەوڵەتی مسوڵمان سەرپشك دەکات، بەڵکو لەسەری پێویست دەکات، بەپێی ڕەوش و پێویستی و داخوازیەکان ڕەچاوی بکات.. ئەمەم لە کتێبی (العدالة الإجتماعية)دا بەفراوانی ڕوون کردۆتەوە، لێرەدا بەو دەقە وازدەهێنم، کەوا دەوڵەتی مسوڵمان، کە بە شەریعەتی خوا حوکم دەکات، وەك جێبەجێکردنێکی ئەم بنەمایە، لەسەریەتی ماڵی دەوڵەمەندەکان بخاتە کار-هەروەك ئیمام مالك دەڵێت-، واتە بایی پێویستی خەزێنەی گشتی لە سەرمایەکە دەربکات-نەك لە قازانج و نەك بەشێوەی باج- بۆ خەرجکردنی لە بەرژەوەندی گشتیی مسوڵمانان و، ئەو خەرجییانەی پاراستنی کۆمەڵ و پاراستنی خانەی ئیسلام(دار الاسلام) دەیخوازێت و دەستکەوتی ئاسایی

دەوڵـەت ناتوانێـت دابیـنی بکـات، پاشـانیش ئـەوەی لەسـەرمایە بـردراوە ناگەڕێنرێتەوە.[1]

هـەروەها ئـەم بـنەمایە سـنوردارکردنێکی مـافی خاوەنداریـتی تاکە، کە وای لێدەکـات هـەردەم لەبەردەسـت پێویسـتیەکانی کۆمـەڵی مسـوڵمانانداا بێـت. لە سـایەیدا دەوڵـەت بـۆی هەیە هاوسەنگیی ئابوری جێبەجێ بکات، تەنها لەڕێگای باجـەوە نـا، بـەڵکو بـە ستاندنی پشکەکان لە خاوەنداریتی تاك-بەپێی پێویست و بـەبی بەزایـەدانی بـنەما سـەرەکییەکەی سیستەمی ئیسلامی- تا لە بەرژەوەندیە گشتیەکانی کۆمەڵ خەرج بکرێ.

**بنەمای سێیەم: بنەمای بەربەست کردنی هۆکارەگان (سد الذرائع):**

((لـێرەدا (ذریعـة) بـەمانای هۆکـار هـاتوە، (سـد الذرائـع)یـش واتا لابردنی، ئەمـەش دەمانگەیەنێـتە ئـەوەی کـە هۆکـاری حـەرام حەرامـە و، هۆکاری واجب واجـبە، خـراپەکاری حەرامـە، تەماشـاکردنی عـەورەتی بێگانەیەکـیش حەرامە، چـونکە دەبێتە هۆی خراپەکاری.. نوێژی هەینی فەرزە، کەواتە رۆیشتن بۆی فەرزە، وازهێـنان لـە کـڕین و فرۆشـتن بـە مەبەستی رۆیشتن بۆی، ئەویش فەرزە.. حەجی مـاڵی خـوا فـەرزە و هەموو رەفتارەکانی حەجیش لەو پێناوەدا فەرزە.. بنچینەی رەچـاوکردنی داخسـتنی هۆکارەکـان (سـد الذرائـع) ئەوەیە، کە تەماشای ئەنجامی کارەکـان بکرێـت و بەگشـتی بەچـی دەگات. ئەگەر بەرەو بەرژەوەندی دەڕوات کە ئـەوە مەبەسـت و ئامانجـە (مقاصـد والغایـات) لە رەفتارەکانی بەرەی ئادەمیزاد لەنێوان خۆیان، ئەوا بەقەد پێویستی ئەو مەبەستە داواکراو دەبێت، ئەگەرنیش وەك بـەك داوانەکرێـت. ئەگـەریش سـەرەنجامەکانی بـەرەو خـراپە دەچوون، ئەوا حەرام دەبێت بەشێوەیەك کە گونجاو بێت لەگەڵ حەرامیی ئەو خراپەکاریانە.))[2]

---

[1] بگـەڕێوە بـۆ کتێـبی (مـالك)ی مامۆستا محمد ابو زهرە، مامۆستای شەریعەت لە کۆلیژی مافەکانی زانکۆی قاهیرە- بەندی (المصالح المرسلة).

[2] کتابی (مالك)ی مامۆستا محمد ابو زهرە.

ئـەوەی لـێرەدا مەبەسـتمانە لـە بـواری هاوسـەنگیی کۆمەڵایەتی ئەوەیە، کە ناهاوسـەنگی لـە دابەشـکردنی سـامانی گشـتیدا بۆی هەیە ببێتە هۆی گەندەڵیی جۆراوجـۆری کۆمەڵایـەتی، کـە کەمترینـیان بریتـیە لـە نانەوەی تۆوی رق و کینە لەنـێوان تـاك و کۆمەڵـەکاندا و، هـیممەتی بەرگریکـردن لـەکاتی ترسـناکیدا دادەمرکێنێـتەوە، ئـەو کاتـە بێبەشـکراوەکان هـیچ بەرژەوەندیـەك نابیـنن لـە بەرگریکردن لە نیشتمانێك، کە ستەمیان لێ دەکات و...هتد.

جـا کەواتـە پێویسـتە لەسەر ئەو دەوڵەتە مسوڵمانەی حوکم بە شەریعەتی خوا دەکات، رێ لەو هۆکارە بگرێت، کە بێگومان دەیگەیەنێتە ئامانجێکی وێرانکەر.

لێرەشـدا هەمان کۆت و بەند لەسەر مافی خاوەنداریێتی تاك دەبینین و، دەبینین دەوڵـەتی مسـوڵمان بـنەما لـەدوای بـنەمای لەدەسـتدایە بـۆ ئـەوەی لـە سنوری سیسـتەمی ئیسـلامی گشـتیدا، دەست لە بنەماکان وەربدات بەو شێوەیەی رێ لە زیـان دەگرێـت و بـەرژەوەندی دەستەبەر دەکات، ئەگەر نا دەوڵەتێکی گوناهکاری کەمتەرخەمە لە مشورخواردندا.

**بنەمای چوارەم: بنەمای یاساغ کردنی سوو(ریبا):**

ئیسـلام بـڕیار لەسـەر (قازانج) دەدات و ئینکاری (سوو-فـائدة) دەکات. لەبەر ئـەوەی قـازانج زیاد و کەمی بۆ هەیە، بەپێی کۆششی مرۆیی. بەڵام (سوو) جێگیر و نـەگۆڕە، ئەگـەریش کۆششی مرۆیی هیچ بەرێك نەدات. جا ئەگەر خاوەن سامان ویستی قازانج بکات، ئەوا یان بۆخۆی کاری تیادەکات و قازانج، یان زیان دەکات، یانیش بە سامانەکەی لەگەڵ خاوەن کۆشش هاوبەش دەبێت و قازانج و زیان دابەش دەکەن. ئا ئەمەیە دادگەریی رەها(العدل المطلق).

ئـەم بـنەما بنچـینەییە لـە ئیسلامدا، رێگە لەوە دەگرێت، کە سامان بۆ خۆی زیاد بکات، هەروەك ئێستا لە سیستەمی سەرمایەداریدا ڕوودەدات، هەروا کۆت و بـەندێکی گـەورە دادەنێـت، لـەرێگای هەڵاوسـانی سـامانەکان لەسـەر حیسـابی پێویسـتیی تاکـەکان، یـان کۆمپانـیاکان بـۆ سـامان و دارایـی و، ناچاربونیان بۆ قەرزکـردن بە (سوو)، هەروەك رێگری لە هۆیەکی سەرەکی لە هۆیەکانی داگیرکاری

و جەنگـە نێودەوڵەتیەکان دەکات و، کاریش لە بواری بەرهەم هێناندا بەهای خۆی پـێدەدات و، دادگەریی لەنێوان کۆششی ڕاستەقینە و پاداشت دەستەبەر دەکات و، ڕێدەگرێـت لـەوەی دەسـت بەتاڵـە تەمـبەڵەکان پاداشـتێکیان دەست بکەوێت، کە شایسـتەی نـین، کەچـی ئەوانـە لـە جـیهانی نەفامـیدا، تـەنها بـە خسـتنەکاری سـامانەکانیان لـە بانقەکان و جێی دیکەدا ئەو پاداشتەیان دەست دەکەوێت، بەبێ کۆشـش سـودێکی حـەرام بۆخۆیـان دابـین دەکەن، کە سامانەکانیان زیاد دەکات و هەڵدەئاوسـێت و، هاوسـەنگی ئـابوری و کۆمەڵایەتی تێك دەدات، هەروەك ئەوەی لەو جیهانە بۆگەنەدا دەبینرێت.

**بنەمای پێنجەم: بنەمای حەرامکردنی قۆرخکردن(الاحتكار):**

قۆرخکـردن هـەموو گرێـبەندە سـودەکان دەگرێـتەوە. قۆرخکـردن هـێزێکی لەڕادەبـەدەر لەدەستی قۆرخکار دروست دەکات، کە لە چاکی ووردەکاری و، چاکی و تـەواوی خـزمەت دەسـتی ناکەوێـت، بەڵکو بەوە دەستی دەخات، کە گرێبەندی سـود لەدەسـتی خۆیدایە، یانیش بەوەی کە کەلوپەلێکی بازاڕی قۆرخ کردووە. ئەم هـێزە لەسـنور دەرچـووە هەمو کاتێك بازاڕ بەکاردەهێنێت. هەموو کاتێك لەدژی بـەرژەوەندی بەکاربـەران(مسـتهلكين) بـەکار دەهێنرێـت. واتـە دژی بـەرژەوەندی کۆمەڵـە. چـونکە پێویسـتیی خـەڵك بـۆ کـەل و پـەل و شـتی دیکە وەك چەکێك بەکاردەهێـنن کـە بەرامـبەری بـۆ نـیە، ئـەو دەتوانـێ بەرتـیل بـدات بەوانەی بە فەرمانڕەوایـیەکە هەڵدەسـتن و چاودێری کارەکانی دەکەن و، چەند قاتی بەهای ئەو بەرتـیلانەش لـە جـەماوەرە ناچـارەکە وەردەگرێتەوە، یان کەلوپەلە قۆرخکراوەکان لـەکاتی زۆر پێویسـتدا دەشـارێتەوە. بەهـەموو ئەمانەش هاوسەنگی لە کۆمەڵگا تـێك دەچێت، چونکە دەستەیەکی کەمی کۆمەڵ هێزێکیان بەدەستە، کە لەدەستی خـەڵکانی دیکـەدا بەرامـبەرەکەی نـیە، هاوسـەنگی ئابوری تێك دەچێت، چونکە قۆرخ کردن هۆکارێکە بۆ هەڵاو[illegible]دنی سامانەکان بە کەمترین کۆشش و، لەڕێگای حەرام و، بەهۆکاری گوماناوی [illegible] بە تێکدانی ویژدان و ڕەوشتەکان.

**بنەمای شەشەم: بنەمای بڵاوبوونەوەی داهاتە گشتییەکان:**

ئەوەی کە لەم سەردەمی ئێمەدا پێی دەگوترێت (خۆماڵیکردنی داهاتە گشتییەکان) بەپێوانە لەسەر بڵاویی ئاو و لەوەڕگا و ئاگر، کە لە دەقی فەرمودەدا بە داهاتی گشتی وەسف کراوە، کە نابێت بە خاوەنداری تایبەتی سنوردار بکرێت. هەروا وەك پێویستی ژیان وەسفیان دەکات، پێویستە بە بڵاوی بمێنێتەوە.. مالکیەکان لەسەر ئەمە بڵاوی گەنجینەی ژێرخاکیان وا داناوە کە نابێ بە موڵکی تایبەتی، ((مالکیەکان لە بەناوبانگترین وتەکانیاندا وای دەبینن، کە هەریەك لەم سێ جۆرە: کانزاکان و گەوهەرەکانی زەوی و شلەمەنییەکان لە کانەکانی خۆیاندا، لە ماڵە ڕێپێدراوەکان نین، تا ئەو کەسەی دەیدۆزێتەوە و دەستی بەسەردا دەگرێت، ببێتە هی خۆی.. بەڵکو ئەوانە موڵکی مسوڵمانانن و بە دەست بەسەراگرتنی ەویەکە بۆتە هی ئەوان، لەبەر ئەوەی لە زەویەکەیە، بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێتە پاشکۆی زەویەکە و بە دەستکەوتنی زەویەکە، ئەویش ببێتە موڵکی خاوەن زەویەکە. کە ئاسایی زەوی بۆ ئەو جۆرە شتانە دەست ناخرێ و داواناکرێت، بەڵکو بۆ مسوڵمانان دەمێنێتەوە)).[1]

بێگومان گێڕانەوەی خاوەندارێتی گشتی لەو لایەنانە بۆ کۆمەڵ، لەناوبردنی هۆیەکە لە هۆیەکانی لەدەستدانی هاوسەنگیی ئابوری لە کۆمەڵگادا؛ چونکە ئەو داهاتە گشتییانە گەورەترین بەشی-یان بەشێکی گەورەی- سامانی گشتی پێك دەهێنن، کە لە ڕژێمە ڕۆژئاواییەکاندا موڵکی کۆمپانیا، یان تاکەکانە. ئەم خاوەنداریە شوێنەواری خراپ لەناو کۆمەڵدا دروست دەکات، هەروەك دەبێتە هۆیەك لە هۆیەکانی ناکۆکی نێودەوڵەتی و گەمەوگاڵتەی داگیرکەر.

لێرەدا پێویستە ڕونکردنەوەیەك بدەین؛ خاوەندارییی گشتی هاوشێوەی ئاو و لەوەڕگا و ئاگر و کانەکان و نەوت.. مانای وا نیە، کە هەموو خاوەندارییەك ببێتە خاوەندارێتی گشتی و، بنەمای خاوەندارێتی تاك تێك بشکێنرێت، کە بنەمای

[1] کتێبی (احکام المعاملات)ی مامۆستا علی الخفیف، مامۆستا لە کۆلیژی مافەکانی زانکۆی قاهیرە.

سیستەمی کۆمەڵایەتییە لە ئیسلامدا. ئیسلام ڕەچاوی مسۆگەرکردنی دابینکاری بۆ هەموو تاکێك دەکات، کە خاوەنی سەرچاوەکانی بژێوی تایبەت بێت، کە لە بەندایەتی دەوڵەت، یان کۆمەڵگا ڕزگاری دەکات. لەکاتێکدا دەیکاتە پاسەوانێکی شەریعەتی خوا و فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە دەکات، بەڵام ئەگەر بژێوییەکەی لەدەست دەوڵەت، یان لە دەستی کۆمەڵگا بێت، ئەوا سەربەست نابێت.

ئیسلام زیادەی سامانی دەوڵەمەندەکان وەردەگرێت و، دەیداتەوە هەژارەکان، تا بۆ خۆیان ببنە خاوەنی، کە ئەو سەربەستییەیان بۆ دابین بکات.. هەموو خەڵکیش لە سەرچاوە گشتییەکان هاوبەش دەکات، هەموویان دەبنە خاوەنی، بەبێ ئەوەی خاوەندارییە تایبەتییەکەیان لێ دابڕێت، کە زۆر پێویستە بۆ بەرپاکردنی سیستەمی کۆمەڵایەتی ئیسلامی.

**بنەمای حەوتەم: بنەمای حەرامکردنی زیادەمەسرەفی و ڕابواردنی بێهودە:**

ئیسلام حەزناکات خەڵك داماو و نەبون بن، بەڵکو داوایان لێدەکات شتە پاکەکان بۆ خۆشگوزەرانی بەکاربهێنن و، نایەوێت حەرام بکرێت و ڕێگری لێ بکرێت، بەڵام زیادەمەسرەفی و زیادەڕابواردن قەبوڵ ناکات، چونکە ئەوانە لە شتە پاکە داواکراوە حەڵاڵەکان نین:

﴿يَابَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلاَ تُسْرِفُوا إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ، قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ: ئەی فرزەندەکانی ئادەم! هەرگا دەچن بۆ نوێژکردن، جلکی جوان دەبەر بکەن؛ خواردنێ بخۆن و وەخۆن، لە ئەندازە دەرمەچن. خوا لەوانە خۆشی نایە لە ئەندازە دەردەکەون.. بێژە: کێ جلکی جوان و خشڵ و بژێوی پاکژی -کە خوا بە عەبدەکانی خۆی ڕەوا دیوە- لای وایە کە ناڕەوایە؟ بێژە: ئەمانە شایانی ئەو کەسانەن کە لە ژیانی دنیا، بڕوایان بەخوا هێناوە و ڕۆژی سەڵاش هەر تایبەتی

بەخۆیانــە. ئــێمە ئــاوا نیشانەکان بۆ ئەوانەی، کە زانابن ڕۆشن دەکەین.﴾الأعراف/ ٣١-٣٢.

رابواردنــی بــێهودە لــە ئیســلامدا ناڕەوایــە بــەهۆی ئەو داڕوخان و داهێزرانەی دوچــاری بونــیەی تــاك، یــان بونیەی ئوممەت دەبێت، هەروا بەهۆی ئەو گەندەڵی و خــراپەکاریەی، لــە قــەوارەی تــاك و قەوارەی کۆمەڵدا بڵاوی دەکاتەوە. بەدرێژایی مــێژوو ئەوانــەی خۆش ڕادەبوێرن، بونەتە هۆی داڕوخانی کۆمەڵگا و گەلان: ﴿وَإِذَا أَرَدْنَــا أَنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا: هەرکــە ویســتمان شــارێك قڕکەین، دەوڵەمەندە خۆشگوزەرانەکانی وان، دنەدەدەین بــۆ بەدفەڕی و خراپەکاری و لە ئاکاما ئازاریان بۆ پێویست دەبێت، ئەوساکە تێکی دەهاڕین.﴾الإسراء/١٦.

ئــەوەی لامــان گــرنگە لــێرەدا دەری بخــەین ئەوەیــە، کە خۆشگوزەرانی لە هەر ئوممەتــێکدا، لەسەر حیسابی برسیەتی کۆمەڵێکی زۆری ڕۆڵەکانیەتی، ئەو تاکانەی رادەبوێــرن، چــێژ و جوانکاریــەکانی لە خوێن و کۆششی جەماوەر و پێویستیەکانی وەردەگرێت، کە ئەمەش ڕق و کینە لە دڵەکان و گڕێ لە سینەکان دەوروژێنێت، کە دەبێتە هۆی ئەوەی گیانی ئاشتی و برایی لە کۆمەڵگا نەمێنێت و، هەندێك لەگەڵ هــەندێکی دیکــەدا بجەنگێــت، ئەمــەش لەبەرئــەوەی بەرژەوەندیەکانــیان ناکۆك و ئاواتەکانــیان جــیاوازن.. ئەمــە هــەمووی ســەرەڕای ئەو پۆخڵەواتەی دەوڵەمەند و خۆشــگوزەرانەکان لــە کۆمەڵگادا دەیخەنەوە و، ئەو پاشماوە بۆگەنانەی لە تێرکردنی ئارەزوە نەخۆشەکانیان دەکەوێتەوە.

جــا کــە بونــی ســامان لەدەســتی ئەوانــەی خۆش رادەبوێرن، ئەو چێژە گڵاو و ئــارەزوە پیســانەیان بــۆ ئامادەدەکــات، لەهــەمان کاتدا دوژمنکاری و رق و کینە دەوروژێنێــت، بونــیەی کۆمــەڵ دەهەژێــنێ و لە بناغەوە دەیلەرێنێتەوە، تا لێرەدا بــنەمای (بەربەســتکردنی هۆکارەکــان= سد الذرائع) دێــتە پێشــەوە، کــە لەسەر دەوڵــەتی مســوڵمان پێویست دەکات هۆکاری ترسناك لەدەست ئەوانە دەربهێنێت، کە یاری بەئاگر دەکەن..

جا بنەمای بەربەستکردنی هۆکارەکان، بنەمای خۆپاراستنە لەوانەی، ڕەنگە رووبدات. هەر ئەوەشە ئەو هۆکارە حەرام دەکات، کە مەبەستێکی حەرامی لێدەکەوێتەوە، ئەگەریش ئەو هۆکارە بۆ خۆی حەرام نەبێت. بوونی سامانی زیادە لەدەست ئەو جۆرە کەسانە ئەو هۆکارەیە، کە پێویستە ڕێی لێبگیرێت بۆ خۆپاراستن لە ئەنجامەکەی، هەروەك لەم بوارەدا ئاشکرایە.

**بنەمای هەشتەم: بنەمای حەرامکردنی سامان کۆکردنەوە:**

﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ، يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ: ئەو کەسانەی زێڕ و زیو کۆدەکەنەوە و لەڕای خودا بەختی ناکەن، تۆ لەو ئازارە بەژانەی توشی دێن ئاگاداریان بکە.. ڕۆژێ کە ئەم زێڕ و زیوە بە ئاگری جەهەندەم سۆر دەکرێتەوە، تویڵ و کەلەکە و پشتیانی پێ داخ دەکرێ: دەردی ئەو شتە بچێژن، کە بۆ خۆتان سەریەکو نان.﴾التوبە/٣٤-٣٥.

ئەمە لەبەر ئەوەی ڕاگرتنی سامان لە دەستاودەست کردن و، نەبەخشین لە پێناوی خوا، واتە جێبەجێ نەکردنی ئەو پێویستی و بەرژەوەندیانەی وشەی (الله)ی پێ دێتە دی، بۆی هەیە ببێتە هۆی تێکدانی هاوسەنگی دارایی و بازرگانی و ئابوریی گشتی، لەگەڵیدا هاوسەنگی کۆمەڵایەتی تێك بچێت و، ئەم تێکچونەش ببێتە هۆی ڕودانی قەدەغەکراو و حەرامەکان، جا پێویستە -بەپێی ڕێگرتن لە هۆکارەکان- ڕێ لە ڕودانی ئەمانە بگیرێت و، ڕی لە هۆکارەکانی پەیدابوونی بگیرێت.

بەپێی ئەم ڕێزبەندیە مەسەلەی سامان کۆکردنەوە نابێتە مەسەلەیەکی تایبەتی یان تاکەکەسی، لەخودی خۆیدا نابێتە تاوانێك، کە لێپرسینەوەی بۆ خودا جێ بهێڵرێت لەرۆژی دواییدا، ئەو ڕۆژەی ناوچەوان و تەنیشت و پشتەکان داخ دەکرێن.. بەڵکو مەسەلەکە دەبێتە مەسەلەیەکی تەشریعی، داوا لە دەوڵەتی مسوڵمان

دەکات، کە لە ڕێگای تەشریع و لەڕێگای جێبەجێکردن ڕێ لەمە بگرێت، بۆ وەدیهێنانی ئەو بنەمایەی باسمان کرد.

شەریعەت و سیستەمەکانی ئیسلام یەکەیەکی یەك تەواکەری هاوڕێکن، هەریەکێك لەو بنەمایانە دەچنە پاڵ ئەوانی دیکە، کە هەموویان لە ڕێسای گشتیی ئیسلامدا پێك دەگەن، جا نابێت لەکاتی یاساداناندا، مەسەلەکان بە تاك تاك و پەرت و بڵاوی وەربگیرێت، بەڵکو پێویستە هەموو کاتێك بگەڕێتەوە بۆ ڕێسا هەموەکیە گشتگیرەکە.

هیچ گومانی تێدا نیە، کە نەبەخشینی سامان زیانێکی ئاشکرا و دیاری لێدەکەوێتەوە. ئەگەر ئەم نەبەخشینە لە ڕەزیلی و قرچۆکی بێت، ئەوا دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەو دەقی قەدەغەکردنە، کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ: دەستەکانت دە گەردنت وەرمەهێنە.﴾الإسراء/٢٩.

ئەگەریش لەبەر حەزنەکردن بە بەخشین لەرێی خوادا بێت، ئەوا دەکەوێتە ناوچوارچێوەی ئەو دەقەی قەدەغەکردنە، کە دەفەرموێت: ﴿وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ: ماڵی خۆتان لەڕاهی خودا ببەخشن، خۆشتان بە فەتارەت مەدەن بەدەستی خۆ.﴾البقرة/١٩٥.

بەرچاوکردنی ئەوەی کە نەبەخشین لەرێی خوادا بەهیلاك چوونە بۆ تاك و کۆمەڵ، ئا لێرەدا بنەمای بەربەستکردنی هۆکارەکان لە فراوانترین دەروازەوە دێتە ژوورەوە..

هەندێك لەوانەی بازرگانیان بە ئاینەوە دەکرد، ڕۆژانێك بەو وتەیە بەڵگەیان دەهێنایەوە: کە ئەو سامانەی زەکاتەکەی دەربکەیت کۆکردنەوە نیە، وەك ئەوەی مافی ناو سامان تەنها زەکات بێت، گوایە دوای زەکات دەرکردن سامان کۆکردنەوە چی تێدانیە.. بەڵام فەرمودەیەکی ڕاشکاو هەیە، کە سنوری سامان کۆکردنەوە دیاری دەکات و، ڕوونی دەکاتەوە، کە پاش زەکات، سامان لەچیدا دەپارێزرێت تا نەبێتە سامان کۆکردنەوە، کە دەفەرموێت: ((من جمع ديناراً أو درهماً أو تبراً أو فضةً، ولا يعده لغريم، ولا ينفقه في سبيل الله، فهو كنز يكوى به

یـوم القـیامة..: هەرکـەس دیـنار یان درهەم یان پارچە زێڕ و زیو کۆبکاتەوە و، بۆ قـەرزی دانەنابێـت و، لـەڕێی خودا خەرجی نەکات، ئەوا ماڵ کۆکردنەوەیە و ڕۆژی قیامەت پێی داخ دەکرێت.))[1]

ئـەم فەرمودەیـە ئـەو شـتانەی ڕون کـردەوە، کـە دەشـێت هەڵبگیرێت و، ئەو مەبەستانەی دەشێت بۆی هەڵبگیرێت، بێجگە لەوانە سامان کۆکردنەوەیە و، دەقی حەرام کردنەکە لەسەری جێبەجێ دەبێت.. بەم شێوەیە با لەم بوارەدا لەژێر تیشکی بنەما گشتیەکانیدا لە ئیسلام تێبگەین.

**بنەمای نۆیەم: بنەمای ئەمەت لەکوێبوو؟**

مـافی خـاوەنداری تـاك لەگـەڵ ئەوەی لە سیستەمی ئیسلامیدا ڕەسەنە، بەڵام بێهـیچ پـێوەندێك نـیە، وەك هـەندێك نەفام لە دین و هەندێك لە فێڵبازەکان بۆی دەچـن، خاوەنداریی تاك تەنها لەسەر هۆکاری دروست و شەرعی دادەمەزرێت.. لە بـنەما گشـتییەکانی ئیـسـلام دەربـارەی سـامان و، بـنەما گشتییەکانی دەربارەی ڕەوشـت لانـادات. ناکـرێ لەسەر تالان و ڕفاندن و داگیرکردن و دزی و بەرتیل، یان سو و قۆرخکردن و.. هاوشێوەکانیان دابمەزرێت.

دەوڵـەتی مسـوڵمانیش کـە شەریعەتی خوا جێبەجێ دەکات، مافی خۆیەتی لە هۆکارەکانی خاوەنداری بکۆڵێتەوە و بزانێ لەڕێی دروستەوە پێکەوەی ناوە یان نا.. ئەگـەر لـەڕێی دروستەوە بوو، ئەوا خاوەنداریەکە بۆ خاوەنەکەی دەچەسپێت بەپێی ئەو پێوەندانەی باسمان کرد، بەڵام ئەگەر شەرعی و دروست نەبوو، ئەوا ئیسلام هەر لـە بـناغەوە دان بـە بونیدا نانێت و، مافی چاودێری و پارێزگاری بۆ دانانێت، ئەو مافەی کە بۆ خاوەنداریی دامەزراو لەسەر بناغەی دروست دامەزرابێت.

ئـا ئەمەیـە ئیسـلام... بـڕیاری مـافی خـاوەنداری تـاك دەدات، تـا داخـوازی سروشـتیی قووڵـی دەرونـی مـرۆڤایەتی بەدی بهێنێت بۆ خاوەنداری و هەموو ئەو وزەیـەی خـوا تیایدا دایناوە بیبەخشێت بە ژیان و ، ژیانیش ئەوەندەی خوا ویستی لەسـەر بێـت، گەشـە بکات. هەروەها بڕیاری لەسەر دەدات، تا سەرچاوەی ڕزق بۆ

[1] ذكره القرطبي في التفسير.

هـەموو تاکـێك دابین بکات و، لە کۆیلایەتی بۆ دەوڵەت یان کۆمەڵ ڕزگاری بکات و، توانـای پـێبدات تـا ببێـتە پارێـزەرێکی شەریعەتی خودا و، فەرمان بەچاکە و بەرگـری لـە خراپە بکات و، دوای ئەوە لەوە نەترسێت دەسەڵاتێك لە دەسەڵاتەکان دەسـت لـە ڕزقەکـەی بـدەن. ئـنجا سنور و پێوەند بۆ ئەو مافە دادەنێت، جا هیچ کەسـێك لـەڕووی دروسـتبون، یـان بژێویـیەوە ئـازار نـادات. لـە کۆتاییشـدا بـۆ بەدیهێـنانی بـەرژەوەندیی گشـتی کۆمەڵـە، مـافی کۆمەڵە لەو خاوەنداریەی تاك دیاری دەکات.

بـەم شـێوەیە هـەموو چـاکیەکانی خـاوەنداری تـاك بـەدی دێنێت، کە بۆچونە تاکـیەکان(مذاهـب الفـردیة) بیانوی پێدەهێننەوە و، هەموو ئەو نەنگییانەشی لێ دور دەخاتـەوە، کـە بۆچـونە کۆمەڵیەکان (مذاهـب جماعیة) بیانوی پێدەهێننەوە، ناوەڕاسـتێك لەنـێوان هـەردوو لای زیادەڕۆیی دادەنێت، کە لەگەڵ فیترەتی راستدا هاوشـان و تەریـبە، ئـەو فـیترەتەی هـیچ خـواری و ناسازیەکی تێدا نیە. هەروەك دەبێـتە پاسـەوانێکی تـاك، کە خود و کەسایەتی و کەرامەت و سەربەستیی خۆی لەدەست نەدات؛ دەبێتە پاسەوانی کۆمەڵگا تا بەرژەوەندی و هاوڕێکی و دادوەریی دابەشکردن تیایدا لەدەست نەدات.

**بنەمای دەیەم: بنەمای زەکات:**

ئـەو بـنەمایەی دەزگـا سەرمایەداریە زۆردارەکان هەوڵ دەدەن بەتەنها گەورەی بکـەن، وەك ئەوپـەڕی ئـەو بنەمایانەی ئیسلام لەسەر سامانی پێویست کردوە، تا پـەردە بەسـەر چـاوی خـەڵکدا بـدەن و بێهۆشـیان بکەن! ئەوەی کە جارێك دەزگا شـیوعیەکان و جـارێك دەزگـا خاچپەرسـتەکان هـەوڵ دەدەن بـەو وەسفە گەورەی بکـەن، تـا لـە پایـەی دابیـنکاریەکانی ئـابوری و کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا بێننە خوارێ و سوکی بکەن!

مەبەسـتم بوو کە بۆ ئێرەی دوابخەم، لە کۆتایی بنەما سەرەکییەکانی ئیسلامدا باسـی بکـەم، تـا خـەڵك بـزانن چـۆن دەزگاکـانی سـەرمایەداری فریوی داون، بە بەکارهێـنانی پیاوانـێك کـە بازرگانی بە ئایینەوە دەکەن، چۆن -هەندێك جاریش-

شـیوعیەت و خاچپەرسـتی فـریویان دەدەن بـەهۆی هـەندێك لەوانەی لەسەر ئایین حسێب کراون!

ئەمـەش بـە کـەم دانـانی پایەی ئەم بنەما بەرێزە نیە، بەڵکو رونکردنەوەیەکی حەقە بە بەڵگەوە.

زەکـات بـە سیسـتەمێکی چەسـپاو فەرزێکـە، کـە ساڵانە بەرێژەی ٢,٥٪ لە سەرمایەی سامانەکە وەردەگیرێت.

لـێرەدا، سـەبارەت بەو فەرزەی کە قین لەدڵەکان و هەڵخەڵەتێنەکان دەیشێوێنن و، بەشـێوەی چاکەیەکی کەرامەت شکێنی ئادەمیزاد وێنای دەکەن! قسەیەك هەیە دەبێ بوترێت:

دەوڵـەتی مسـوڵمان خـۆی ئـەم فەرزە کۆدەکاتەوە، دەوڵەتی مسوڵمانیش خۆی خەرجکـردنەکەی بـە سیسـتەمێکی دیاریکـراو لەئەستۆ دەگرێـت.. کەواتـە لـە سیسـتەمێکی وەك ئەمـەدا کـوا ریسـوایی و زەبونـی هەیـە؟! قـین لـەدڵ و هەڵخەڵەتێـنەرەکان بـەردەوام هـەوڵ دەدەن وێـنەیەکی سـاختەی کـرداری زەکـات بکێشـن: دەوڵەمـەند دەبەخشـێت و خـێر دەکات، هەژاریش وەردەگرێت و سوپاس دەکـات! دەسـتی سـەرەوە دەیـدات و دەسـتی خوارەوەش لەژێرەوە وەریدەگرێت.. ڕوبەڕوو، ڕاستەوخۆ لەنێوان تاك و تاکدا!

ئەم وێنە شێواوە ساختەیەیان لەکوێ هێناوە؟ نازانم!

ئەگـەر ئەمڕۆ دەوڵەت باجێك بۆ فێرکردن دابنێت، کە داهاتەکەی تەنها تایبەت بکـات بـە کاروبـاری فێرکردنی پەتی، لە دروستکردنی خانوو، یان پێدانی کرێ و، خەرجکـردنی بـۆ کەلوپەل و کتێب و خواردەمەنیی قوتابیان.. ئایا دەوترێت: ئەمە سیسـتەمی دەرۆزەکـردن و دەسـت پانکـردنەوەیە، کەرامـەتی مامۆستا و قوتابی بریـندار دەکـات! چـونکە ئەو پارانە لە سامانی دەوڵەمەندەکان بۆ خەرجکردنی لە کاروباری هەژاران وەرگیراوە؟!

ئەگـەر دەوڵەت یاسایەك دابنێت، لە هەمو سامانێك ٢,٥٪ باج وەربگرێت، چ زۆر بـێ و چ کەم، بۆ پێکهێنانی سوپا و چەکدارکردنی، ئەو باجەش تایبەت بکات

بـە لایەنـەکانی خەرجکـردنی گشتی.. ئایا دەوترێت: ئەوە سوپا دەرۆزە دەکات و، کەرامـەتی دەشـکێنرێت، چـونکە دەوڵـەت خەرجـیەکەی ئـەوانی لـە سـامانی دەوڵەمـەندەکان دەرکردوە، لەکاتێکدا دەوڵەمەند و هەژار لە جێبەجێکردنیدا وەك یەکن؟!

زەکـات سـەرباری ئـەوەی پەرستشـێکە لـە پەرستشـەکان، هـەروا لەلایەنـە داراییـەکەیەوە، باجـێکە وەك باجـەکانی دیکە، دەوڵەت کۆی دەکاتەوە، پاشان لە چەند لایەنێکی دیاریکراو خەرجی دەکات، بەتێکڕایی کۆی دەکاتەوە و بەش بەش خـەرجی دەکـات، خـێر و چـاکەی تاکـە کەسـێك نـیە، لـە دەسـتێکی دیاریکراو دەربچـێت و بدرێـتە دەستێك. ئەگەر ئەمڕۆ هەندێك خەڵك زەکاتی سامانی خۆیان دەردەکـەن و بەدەسـتی خۆیـان دابەشی دەکەن، ئەوە ئەو سیستەمە نیە کە ئیسلام دایناوە، بەڵکو ئەو هەندە خەڵکە کە وا دەکەن، ئەو ڕێگا راستەوخۆیە دەگرنە بەر، لەبـەر ئەوەیـە کە دەوڵەت روکنەکانی ئیسلام جێبەجێ ناکات، بەدەستی خۆی ئەو باجـە کۆناکاتـەوە، تا لە چاککردنی حاڵ و باری کۆمەڵگە خەرجی بکات، هەروەك ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە.

بـەڵام بێئاگـایی و خۆبێئاگـا کـردن دەگاتـە ئاستێك، کە هەندێ کەس باسی زەکـات بکـات وەك ئـەوەی خـێر و چـاکەیەکی تاکەکەسـی بێـت، کـە دەرونەکان سەرشۆڕ بکات و فێرە دەست پانکردنەوەی بکات.

جورئـەت کـردن لەسەر هەندێ حەقیقەتی پەتیی سەرەتایی، هەتا ڕادەی قسەی ناشـیرین و بێـنابڕویی، سەرچـاوەکەی بێـئاگایی گوێگـران یان خوێنەرانە تا ڕادەی گێـلی. هـەردوو حاڵەتەکەش لە ژینگەی نەفامیی دوور لە ئاینی خوادا دەبینرێت، هـەروا زۆرتـر لـە ژیـنگەی ئەوانـەی ناویـان نـاون (رۆشـنبیران)دا دەبینرێت، ئەو رۆشـنبیرانەی بـە دڵخۆشـیەوە گوێ لە هەمو تانەدەرێك لە سیستەمەکانی ئیسلام دەگـرن و پێشـوازی لێدەکـەن، تـا بیسـەلمێنن بەڕاسـتی ڕۆشـنبیرن! ئەی ئێمە لە چەرخی کورتەباڵا و نەوەی کورتەباڵاکان نین؟!

## دڵنیابون لە یاسا

.. ئێستاش با بە دوا هۆکار لەو هۆکارانەی، کە ئیسلام بۆ بەدیهێنانی ئاشتی کۆمەڵگا دەیگرێتە بەر، کۆتایی بەم بەشە بهێنین.. ئەوەیە سروشتی شەریعەتی ئیسلامی و پەیوەندی دەرونی مرۆیی پێوەی و، بەدەمەوەچوونی. کە لە کۆتاییدا کاریگەرییەکی یەکلاکەرەوەی هەیە لە چەسپاندنی ئاشتیی کۆمەڵایەتی و، بەدیهێنانی هەموو ئەو زەمانەت و دابینکاریانەی پێشتر باسکرا.

پێویستە یاسایەك هەبێت پەیوەندیەکانی کۆمەڵی مرۆڤایەتی ڕێك بخات، حاڵ و باری بەڕێوە ببات، بیکات بە پارچەیەکی هاوکاری قەوارەدار، نەك تاك تاك و پەرت و بڵاو و بێ‌سیستەم.

یاساش، ئەگەر گوێڕایەڵی نەکرێت و جێبەجێ نەکرێت، ئەم ڕۆڵە بە سەرکەوتویی نابینێت. جێبەجێش ناکرێت و گوێڕایەڵیی بۆ ناکرێت، مەگەر دەرونەکان لێی دڵنیا بن و، لەنێوانیاندا بەدەمەوەچوون و سۆزداری هەبێت و، هەست بکات کە بەرژەوەندیە نزیك و ئامانجە دورەکانی لەو یاسایەدا بەدی دێن.

دەرچوون لە یاسا زۆرتر لە سێ‌هۆکارەوە سەرچاوە دەگرێت و، هەموو هۆکارە لاوەکیەکانی تێدا کۆدەبێتەوە:

یەکەم: هەست کردن بەوەی کە دادوەر نیە، چونکە بەرژەوەندی تاکێك، یان چەند تاکێك یان چینێك لەسەر حیسابی ئەوانی دیکە بەدی دێنێت، ئەوانیش لەو حاڵەتەدا وا هەست دەکەن، کە یاسا هۆکارێکە لە هۆکارەکانی ڕام(تسخیر) کردنیان بۆ ئەوانی دیکە، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی کۆششەکەیان سودێك بەدەست بێنن.. لەپێی ئەم یاسایە ئەمان دەبێ ڕەنج بدەن و دەستکەوتیش بۆ ئەوانی دیکە بێ.

دووەم: هەستکردن بە نامۆیی لەنێوان گیانی یاسا و گیانی ئەو کۆمەڵەی فەرمانڕەوایی پێدەکات، چونکە پێویستیە هەستیەکان و، بەرژەوەندیە ماددیەکانی بەدی ناهێنێت و، حاڵ و باری و پێویستیەکانی ژیانی بەڕێوە نابات، ئەمەش بەهۆی نامۆییەوەیە، لە گیان و ڕەوش و مێژووەکەیدا.

سێیەم: هەوڵدانێکی تاکە بۆ وەدیهێنانی کەسایەتی خۆی، بە دەرچوون لەو یاسایەی کەسانی دیکە بۆیان داناوە، جا ئەو کەسەی یاساکەی داناوە تاکێك بێت یان دەستەیەك یان چینێك، چونکە یاسا -هەرچۆنێك بێت- چەند پێوەندێکی تێدایە، خۆ بەرزگرتن بەسەر ئەو پێوەندانە و دەرچونی نهێنی، یان ئاشکرا لە یاساکانی -لە حاڵەتی یاسایەك مرۆڤ بۆ مرۆڤی دابنێت- کەسایەتی خودی لە هەستی تاکدا بەدی دەهێنێت.

هیچ یاسایەك لە یاسا دەسکردەکان نیە لە یەکێك، یان زیاتر لەو خەوش و نەنگیانە خاڵی بێت، بە تایبەتی نەنگیی یەکەم و سێیەم، کە زۆربەی جار ئەم دوانە لە هەموو یاسایەکی زەمینی، کە مرۆڤایەتی ناسیبێتی کۆدەبنەوە، ئەو یاسایانەش کە پەرلەمانی هەڵبژێردراو دایدەڕێژن لەمە خاڵی نیە، هەروا ئەو یاسایانەش، کە چینی کرێکارانی فەرمانڕەوا لە وڵاتە کۆمۆنیستیەکان دایدەڕێژن.

بەڵام لە حاڵەتی پەرلەمانی هەڵبژێردراو لە دەوڵەتە سەرمایەداریەکاندا، ئەوا سەربردەی هەڵبژاردنی ئازادانەی گەل ئەفسانەیە. جەماوەریش لە ناخیدا هەست بە گەورەیی ئەو ئەفسانەیە دەکات. چونکە دەنگدەر هەست دەکات، کە لە دەربڕینی ویستە ڕاستەقینەکەیدا ئازاد نیە، لەبەر ئەوەی ژیانی و ئەو پاروەنانەی پێی دەژێت، لەدەستی ئەو سەرمایەدارەیە، کە هەڵی دەبژێرێت! ئەگەریش وامان دانا- کە هەرگیز ڕوونادات- دەنگدەر ئازادی ڕەهای خۆی هەیە لە هەڵبژاردنی پیاوانی پەرلەمان، ئەو پەرلەمانەش پێکهاتەکەی لە چینێکی دیاریکراو پێك دێت، کە ئەو ڕەگەزانەی کەم تێدایە، کە بەڕاستی -نەك بە پڕوپاگەندە- لە جەماوەر بن، ئەو دەستورانەی دایدەڕێژن ڕەچاوی بەرژەوەندی سەرمایەداری تێدا دەکرێت، لەهیچ حاڵێکدا لەمە خاڵی نابێت!

لە حاڵەتی فەرمانڕەوایی چینی کرێکاریشدا، هەر لە سەرەتاوە ئامانجی یاسادانان، تێکشاندنی چینی بۆرجوازییە، جا هەر چەند کۆمەڵی کرێکاران زۆرینە بن، کۆمەڵێکی دیکە هەن، کە یاسا لەگەڵیاندا نیە، بەڵکو بەبێ گومان لەدژیانە، بەڕاشکاوی و بە مەبەست و مکوڕبوونەوە دژایەتیی دەکەن!

حاڵەکە لە هەموو رژێمێکدا هەروایە، کە تاکەکان خاوەنی پاروەنانێك لە داهاتی تایبەتی خۆیان نەبن، کە تیایدا دەژین ترسی ئەوەیان هەیە، ئەگەر پێچەوانەی ویستی ئەوانە بکەن کە ئەو بژێویانەیان لەدەستە، سەرچاوەی بژێوییان لەدەست بدەن!

هەموو ئەمانە لە وڵاتانێکدایە، کە دەستوری خۆیان لە واقیعی خۆیان وەردەگرن، نەك لەدەرەوە بۆیان بهێنرێت، وەك ئەوەی لە هەندێك وڵاتانی بەناو (ئیسلامی) ڕوودەدات! بەڵام لەحاڵەتی لەدەرەوە هێنان و لاسایی‌کردنەوەدا، نەنگییەکی دیکەی دێتە سەر، بۆشاییەك لەنێوان گیانی یاسا و گیانی جەماوەر دروست دەبێت، چونکە بەو نامۆیە و، لە گیان و بارودۆخ و پێویستییەکانیەوە سەرچاوەی نەگرتوە، جا لە جێبەجێ‌کردنی یاسای وەرگیراودا شتی پێکەنیناوی و گریاناوی ڕوو دەدات، ئەگەر ئەوانەی دایەڕێژن کەمێك ڕۆشن بینییان هەبوایە و، کەمێك مرۆڤانە بیریان بکردایەتەوە، دەستوریان لەو سەرچاوەیەوە وەرنەدەگرت، بەڵام ئەوان بە دڵنیاییەوە وەری دەگرن![1]

لەکاتێکدا هەر هەموو یاسا دەستکردەکان، بە هەرەکۆن و تازەکەشیانەوە، لە یەکێك یان زیاتر لەو نەنگییانە خاڵی نابێت، تەنها دەستوری ئیسلامییە لە هەموو ئەو نەنگیانە خاڵی و بێ‌هاوشان و هاوشێوەیە.

لە شەریعەتی ئیسلامیدا هیچ بوارێك نیە بۆ هەست کردنی تاکێك، یان کۆمەڵێك بەوەی، کە یاسا بەپێوانەی ئەو دادوەر نیە، چونکە هۆکارەکانی لادان لە دادوەری تێدا نیە، بەو پێیەی کە داڕێژەری شەریعەت و دەستور بۆ هەموان خودای هەموانە، ئەویش هیچ بەرژەوەندییەکی لە خۆشویستنی تاکێك، یان کۆمەڵێکدا نیە، بەمەش لە کۆمەڵی ئیسلامیدا بیرۆکەی چینایەتی نامێنێت. نامێنێت بەوپێیەی هیچ یاسایەك نیە ڕەچاوی بەرژەوەندی چینێکی دیاریکراو بکات لەسەر حیسابی چینێکی دیکە. هەموو تاکێك مافی هەیە و، بەرامبەر بەو مافەش ئەرکی لەسەرە. بەم شێوەیە کۆمەڵگەی ئیسلامی دەبێتە کۆمەڵێك تاك، کە ماف

[1] بگەڕێوە بۆ کتێبی (الإسلام وأوضاعنا القانونية)ی مامۆستا عبدالقادر العودە.

و ئەرکەکانـیان لەیاسادا هاوتایە، نەك کۆمەڵە چینێك بن ململانێ و تێکگیران لە بەرژەوەندیەکانـیاندا هەبێـت و، یاسـا بـۆ بـەرژەوەندی هـەندێك لەسـەر حیسابی هـەندێکی دیکـە حوکـم بـدات. جـا لـە هەرلایەنێك لە لایەنەکان بێت، بەم پێیە تارمـایی سیستەمی چینایەتی لە ئیسلامدا بوونی نیە، هەروا ململانێی چینایەتی بونی نیە. کاتێك شەریعەتی ئیسلامی لە جیهانی فەرمانڕەوایی و جیهانی ساماندا بەتـەواوی جێـبەجێ دەکرێت، هەست کردن بە لاریونەوەی دادوەریی یاسایی، بونی نابێـت، تـا بەهۆیـەوە هەوڵی دەرچوون لەو یاسایە بدرێت، بەڵکو تەنها لاڕێبوونی تاك تاکە دەمێنێت کە جێی باس نیە.

هـەروا بـواری نـامۆیی لەنـێوان گـیانی دەستور و شەریعەتەکە و گیانی تاك و کۆمەڵـەکاندا نیە، چونکە شەریعەتی ئیسلامی بەهۆی ئەو هاوڕێکییە گشتگیرەی، کە تێیدایە و لەپێشدا نمونەی زۆرمان خستەڕوو، پێویستییەکانی دەرونی مرۆیی لە هـەموو بوارێکـی چـالاکیی مرۆیـیدا دابـین دەکـات. چ لـە دروشـمـەکانی و چ لـە دەسـتورەکانی، پێویسـتی جەستە و پێویستی هزر و پێویستی گیان دابین دەکات.. پێویسـتییەکانی تاك دابین دەکات لەو کاتەی بەتەنها کار دەکات، لەو کاتەشدا کە بـە رێکوپێکی لە کۆمەڵ(جماعة)دا کاردەکەن، پێکدادان لەنێوان ئارەزوە سروشتییە دروسـتەکانیان رونـادات و، وزە سروشـتییە راستەکانیان خەفە ناکات.. لە هەمان کـاتدا سـنور بـۆ چالاکیی ڕێزپەڕ دادەنێت، کە زیانیان پێدەگەینێت، تاك تاك بن، یـان کۆمـەڵ کۆمـەڵ.. ئـەو کۆمەڵەیـەی، کە پێی دەوترێت دەوڵەت، هەموو ئەو دەسـەڵاتانەی پـێ دەدرێـت، کـە سـود لە چالاکی و بەرهەمی هەموان ببینێت بۆ بـەرژەوەندی هـەموان. هـەر بـەو دەسەڵاتەش، بۆ بەرژەوەندی هەموان، رێگری لە هـەموو چـالاکیەکی خراپی نارێك دەکات، کە لەگەڵ فیترەتی تەواو و ڕاستاڵ کۆك نـیە. لەپێشـدا دەربـارەی ئەو دیاردە جیاکەرەوەیەی سروشتی شەریعەتی ئیسلامی ئەوەندە نمونە هاتووە، کە بەس بێت.

لەکۆتایـیدا، هـەروا بـوار بـە تـاك نـادات بـۆ بەدیهێنانی کەسایەتی خۆی و، هەسـتکردن بـە خۆگـەورەیی لەناو کۆمەڵگە، یان دەستە و کۆمەڵدا، کە پێویستی

بـە هەڵگەڕانـەوە هەبێت، تەنها مەگەر ئەو خۆگەورە گرتنە پێکەنیناویە بێت، کە لەسەر خوا دەکرێت!

هەسـتکردنی تـاك بـەوەی، کە هێزێکی لەخۆی بەهێزتر و، لەهەموو مرۆڤەکان بەهـێزتر یاسـای بـۆ دادەنێـت، بەسە بۆ ئەوەی هەست بە سەربەرزی بکات، زیاتر لەوەی هەست بە کۆیلایەتی بکات، بۆ ئەوەی کەسایەتیی خۆی بەدی بهێنێت زیاتر لـەوەی خەفـەی بکـات و فشـاری بخاتە سەر. ئەمەش چاکێتیەکە هەرگیز لە هیچ سیسـتەمێکی جگـە لـە سیستەمی ئیسلامیدا نابینرێت، کە هەموان لە بەرامبەر دەسـتوردا یەکسـان دەکـات، تـەنها بـە وتەیەکی ناڕاست و شێوێنەر نا، بەڵکو بە حەقیقەتێکی ڕاستەقینە.

تـەنها ئیسـلامە کـە بەرفەرمانی فەرمانڕەوا دەبەستێتەوە بەوەی ئەو دەستورە جێبەجێ بکات، کە خۆی داینەناوە، بەڵکو خوای هەموو مرۆڤەکان دایناوە، هەروا بەرفـەرمانی بـە جێـبەجێکردن و شوێنکەوتنی ئەو دەستورە لەلایەن فەرمانڕەواوە سـنوردارکراوە، نـەك بە جێبەجێکردنی کۆمەڵە یاسایەك، کە فەرمانڕەوا دایهێناوە و لەگەڵ شەریعەتی بەرزی خوادا ناکۆکە.. جا ئەگەر فەرمانڕەوا و ژێردەستەکان لە حوکـێك، یـان کێشـەیەك ناکۆك بون، ڕێگاچارە ملکەچیی قسەی فەرمانڕەوا نیە، بـەڵکو ڕێگاچـارە گەڕانـەوەی فەرمانـڕەوا و ژێردەستەیە بۆ لای خوا و پێغەمبەر: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَـيْءٍ فَـرُدُّوهُ إِلَـى اللَّـهِ وَالرَّسُولِ: ئـەی گەلی بڕواداران، بەرفەرمانی خودا و پێغەمـبەری خـودا و کاربەدەسـتانێ بن کە لە خۆتانن. هەرکاتێکیش لەسەر شتێ لەنێو خۆدا پێك نەهاتن، ئەگەر بڕواتان بە خودا و بەڕۆژی قیامەتێ هەیە، کێشەی خۆتان حەواڵەی خودا و پێغەمبەری خودا بکەن.﴾النساء/٥٩.

ئـەوە ئەوپـەڕی داواکاریـەکانی تاکـە بـۆ بەدیهێـنانی کەسـایەتیەکەی، ئەگەر سروشتی دروست بێت و ڕێزپەڕ نەبێت و لاڕێ نەبوبێت. ئیسلامیش دەستور بۆ ئەو زۆریـنە هـەرە زۆرە دادەنێـت و، لـەو چوارچـێوەیەدا ئاشـتی و ئاسـایش بـەدی دەهێنێت.

هـەروا دەبیـنین کـە هـەموو ئـەو بـنەمایانەی باسـان کـردن بـۆ بەدیهێـنانی هاوسـەنگیی کۆمەڵایـەتی، کۆمەڵـە بـنەمایەکن لـە دەسـتی ئـەو (دەوڵەتـە مسوڵمانە)دان، کە حوکم بە تەواوی شەریعەتی خوا دەکات و، یاساکانی تەنها لەو شەریعەتە سەرچاوە دەگرێت.. ئیسلام یەکپارچەیە و بەش بەش نابێت، حوکمێکی لـە حوکمـێکی دیکـەی جـودا نابێـتەوە، بـنەمایەکی لە بنەمایەکی دیکەی جودا نابێـتەوە.. هـیچ بواریـش نـیە بـۆ بـەش بەش کردنی و هەڵبژاردنی هەندێکی و وازهێنان لە هەندێکی.. چونکە ئەو کاتە ئەمە ئیسلام نیە.!

# ئاشتیی جیهان

لەژێـر ڕۆشـنایی دیـدی گشـتیی ئیسـلام بـۆ گـەردون و ژیان و ئادەمیزاد، کە بـەکورتی هـێڵە سەرەکیەکانیمان لە سەرەتای ئەم کتێبەدا ڕون کردەوە، ئنجا لەژێر سـایەی سروشـتی ئاشـتی لـە ئیسلامدا، کە لەوێ باسمان کرد.. دەتوانین نەخشەی ئیسـلام بۆ بەدیهێنانی ئاشتی نێودەوڵەتی لەنێوان نەوەی ئادەمیزاد بەدی بکەین.. ئـەوەبو هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵیدا ڕۆیشتین، لە (ئاشتی ویژدان) بۆ (ئاشتی ماڵ)، بـۆ (ئاشـتی کۆمـەڵگا)، هەتا ئەو هەنگاوانە بەشێوەیەکی هاوڕێك گەیاندمانی بە (ئاشتی جیهان).

تێڕوانیـنی گشـتیی ئیسـلام دەربـارەی ژیان ئەوەمان پیشان دەدات، کە ژیانی مرۆڤایەتی بە یەك پارچە دادەنێت. یەك پارچە لە ڕووی کاتەوە، ئەڵقەکانی پێکەوە بەسـتراون، هـەنگاوەکانی پلەپلـەن، نـەوەکانی هاوڕێکن، قۆناغەکانی یەك لەدوای یـەکن: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُـرْجَعُونَ: چـۆن لـەو خوایە حاشا دەکەن کە لە نەبوو، ژیانی دا بەئێوە و لەپاشان دەتـان مرێـنێ و دیسـان زیـندوتان دەکاتـەوە و ئەوسـا گشـتتان بـۆلای ئـەو دەگەڕێنەوە.﴾البقرة/٢٨.

لـەڕووی سروشتیشـەوە یـەك پارچەیە، ویست و ئارەزوەکانی پێکەوە بەستراون، مـاددە و گـیانی تـێکەڵن، بـۆی هەیـە بەرزبێـتەوە ئەگەر بەچاکی ئاراستە کرا و پاککـرایەوە، بۆی هەیە دابەزێت ئەگەر بەخراپی ئاڕاستە کرا: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا، قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا: بەگیانی مرۆ سـوێندە و بـەوەش کـە ڕێکـی خسـتوە.. ئەوسا هەمو تاوانباری و پارێزکاریی لە ویژدانـی گـەیاندوە.. دیـارە هـەرکێ گـیانی خـاوێن ڕاگـرتووە، ڕزگار بووە.. هەر کەسێکیش لە گوناهیەوە پێچاوە، دۆڕاندویە.﴾الشمس/٧-١٠.

وێـنەی ئاشـتی لـە ئیسـلامدا، کـە لەسـەر ئـەو تێڕوانیـنە گشتگیرەی یەکەم دامـەزراوە، ئـەوەمان پیشـان دەدات کـە ئیسـلام هـەموو مـرۆڤایەتی بـە یـەك

مـرۆڤایەتی دادەنێت، هەموو ئایینەکان بە یەك ئایین دادەنێت، هەموو بڕواداران بە یـەك ئومـمـەت دادەنێـت، ئیسـلامیش بـە دوا وێنە و کۆتا وێنەی ئەو تاکە ئایینە دادەنێـت، ئەوانـەی پـێش خـۆی بە ڕاست دادەنێت و بەسەریاندا چاودێرە، چونکە کۆتـا وێـنەیەتی: ﴿وَأَنزَلْـنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِـنًا عَلَـيْهِ: ئـەم قورئانـەشمان بە خەڵات بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە، کە هەرچی تێیدایە ڕاستە، بە کتێبە بەرینەکان بڕوای هەیە و چاودێریانە.﴾المائدة/٤٨.

کەواتـە مسوڵمانان بەهۆی ئەو سەرپەرشتیاریەی بەسەر مرۆڤایەتیەوە هەیانە و بـەهۆی ئـەو سەرپەرشـتیاریەی کتێـبەکەیان بەسـەر کتێـبەکانی دیکـەدا هەیانە، پێویستە لەسەریان دواهاتەکانی مرۆڤایەتی لەخۆبگرن.. لەسەریانە ئەو ئاشتییە لە زەویـدا بـەجێ بهێـنن، کـە پێشـتر هەنگاوەکانـیمان باسـکرد لـە ویژدان و ماڵ و کۆمـەڵگادا؛ بناغە و بنەماکانیمان زانی لە بەتاك زانینی خوای گەورە لە خوایەتی و پەروەردگاریـەتی و فەرمانڕەوایەتـیدا؛ لـە دادوەری و یەکسانی و سەربەستی، لە دابیـنکاریەکانی ژیان لەڕووی یاسایی و بژێوییەوە؛ لە ڕێگری کردن لە زیادەڕۆیی و لابـردنی سـتەم و، بەدیهێنانی هاوسەنگیی کۆمەڵایەتی و، هاوتایی و هاوکاری و، لابـردنی هۆیەکانی جودایی و ناکۆکی و دژایەتی لەنێوان تاکەکان و کۆمەڵەکان و، داخسـتنی ئـەو دەروازانـەی دەبـنە هـۆی دروسـت بوونی چینەکان و جیاوازییان و کێشـەی نێوانـیان.. هەتا دوایین ئەوانەی لە بەندەکانی پێشووی ئەم کتێبەدا باسمان کرد.

ئـەم ئوممەتە وەك ئوممەتێکی ناوەند(وسط) هاتووە، لە هەموو ئاستەکانی ژیاندا دادوەرە و لەنـێوان هـەردوو لای زیـادەڕۆیی و بەزایەداندایـە، هـەروەك سـنور و بـنەماکانی ئـەم ئایینـەی بـۆ دیـاریی دەکات، کە لایەنێکیمان لە بواری ئاشتیدا خسـتە ڕوو، کـە لەسـەری پێویسـت بـوو ئـەم بـارە هەڵگرێ و کەمتەرخەمی لێ نـەکات، چـونکە ئـەوە ئەو پشکەیە لە ژیان، کە لەلایەن بەدیهێنەری ژیانەوە بۆی دیاریکراوە:

﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا: بەو شێوەیە ئێوەمان کردۆتە ئوممەتێکی هەڵبژاردە، تا ئاگاتان لە مەردم هەبێ و پێغەمبەریش چاوەدێریتان بکا.﴾البقرە/١٤٣.

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ: ئێوە چاکترین کۆمەڵێن لەناو مەردمی دنیادا سەرتان هەڵدا، فەرمان بەچاکە دەدەن و ڕێ لە ناڕەوا دەبەستن، باوەڕیشتان بەخودا هەیە.﴾آل عمران/١١٠.

## جیهاد لە پێناوی خودا

بەڵام ئەم دینە -لەگەڵ هەموو ئەوانەدا- کاروبارەکانی بەکوێرانە نەکردووە، مسوڵمانانی ڕانەسپاردوە زۆر لە خەڵك بکەن بیروباوەڕەکەیان وەربگرن و بێنە ناویەوە، لەبەر ئەوەی ئەم دینە وێنەیەکی تەواوی گشتگیری ڕاستگۆی دینی خوای تاکە لەسەر زەویدا: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الغَيِّ: لەم دینەدا بەزۆر داسەپاندن نیە، شارەزایی لەگومڕایی هاوێرکرا.﴾البقرة:٢٥٦.. بەڵکو یەکەمجار ڕایسپاردن کە پارێزگاری لە بڕواداران بکەن تا لەسەر دینەکەیان توشی ناڕەحەتی نەیەن و بە زەبری هێز، هێزیان لێ لابدرێت. چونکە لێرەدا بانگەواز بەچاکترین شێوە داد نادات، ئەوەش شوێنی نیە..

دووەم: ڕایسپاردن بە دابینکردنی سەربەستیی بانگەواز و، لابردنی هەر هێزێکی زۆردار لەسەر زەویدا، کە ڕێگرە لەبەردەم گەیشتنی بانگەوازی ئیسلام بە هەموو خەڵك.

سێیەم: سەپاندنی دەسەڵاتی خوا لە زەویدا و، لابردنی دەستدرێژیکاران بۆ سەر ئەم دەسەڵاتە.. ئەوانەی وا هەڵدەبەستن کە مافی ئەوەیان هەیە بەبێ خوا دەستور بۆ خەڵك دابنێن، ئەوان بەمە بانگەشەی خوایەتی دەکەن و خۆیان دەکەنە پەروەردگار لەگەڵ خوا، یان بەبێ خودا.

چوارەم: ڕایسپاردن بە دامەزراندنی دادگەریی هەرەمەزن لەسەر زەوی و، بەهرەوەرکردنی مرۆڤایەتی بەم دادگەریە لەهەمو بوارەکانیدا، چ تایبەت بێت بە

تــاك لــەناو كۆمــەڵدا، یان بە كۆمەڵ لەناو ئوممەتدا، یان بەو ئوممەتانەی لەسەر ئەم زەمینە دەژین و مرۆڤایەتیی گەورە پێكدێنن.

ئــەم ئەركــباریە وا لــە مســوڵمانان دەخوازێــت، كــە لە دژی پەروەردگاریەتی و فەرمانــڕەوایەتی زۆرداران تێبكۆشــن، لــەدژی ســتەم و زۆرداری لە هەر شوێنێكدا بێــت تێبكۆشــن، ئەگــەریش ســتەم كــردنی تاك لە خۆیشی بێت، یان ستەم كردنی كۆمەڵە لەخۆی بێت، یان ستەم كردنی دەوڵەت لە ژێردەستەكانی بێت.. جا لە هەر شوێنێكی سەر ڕوی زەوی ستەمێك هەبێت، ئوممەتی ئیــسلامی لەسەریەتی دژایەتی بكــات و هۆكارەكانی لابەرێت، بەڵام نەك بۆ دەستخستنی زەوی و، ژێردەستكردنی خەڵكانــێك؛ بــەڵكو بــۆ بەدیهێــنانی وتــەی خــوا لەســەر زەوی، دور لــە هــەموو مەبەستێك، هەروا سەپاندنی پەروەردگاریەتی و فەرمانڕەوایی و دادوەریی خوا.

ئــا ئەمەیــە، كــە ئیســلام نــاوی لێناوە (جیهاد لەپێناوی خوا)، واتە جیهاد بۆ بەدیهێــنانی پەروەردگاریەتی خوا بۆ بەندەكانی، تا تەنها وتەی خوا بەرز بێت، نەك بە زۆر لە خەڵك كردن تا ببنە مسوڵمان، بەڵكو بە ڕەخساندنی هەلێك بۆیان، تا لە پەروەردگاریــەتی زۆرداران ڕزگاریــان بێــت و، سەربەســتیی هەڵبژاردنــیان لەدەست بێــت، بــەبێ دەستێوەردانی هێزێكی زۆرداری گومڕا و، لەو دادوەریە ڕەهایەی خوا بۆیــانی دانــاوە بەهــرەوەر بــن: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَــاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ: ئەوانەی بڕوادارن، خەزا لەڕای خوا دەكەن، ئەوانەش كــە خوانەناســن لەڕێگەی تاغوت شەڕ دەكەن.﴾النساء/٧٦. ئەمەیە دوریانی نێوان جیهاد لەپێناوی خودا و جیهاد لەپێناوی ئارەزوەكان.

بــنەما سەرەكییەكانی ئیسلام، شۆڕشێكی ڕاستەقینەی تەواوی لەخۆ گرتوە، بە گەورەتــرین شــۆڕش دادەنرێــت، كــە مــرۆڤایەتی ناســیویەتی.. شۆڕشــێك بەســەر پەروەردگاریــەتی بــەندە بــۆ بــەندە، شۆڕشــێك بەســەر ســتەم بــە هــەموو شێوە و جۆرەكانــیەوە، لــە هــەموو گۆڕەپــان و بوارێكیدا، شۆڕشێك بەسەر ئەو سیستەم و حكومــەت و بارودۆخانــەی لەســەر ســتەم راوەســتاوە و بۆ بەرژەوەندی تاك لەسەر كۆمــەڵ و لەشــێوەی فەرمانــڕەوا یان چەوسێنەر، یان بۆ بەرژەوەندی چینێك لەسەر

چـینێکدا لـه شـێوەی دەرەبەگ و سەرمایەدار و مشەخۆرەکان! یان بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتێك لەسەر دەوڵەتێکی دیکە لەشێوەی داگیرکەر..

هـەر دەبـوو تاکـەکان، یـان چینەکان، یان وڵاتەکان بەرگری بکەن، ئیسلامیش هـەر دەبـوو بـە شۆڕشە تەواوە گشتگیرەکەی روبەڕوی ئەو بەرگرییە ببێتەوە. هەر دەبـوو جیهاد لەسەر مسوڵمانان فەرزبێت بۆ سەرخستنی ئەو شۆڕشە و بەدیهێنانی پەروەردگاریـەتی و فەرمانڕەوایەتی خوا لەسەر زەوی و، ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی بە تاك و بە کۆمەڵ لە ستەمی پەروەردگارە زەمینییەکان، کە خۆیان لە چەندین کەس و دەسـەڵات و سیسـتەم و بـارودۆخدا دەنوانـد. تـا ئاشتیی جیهانیی هەرە گەورە لەسـەر بـنەما ڕەسـەنەکانی دامەزرێنێـت، ئەمـەش نەك تەنها لەنێوان دەوڵەتان، بـەڵکو لـە نـاوخۆی دەوڵەتەکانـیش، لـە ڕودانـی سـتەم لـەناوخۆی دەوڵەتـێك لە دەوڵەتـەکان، بـێدەنگ نابێـت بەمەبەسـتی وەدەسـتهێنانی ئاشتی بە هەر نرخێك بێت. تێڕوانینی ئیسلامی تێڕوانینێکی خواییە، سنورەکەی (جیهان)ە و بابەتەکەی (ئادەمـیزاد)ە.. مەبەستی کڕینی ئاشتییەکی درۆزن لەگەڵ دەوڵەتێك لە دەوڵەتاندا نـیە، بـەوەی کـە لـێگەڕێن ئـەو دەوڵەتانـە، جگـە لـە خـوا پـەروەردگاریّ بـۆ ژێردەسـتەکانیان دابنێـت، تـیایدا بانگەشـەی پەروەردگاریەتی بکەن؛ لە دادوەریی قـەزائی و دادوەریـی کۆمەڵایەتی بێبەشیان بکەن.. ئەو ژێردەستانەی ئەو دەوڵەتە سـتەمکارە فەرمانڕەوایـیان دەکـات، ئاییـنەکەیان هەرچی بێت و شێوەیان هەرچۆن بێـت، ئەوانـە خەڵکانـێکن لـە مـرۆڤ؛ ئوممەتی مسوڵمانیش لەسەریەتی ستەمیان لەسـەر لابـبات و بـە دادوەری بەهـرەوەریان بکـات.. دوای ئـەوە جـیهاد بـەرەو بەدیهێـنانی بیرۆکـەی شۆڕشـێکی جـیهانی بڕوات، نـەك بـەرەو فەرمانـڕەوایی و دەسەڵات ز دەسکەوت، بەم جۆرە شۆڕشە ئاشتی بە هەموو جۆرەکانیەوە دێتە دی؛ ئاشـتیی ویـژدان و ئاشـتیی مـاڵ و ئاشـتیی کۆمـەڵگا و... لە کۆتاییدا ئاشتیی مـرۆڤایەتی. ئاشـتیەك لە سایەی دادوەرییەکی گشتگیر، ئەو دادوەریەی ئادەمیزاد دەسـتی دەکەوێت تەنها لەبەر ئەوەی ئادەمیزادە، لەبەر ئەوەی مافی خۆیەتی وەکو مـرۆڤ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ

الْوَالِدَيْـــنِ وَالأَقْرَبِينَ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، بە یەکسانی و بێجیاوازی بە کاری مەردم ڕابگەن و، بۆ خواش شایەتی بدەن، هەرچەندە شایەتیدانەکە بەزیانی خۆتان، یـان دایـك و بابـتان و خزمانـتان بێت.﴾النساء/١٣٥.. ﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى: دوژمـنی و قینی دەستەیێك هەڵتان نەنێ بـە هەقانـەت ڕەفـتار نەکەن، بە یەکسانی و بێجیاوازی لەگەڵ خەڵکا ڕەفتارکردن دەبێتە هۆی پتر نزیك بوونەوە لە پارێزکاری.﴾المائدة/٨.

ئـەم هێڵانە سروشتی ئاشتیی جیهانی لە ئیسلامدا وێنا دەکات، ئەوە ئاشتیەك نـیە بـە مانـا تەسـکەکەی، واتـە دورکەوتـنەوە لـە جەنگ بە هەر نرخێك بێت و وازهێنان لە جەنگ لەسەر هەر بنەمایەك دامەزرابێت.

ئاشـتی هەیـە سـوك و هەرزانـە، ئـەو ئاشـتییەیە، کـە لەسـەر بـەرژەوەندی مـرۆڤایەتی دامـەزراوە، لەسـەر حیسابی بنەما بەرزەکانی مرۆڤایەتی دامەزراوە، ئـەو بنەمایانەی کە خوای گەورە بۆ ئادەمیزادی دەوێت لەسەر زەویدا، ئەمەیە ئەو ئاشـتییەی خـوای گەورە مسوڵمانانی لێ ئاگادار دەکاتەوە: ﴿فَلاَ تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّـلْمِ وَأَنْتُم الأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ: سسـت مەبنەوە و داوای شەڕ وەستان مەکەن، هەر ئێوە بەسەر ئەواندان، ئێوە خوداتان لەگەڵە.﴾محمد/٣٥.

بەسـەر ئەواندان لەبەر ئەوەی ئێوە وێنەی بەرزی ژیان دەنوێنن، ئەو وێنەیەی کە دەبێت سەرکەوێت لەو کاتەی خەڵك بڕوای پێ دەهێنێت، لەبەر ئەوەی وتەی خوایە: ﴿إِنْ تَنصُـــرُوا اللَّـــهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ: ئەگـەر خـودا بەسەر بخەن، خوداش بەسـەرتان دەخـا و لەبـەر نەیاران نابەزن.﴾محمد/٧.. ﴿وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّـــهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ، الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْـــرُوفِ وَنَهَوْا عَنَ الْمُنْكَرِ وَلِلَّه عَاقِبَةُ الأُمُورِ: خـودا ئەوانە سەر دەخا کە خودا سـەر دەخـەن، دیاریشـە خـودا زۆر بەهـێز و دەسـەڵاتە.. ئەوانـەی کە ئەگەر لەم زەمیـنەدا دایانمەزرێـنین، نوێژکـەر و زەکاتدەرن و فەرمان بە چاکە دەدەن و بەر لە کاری خراپ دەگرن، سەرەنجامی هەموو کاریش هەر بۆ خوایە.﴾الحج/٤٠-٤١.

کەواتــە ئیســلام لــە جـیهادێکی بەردەوامی بێبڕانەوەدایە بۆ بەدیهێنانی وتەی خـودا لــە زەویدا، واتە بەدیهێنانی سیستەمێکی چاك، کە لەسەر بنەما بەرزەکانی لــە جـیهانی تـاك و جـیهانی کۆمــەڵ و جیهانی مرۆڤایەتی دادەمەزرێت؛ ئیسلام ڕاسـپێردراوە کە لەگەڵ هیچ هێزێك لە هێزەکانی زۆرداران لەسەر ڕوی زەوی نەرمی نەنوێنێـت، چ ئـەو هـێزە بەشـێوەی تاکـێك بێـت خـۆی کردبێـت بە خوای تاك و کۆمەڵـەکان، یـان بەشـێوەی چـینێك بێت چینەکان بچەوسێنێتەوە، یان لەشێوەی دەوڵەتـێکدا بێـت دەوڵـەتان و گـەلان بچەوسـێنێتەوە.. ئەوانـە هـەموو لـە دابی ئیسـلامدا یـەك شـێوەن، شێوەیەکی پێچەوانە لەگەڵ بنەما سەرەکیەکانی؛ بەپێی توانـا پێویسـتە لەسـەری جـیهادی لەگـەڵدا بکـات، پێویسـتە نـەرمی لەگـەڵدا نەنوێنێـت، مەگـەر بۆ خۆ کۆکردنەوە، هەروا لەسەریەتی بەهیچ جۆرێك هاوکاریی نەکات و لە ڕیزی ئەودا نەوەستێت: ﴿وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ: لەسەر تاوان و غەدر یارمەتی یەکدی مەدەن.﴾المائدة/٢.

هێزی ئیسلام هێزێکی ڕزگارکەرە، لە زەوی دەردەچێت تا لە بناغەکانی ستەم و بە کۆیلەکردن و چەوساندنەوە بدات. ئەویش لەو بوارەدا تەماشای ڕەگەز و ڕەنگ و زمـان و زەوی ناکـات، خـەڵك وەکـو یـەکن، هـەموویان خـەڵکن، بـەڵام بیرۆکەی نەتەوەگـەریی تەسـك، کـە ئـەوروپا لـەخۆی گرتووە و، پەتاکەی لە سنورە تەسکە لاوازە پوچەکەی بە ئێمەش گەیشتوە، ئیسلام دان بەوەدا نانێت، چونکە پێچەوانەی تێڕوانینەگشتییەکەیەتی لە یەکیەتی مرۆڤایەتیدا..

سـتەم لـە هـەر کوێـیەك هەبێـت، ئیسلام لەسەریەتی لایبات. جا ئەو ستەمە لەسەر مسوڵمانان بێت یان پەیماندار(ذمي)یەکان بێت-ئەوانەی ئیسلام پاراستنیانی لەخۆگـرتوە-، یـان لەسـەر کەسـانێکی دیکە کە هیچ پەیمان و ڕێکەتنێکی لەگەڵ مسـوڵماناندا نەبێـت.. سـتەمترین ستەمیش بە کۆیلەکردنی بەندەکانە بۆ جگە لە خـوا و دانـانی ئـەو خوایانەیـە، کـە دەستورێك دادەنێن، کە خودای گەورە ڕێگەی پێنەداوە.

ئیسـلام لە هەر کوێیەك لەگەڵ تاکێکی ستەمکار، یان چینێکی ستەمکار، یان دەوڵەتـێکی سـتەمکار ڕوبـەڕوو بووەوە، بۆیە ڕوبەڕووی دەبێتەوە، چونکە کۆمەڵە مرۆڤـێکن و سـتەم لە کۆمەڵە مرۆڤێك دەکەن، نەك لەبەر ئەوەی ڕەش، یان سور، یـان زەرد، یـان سـپین، نـەك لەبـەر ئـەوەی مەسـیحی، یان جولەکە، یان هاوبەش پەرسـتن.. بـەو ئەندازەیە ڕوبەڕوویان دەبێتەوە، کە بەدیهێنانی وتەی خوایان لەسەر زەوی لەکارخسـتووە. وەدیهێـنانی ئاشـتیی ڕاسـتەقینەی بـەرەی ئادەمـیزادیان لەکارخسـتووە.. توندوتیژ دەبێ لەگەڵ هەرکەسێك، بەپێی ئەو بەشە لەکارخستنەی پـێی براوە،دەبێـت، بەپـێی سەرسـەختی و گومـڕایی و خراپەکارییەکەی دەبێت.. ئەگـەر ئـەو هـێزە زۆردارە خۆی دایە دەستەوە یان ڕێنمون بوو، ئەوا تاکەکان دوای ئەوە ئازادن لەو بیروباوەڕەی هەڵی دەگرن، لەژێر سایەی سیستەمێك کە خوایەتی و پەروەردگاریـەتی تەنها بۆ خوا بڕیار دەدات و دەسەڵات و، گوێڕایەڵی تەنها بۆ ئەو دادەنێت.

ئیسلام بەسێ ڕێگا ڕوبەڕووی ئەو هێزانە دەبێتەوە، کە لەڕوویدا دەوەستن: یان ئیسلام بون- یان جزیەدان- یان جەنگ.

ئیسـلام بـوون لەبـەر ئـەوەی دوا وێنەی ئایینی هەمیشەیی خوایە و، ڕێنمونی هـەموو مرۆڤایەتیـیە، ئـەو چـرایایە، ئـەو یاسـا و بەرنامەیـە، کـە دادگـەریی مرۆڤایەتیی گشتگیر بۆ هەموان بەدی دەهێنێت.

بەڵام جزیەدان لەبەر ئەوەی بەڵگەی دەست هەڵگرتنە لە بەرگری و، وەدیهێنانی ئـازادیی بانگـەواز و، لابـردنی ئـەو هـێزە ماددیانـەی ڕێگرن لە نێوان بانگەواز و خەڵکدا.

بـەڵام جـەنگ(قـتال) لەبـەر ئەوەی لەو حاڵەتەدا دوا وەڵامە بۆ ئەو بەرگرییەی ڕێگـەی وتـەی خـوا، کـە سـورن لەسـەر ڕێگرییـەکەیان و سەرکێشـی دەکـەن و، مـرۆڤایەتی لـەو ڕونـاکی و دادگەری و ئاشتییە گشتگیرە، بێبەش دەکەن، کە ئەو وتەیە لەخۆی دەگرێت.

ئەگەر ئەوانەی داوای ئاشتی دەکەن خۆ بدەن بە دەستەوە، ئەوا ئەوانە پەیماندار(ذمّي)ن -واتە ئەوانەی بەپێی دەقی راشکاوی ئیسلام هەمان مافی مسولّمانانیان هەیە و هەمان ئەرکی مسولّمانانیان لەسەرە، ئەو جزیەیەش کە لێیان وەردەگیرێت، بەرامبەر ئەو زەکاتەیە کە مسولّمانان دەیدەن، هاوبەشییەکە لە خەرجییەکانی ئەو دەولّەتە دەیانپارێزێت، هەروەك خەلّکە مسولّمانەکانی خۆی دەپارێزێت، ئەو دەولّەتەی، کە بەبێ جیاوازی دادوەری رەهایان بۆ دابین دەکات ، لە حالّەتی نەخۆشی و پەککەوتن و پیریدا، دەستەبەری و دلّنیاییان بۆ دابین دەکات.

ئیسلام نەیویست زەکات دانیان لەسەر فەرز بکات، لەبەر ئەوەی زەکات پەرستشێکی ئیسلامیی تایبەتە، ئەو ئازادیی بیروباوەڕەی ئیسلام بۆ تاکەکان دەستەبەریی دەکات، رێگرە لەوەی پەیماندارەکان ناچاربکات بە بەجێهێنانی پەرستشێکی ئیسلامی، هەروا نەیویست زۆریان لیّبکات بۆ سەربازی لە ڕیزی مسولّماناندا، لەبەر ئەوەی مسولّمان لەپێناو خوا جیهاد دەکات وەك پەرستشێك بۆ خوا. لەبەر ئەمە باجیان لەژێر ناوی (جزیە) لیّ دەستێنێت نەك لەژێر ناوی (زەکات)، وەك ڕەچاوکردنێکی ئەو بنەما ئیسلامییە گشتییەی، کە دەلّێت: ((لا إکراه في الدین: لە ئاییندا زۆرلیّکردن نیە)).

جا ئەگەر ئەوان بە رەزامەندیی و هەلّبژاردنی خۆیان ویستیان، وەك مسولّمانان باجی زەکات بدەن لە جیاتی جزیە، ئەوە بۆیان هەیە بیدەن.. هەروەك هۆزی (بەنی تغلب) لە سەردەمی (عمر)دا ئەوەیان هەلّبژارد، کە زەکات بدەن نەك جزیە، جا لەسەر ئەو بنەمایە زەکاتیان دەدا.[1]

بۆیە هیچ شتێك لەوە سەیرتر و پیستر نیە، کە گومان و ترس بورووژێنی سەبارەت بە کەمایەتیە مەسیحیەکان و ئەو نامسولّمانانەی دیکە، کە لەناو ئوممەتی ئیسلامیدان، ئەگەر ئیسلام حوکم بکات. ئەوە پڕوپاگەندەیێکی پیس و

---

[1] کتێبی (الدعوة الی الإسلام) دانانی (سیر ت.و.ارنولد) و وەرگێڕانی بۆ عەرەبی (حسن ابراهیم) و دوو هاوڕێکەی، ل٤٩.

مەبەستدار و خراپەکارە، کە هەندێکجار کۆمەڵێك لە بێعەقڵ و پیسەکانی ئەو کەمایەتییانە دەیگرنە بەر، کە دەرونیان بە تەواوی لە رك و کینە بەرامبەر بە ئیسلام نقووم بووە، لەبەر هیچ نا، تەنها لەبەر ئەوەی ئیسلامە. هەندێك جاریش کەسانێك ئەم شێوازە دەگرنە بەر، کە ناوی مسولمانیان هەڵگرتوە، ئەوانە هیچ و پوچێکی ئادەمین، هەوڵ دەدەن پەنا بەرنە بەر پروپاگەندەی بۆگەن؛ چونکە هەندێك پێویستی کەمیان لە سودی ماددی، یان ناوبانگ، یان پروپاگەندە بۆ کەسایەتیە لاوازەکانیان دەست دەکەوێت؛ چونکە بەم شێوەیە، لەلایەن مژدەدەر و رۆژهەڵاتناسە خاچپەرستەکانەوە بە خۆشیەوە ئامێزیان بۆ دەکرێتەوە، بەهۆی ئەو خزمەتەی بە خاچپەرستیەتی دەرەکیی دەکەن، کە پیاوی مسولمان یان پیاوی نەسڵزادە هەرگیز ئەمە ناکات!

## گیانی لێبوردەیی مرۆڤانە

ئەوەی لە گیانی لێبوردەیی مرۆڤانە لەئیسلامدا هەیە، هیچ خاوەن ویژدانێك ناتوانێت نکوڵی لێ بکات، یان پەناوپێچی تێدا بکات؛ ئەویش ئەو لێبوردەییەیە، کە بە تێکرای مرۆڤایەتی بەخشراوە، نەك تەنها بۆ ڕەگەزێك، یان هەڵگرانی بیروباوەڕێکی دیاریکراو، بەڵکو بۆ ئادەمیزادە بەو سیفەتەی، کە ئادەمیزادە.

کاتێك ئیسلام ئەرکی خۆی لە ڕێنوێنی مرۆڤایەتی بەجێ دێنێ و، بە ئەرکی لابردنی ستەم و خراپەکاری هەڵدەستێت، تا هیچ دەسەڵاتێکی توندڕەوانەی لەسەر تاك، یان نەتەوەیەك نەمێنێت و، لە سینەشیدا هیچ گرێیەك بەرامبەر چینێك، یان ڕەگەزێك نامێنێت.

ئەوە ئەو گیانەیە کە دەتوانێت ئاشتی لەسەر زەوی بچەسپێنێت، هەموو رەگەز و ڕەنگەکان بە یەك ئاشنا بکات، لێبوردەیی و خۆشەویستی و بەزەیی لەنێوان نەوەی مرۆڤایەتی بڵاو بکاتەوە، کەش و هەوای ژیان لە ژەهری ئێرەیی تاك و، ململانێی چینایەتی و، دژایەتی ڕەگەزپەرستی پاك دەکاتەوە، هەروەك ئەو جەنگ

و کوشتارانە ڕادەگرێت، کە بەو هۆیانەوە، یان لەبەر ئارەزووی داگیرکردن و فراوانخوازی تەنها بۆ بەکارهێنانی ماددی، یان گەورەبییەکی درۆینە دروست دەبێت.

لە بنەما گشتییەکانی ئیسلامدا وێنای ئەو گیانە مرۆڤانە بێگەردە کراوە:

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لە نێر و مێیەکەوە دروست کردووە و کردوومانن بە چەندین گەل و هۆز، تا یەکدی بناسن.﴾الحجرات/١٣.

﴿وَلاَ تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلاَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَأُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ: ئەگەر لەگەڵ ئەهلی کتێبدا دەکەونە وتوێژەوە، بەوپەڕی نەرم و نیانی قسەیان لەتەکا بکەن، مەگین لەتەك ئەوانەی کە ناهەقییان کردووە، ئێوە بڵێن: بەو قورئانە کە بۆ ئێمە هاتە خوار و بەو کتێبەی بۆ ئێوە هاتۆتە خوار، بڕوا دەکەین، خودای ئێمە و خودای ئێوە هەر یەکێکە، ئێمە خۆمان بەو دەسپێرین.﴾العنكبوت/٤٦.

﴿قُلْ لِلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ أَيَّامَ اللَّهِ: تۆ بە بڕواداران بڵێ: با ئەو کەسانە ببەخشن کە بۆ ڕۆژەکانی خودا بەهیوانین.﴾الجاثية/١٤.

(جابری کوڕی عبدالله) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ((جەنازەیەك بەلاماندا تێپەڕی، پێغەمبەر هەستایەوە و ئێمەش هەستاینەوە. گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە جەنازەی جولەکەیەکە! فەرمووی: (أَوَ لَيسَت نَفسًا؟ إِذَا رَأَيْتُمْ الْجِنَازَةَ فَقُومُوا: ئەی ئەویش نەفسێك نیە؟ ئەگەر جەنازەیەکتان بینی هەستنەوە.))[1]

بەم لێبوردەییە مرۆڤانە بێگەردە، جێنشینەکانی پێغەمبەر و، زۆربەی مسوڵمانانیش ڕێگایان گرتەبەر، جگە لە چەند کەسێکی کەم وا دەرکەوت، کە توندڕەو و ڕەگەزپەرست بێت، بەبێ ئەوەی ئەرکێکی ئایینی بێت، یان بۆ لادانی ستەمێك یان هەڵگرتنی خراپەکارییەك بێت. ئەو ڕەفتارانەش لە کەسانێك ڕویداوە، کە بە نوێنەری ئیسلام دانانرێن و لە بنەما بەرز و گیانە مرۆڤانەکەی ئیسلام تێنەگەیشتوون.

---

[1] البخاري

عومەری کوڕی خەتتاب پیرێکی کوێری بینی لە دەرگاکان دەڕۆزە دەکات، پرسیاری کرد، زانی کە ئەوە جولەکەیە، پێی گوت: چی وای لێکردی ئەمە بکەی؟ وتی: سەرانە(جزیە) و پێویستی و بەساڵدا چوون. عومەریش دەستی گرت و بردی بۆ ماڵی خۆی، پێویستیی ئەو کاتەی پێدا، ئنجا ناردی بۆ لای سەرپەرشتیاری خانەی دارایی(بیت المال) و پێی گوت: ئەمە و هاوشانەکانی لەبەرچاو بگرە، بەخوا لەگەڵی دادوەر نەبوین، گەنجیەکەیمان خوارد، لە کاتی پیریشدا زەلیلی دەکەین. ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ: زەکات دەبێ بدرێتە هەژاران و کەمدەستان.﴾، ئەمەش لە هەژارەکانی ئەهلی کیتابە.

کە سەفەری کرد بۆ دیمەشق، بەلای کۆمەڵێك گاوری هەژاردا تێپەڕی، کە توشی گولی ببون، فەرمانی دەرکرد، کە لە ماڵی زەکات بەشیان بدرێت و بژێوییان بۆ دابین بکرێت.

ئەم گیانە بێگەردە بوو، کە خەڵکی بۆ ئیسلام ڕاکێشا، وایکرد بەو خێراییە سەیرە لەرادەبەدەرە بە زەویدا بڵاو بێتەوە، خەڵك لە دەست چەوساندنەوەی ئایینی و ڕەگەزپەرستیی بڵاوی ئەو کاتە ڕایان دەکرد بەرەو ئیسلام و، چاوەڕوانی لێبوردەیی و دادوەری و یەکسانیان لێ دەکرد.

لە کتێبی (الدعوة الی الإسلام)دا لە دانانی (سیر ت.و.ارنولد)ە و (حسن ابراهیم و دووهاوڕێکەی وەریان گێڕاوە)، لە لاپەڕە -٥٣- و دواتردا هاتووە:

"میخائیلی گەورە Michael the Elder توانی لە ڕێگای (انطاکیة)ی یەعقوبی لەو نوسینانەیدا، کە لەنیوەی دووەمی سەدەی دوانزەدا نووسیبووی، ئەوانە کۆبکاتەوە، کە برا هاوئایینەکانی نوسیبوویان، هەروا جێ پەنجەی خوا ببینێت لە رزگارکردن(فتح)ە عەرەبیەکاندا، هەتا دوای ئەوەی کەنیسە ڕۆژهەڵاتیەکان بۆ ماوەی پێنج سەدە فەرمانڕەوایی مسوڵمانانیان دیت، دوای باسکردنی چەوساندنەوەکانی هیرەقل دەنوسێت و دەڵێت:

{ئەمەیە هۆی ئەوەی، کە خواوەندی تۆڵە کە لە هێز و دەست ڕۆیشتندا تاك بوو، کە بە ئارەزووی خۆی دەوڵەتی مرۆڤەکانی بەڕێوە دەبرد، بەوەی دەبەخشی کە

خۆی ئـارەزووی لێـیە، سـوك و بێبـەهاكانی بـەرز دەكـردەوە، كاتـێك زۆرداریی ڕۆمـەكانی بیـنی، ئەوانـەی بە هێز كەنیسەكانمانیان دزی و وڵاتمانیان تاڵان كرد و، سـزایەكی بێ سۆز و بەزەیی بەسەرماندا سەپاند، ڕۆڵەكانی ئیسماعیلی لە وڵاتانی خوارووەوە نارد، تا لە چەنگی ڕۆمەكان رزگارمان بكەن.

لـە ڕاسـتیدا ئەگـەر پێشـتر ئـێمە بەرگەی كەمێك زیانمان گرت بەهۆی ئەوەی، كەنیسـە كاسۆلیكییەكانیان لەئێمە ستاند و دایان بە خەڵكی (خلقیدونی)، جا ئەو كەنیسـانە هـەر لای ئـەوان مایەوە، كاتێك شارەكان كەوتنە دەست عەرەبەكان، بۆ هـەر تیرەیـەك ئـەو كەنیسـانە تـەرخان كـرا، كـە لەژێـر دەستیان بوو-لەو كاتەدا كەنیسـەی (حمـص)ی گەورە و كەنیسەی (حران) لێمان ستانرابوو-، لەگەڵ ئەوەشدا دەسـتكەوتێكی كەم نەبوو، كە لە توندوتیژی و ئازاردان و داپلۆسین و ڕەفتاری ڕەقی ڕۆمەكان رزگارمان بوو و، خۆمان لەئاستی و دڵنیاییدا بینییەوە.

{كاتـێ سـوپای ئیسـلامی گەیشتە دۆڵە ئەردەن و (ئەبو عوبەیدە) لە (فحل) سـەربازگەی دامـەزراند، خەڵكـە مەسیحییەكەی ئەم وڵاتە نامەیان بۆ عەرەبەكان نوسـی و وتـیان: ((ئـەی مسـوڵمانینە، ئێوە لای ئێمە لە ڕۆمەكان خۆشەویستترن، ئەگـەریش ئەوان لەسەر ئایینی ئێمەن، ئێوە بەوەفاترن بۆمان، بەسۆزترن لەگەڵمان، سـتەمان لەسـەر لادەدەن، فەرمانڕەواییتان چاكترە لەسەرمان، بەڵام ئەوان ناچاریان كـردوین و بەسـەرماندا زاڵ بـوون)).. خـەڵكی (حمص) دەرگای شارەكەیان بەڕووی سـوپای (هیرەقـل)دا داخسـت، هەواڵیان بە مسوڵمانەكان دا، كە سەرپەرشتیاری و دادوەریی ئەوان خۆشەویستترە لایان لە ستەم و توندوتیژیی ئیغریقییەكان.

{ئەمـەبوو حـاڵ و بـاری هەسـتەكان لـە وڵاتـی شامدا، لەكاتی ئەو غەزایەی لەنـێوان سـاڵەكانی ٦٣٣ و ٦٣٩ز ڕوویـدا، كە تیایدا عەرەبەكان بەرەبەرە سوپای ڕۆمـیان لـەم ویلایەتە وەدەر نا.. ئەو كاتەی دیمەشق بووە نمونە لە بەستنی پەیمانی ئاشـتی لەگـەڵ عـەرەب سـاڵی ٦٣٧ز. و بەمە لە تاڵان دڵنیابوو، هەروەك هەندێ مـەرجی گونجـاوی دیكەیشی دابین كرد، شارەكانی دیكەشی شامیش لەو ڕێچكەیە دوانەكـەوتن، ئـەوەبوو (حمـص) و (منـبج) (Hieropolis) و چـەند شـارێكی

دیکـەش پەیمانــیان بەسـت و بەو پێیە بوونە سەر بە عەرەبەکان. بەڵکو (بەتریق)ی (بیـت المقـدس)یـش بە مەرجی هاوشێوە شارەکەی دایە دەستەوە. ترسی ڕۆمەکان لـەوەی ئیمـبراتۆر ناچاریان بکات شوێن مەزهەبەکەی بکەون، وایکرد ئەو پەیمانەی مسـوڵمانان بـە خۆیـان دابـوو لـە ئـازادی ئاییـنی، لەدڵیان خۆشەویستتر بێت لە پەیوەسـت بوونـیان بـە دەوڵـەتی ڕۆمـانی، یـان هەر حکومەتێکی مەسیحی. ئەو ترسـەی سـەرەتای دابەزینی سوپای رزگارکەر بۆ وڵاتەکەیان پەیدا بوو، زۆری نەبرد ڕەویـیەوە و پەرۆشـییەکی بەهـێزی بەشـوێندا هـات، کـە لە بەرژەوەندیی عەرەبە ڕزگارکەرەکاندا بوو.

{بـەڵام ویلایەتەکانی دەوڵەتی بێزەنتی، کە هەر زوو مسوڵمانەکان بە بە دلێری و ئازایـەتی خۆیان دەستیان بەسەردا گرت، لە بارێکی لێبوردەیی وادا ژیان، کە بە درێژایـی چـەندین سـەدە بەخۆیانـەوە نەدیـبوو، بـەهۆی بڵاوبوونـەوەی بیروباوەڕی (یـەعقوبی و نەسـتوری) لـەناویاندا، ئەوەبوو مسوڵمانەکان ڕێگەیان پێدان دروشمە ئایینـیەکانی خۆیـان ئەنجام بدەن، بەبێ ئەوەی کەس ڕێیان لێ بگرێت، تەنها چەند پـێوەندێك نەبێـت، کـە لەسـەریان فـەرز کـرا، تـا تـێکگیران لەنـێوان ئاییـنە بەرامـبەریەکەکاندا ڕوونـەدات، یـان بـەهۆی دەرخسـتنی ڕێوڕەسمە ئایینییەکان و شانازی پێکردنەوە ڕەگەزپەرستی نەوروژێنێت و هەستی مسوڵمانان ئازار نەدات.

دەتوانـین ئاسـتی ئەو لێبوردەییە-کە لە سەدەی حەوتەمدا سەرنج ڕادەکێشێت- لـەرێی ئـەو پەیمانانـە هەڵبسـەنگێنین، کـە عەرەبـەکان دایـان بە دانیشتوانی ئەو شـارانەی دەسـتیان بەسـەردا گـرت، پەیمانـیان پێدان کە گیان و ماڵیان بپارێزن و، ئازادیی ئایینییان بۆ ڕەها بکەن، بەرامبەر بە گوێڕایەڵی و جزیەدان.

{ئاسـان نـیە درێـژەی ئـەو پەیمانانـە بـە وردی کـورت بکەیـنەوە، بەهۆی ئەو زیادانـەی تـیایاندایە. جـا ئـەو وردەکاریانە وەکو وشە ڕاست بن یان نا، لایەنێکی زۆرگـرنگە لـەو ڕووەوە، کـە گـێڕانەوەی مێژوویی دەنوێنێت، ئەوەی کە مێژوونووسە مسوڵمانەکان لە سەدەی دووەمی کۆچی وەریان گرتووە -ئەمەش ئەو گێڕانەوانەیە، کـە ئەسـتەمە پاڵپشتیەکەی خۆی ڕابگرێت، ئەگەر بەڵگە هەبێت لەسەر سەلماندنی

پێچەوانەکەی-، چی تیادا نیە، کە لێرەدا ئەو مەرجانە بهێنینەوە، کە گوایە خەلیفە (عومەری کوڕی خەتتاب) داینا، کاتێك (بيت المقدس)ی وەرگرت:

بەناوی خوای گەورەی میهرەبان، ئەمەیە ئەو دڵنیاییەی بەندەی خوا و ئەمیری بڕواداران بە خەڵکی (یلیاء)ی بەخشی، دڵنیایی بۆ خۆیان و ماڵیان و کەنیسەکانیان و خاچەکانیان و نەخۆشیان و لەش ساغیان و هەمو خەڵکەکەکانیان؛ کەس لە کەنیسەکانیان نیشتەجێ نابێت و ناڕوخێنرێت و، سوکایەتی پێناکرێت و لێی کەم ناکرێتەوە، سوکایەتی بە خاچەکانیان ناکرێت و، لە سامانەکانیان کەم ناکرێتەوە (لەسەر دینەکەیان زۆریان لێ ناکرێت و زیان لە هیچیان نادرێت).

{باجی پێنج دینار لەسەر دەوڵەمەند و چوار دینار لەسەر چینی ناوەڕاست و سێ دیناری لەسەر هەژارەکان دانا.. عومەر بە هاوڕێیەتی (بەتریق) سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی کرد، دەڵێن: لە کاتێکدا لە کەنیسەی (قیامە)دا بوو، کاتی نوێژ داهات، (بەتریق) داوای لە عومەر کرد لەوێ نوێژ بکات، بەڵام ئەو بیری کردەوە و داوای لێبوردنی کرد و گوتی: ئەگەر ئەو ئەم کارە بکات، ئەوا لەدوای ئەو، شوێنکەوتەکانی دەڵێن ئێرە شوێنی پەرستنی مسوڵمانانە.

{لەو شتانەی لەگەڵ ئەم گیانی لێبوردەییەدا دەگونجێت، ڕەفتار چاکی عومەرە لەگەڵ هەڵگرانی ئایینەکانی دیکە، کە لەژێر فەرمانڕەوایی ئەودا دەژیان، ئەوەی لێی دەگێڕنەوە کە فەرمانی داوە بە بەخشینی ماڵی زەکات بەو نەصرانییانەی تووشی گەڕی بووبوون و بژێوییان بۆ دابین بکرێت. ئەو، پەیماندار(ذمي)ەکان- هەڵگرانی ئایینەکانی دیکە کە هاتونەتە ژێر پاراستنی مسوڵمانان- لە یاد ناکات، هەتا لە دوا ڕاسپاردەکانی کە دەیدا بەو کەسەی لەدوای ئەو جێی دەگرێتەوە، دەربارەی ئەو ئەرکەی پێویستە لەو پایە بەرزەدا پێی هەڵبسێت، گوتی: (ڕای دەسپێرم بە پەیماندارەکانی خوا و پەیماندارەکانی پێغەمبەر، کە بەڵێنەکانیان بۆ بباتە سەر و زیاد لە توانا ئەرکبار نەکرێن).}"

بەم لێبوردەییە و ئەم دادوەرییە، ئیسلام لە ڕابردوودا توانی و لە داهاتووشدا دەتوانێ، ئاشتی جیهانی لە زەویدا وەدی بهێنێت، لەبەر ئەوەی شتێك بە خەڵك

دەبەخشـێت، کـە هـیچ بیروباوەڕ و سیستەمێکی دیکە نایبەخشێت، هەموویان لە یـەك کـاروانی مرۆڤایەتیدا بەڕێوە دەبات، لە سایەیدا هەست بە ئاشتی و ئاسایش دەکات.

بەڕێز (جب) لە کتێبەکەی (الی أین یتجه الإسلام Whiter Islam) دەڵێ:

"ئیسـلام هێشتا لەتوانایدایە خزمەتێکی بەرز و بەڕێز پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکـات، هیچ دەزگایەکی دیکە نیە سەرکەوتنێکی بێهاوتا بەدەست بێنێت لە پێك ئاشـناکردنی رەگـەزە دژیەکـەکانی مـرۆڤایەتی، لـە یـەك بـەرەو لەسـەر بناغەی یەکسـانیدا.. زانکـۆی ئیسـلامی لـە ئەفریقیا و هیند و ئەندەنوسیا، بەڵکو زانکۆ بچـوکەکەی چـین و، زانکـۆ تەسکەکەی یابان، هەموویان دەری دەخەن، کە ئیسلام هێشتا لەتوانایدایە دەسەلاتی بەسەر ئەو ڕەگەز و چینە جۆراوجۆرانەدا بسەپێنێت.

ئەگـەر مـلملانێ زەبەلاحەکانی رۆژهەلات و رۆژئاوا بخرێنە ژێر توێژینەوە، ئەوا بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێکە هەر دەبێت پەنا بۆ ئیسلام ببرێت."

لـەم بـوارەدا وام بـەباش زانـی گولـبژێرێك لـە گوتـەکانی دوو پیاوی ئەوروپی نەصـرانی بێـنمەوە، چـونکە شـایەتیەکەی ئـەوان بـۆ ئیسـلام لـەکۆن و نوێـدا بە لێـبوردەیی ڕەهـا و، دادوەریـی گشـتی لە رەفتارکردن لەگەڵ دژە بیروباوەڕەکانی، ئاشـتیەکە لەسـەرووی ئاسـتی گومانـە، ناکرێت لە هەڵچونێکی ئایینی بۆ ئیسلام دەرچووبێت، یان زیادەڕۆیی بێت لە ئاشکراکردنی ڕووە گەشەکانی!

لێـبوردەیی مـرۆڤانە، ڕەگەزێکی گرنگە لە چەسپاندنی ئاشتی، کە هەموو ئەو شارسـتانیانەی ئەمـرۆ سـایەیان بەسـەر جـیهاندا کـردووە لـە دەستیان داوە، ئەو جـیهانی بـەهۆی دەمـارگیریی ئاییـنی و، دەمـارگیریی ڕەگـەزی و، دەمـارگیریی مەزهـەبی پارچەپارچە بووە، بەهۆی ئەو دەمارگیرییە بێزراوە لە لێواری لەناوچوون ڕاوەسـتاوە، لەبـەر ئـەوەی گـیانی لێـبوردەیی مـرۆڤانەی تێدا نیە، گیان دادوەری ڕاستەقینە نـیە، بەهۆیـەوە رق و قین دەردەپەڕێت، چاوچنۆکیی ئابوری و نائابوری پەرەدەسـێنێت، ژیـانی مـرۆڤایەتی دەکاتـە دۆزەخـێك لـە جـەنگ و دۆزەخێك لە ئاشـتی، برسیەتی و ترسی تیادا بلاوە، نەتەوەکان لە بەرامبەر یەك بە هۆشیاری و

دوودڵییەکی بەردەوام ڕاوەستاون، باری دەروونی خەڵك قورس دەکات و دوچاری پاڵەپەستۆی دەماری و خوێنی دەکات، وایان لیٚ دەکات بەردەوام لە چاودێری‌کردنی خۆیان و خەڵکی دیکەدا بن، لە ترسێکی بێ دڵنیاییدا بن، لە رقێکی بێ ئاشتیدا بن، لە تاریکییەکی بێ تروسکەدا بن.

لەگەڵ هەموو ئەمانە، دەبینی ئەو شارستانیە شکست خواردوانە شانازی بەخۆیان دەکەن و بەرگری لە خۆیان دەکەن، ناخۆشی لەدوای ناخۆشی و جەنگ لەدوای جەنگ و، بەلاٚ لەدوای بەلاٚ تووشی مرۆڤایەتی دەکات. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی ئاسن و ئاگر و کارەبا و هەڵم لە دەست ئەودایە، خاوەنی دروستکردنی بۆمبی ناوکی و بۆمبی ئیدرۆجینی و مانگەدەستکردەکانە، بەلاٚم خاوەنی یەك گەردیلەی خۆشەویستی و یەك ڕەگەزی لێبوردەیی و یەك وزە لە وزەکانی مرۆڤایەتی نیە!

ئەمەیە ئەو ڕموزن بوون(مسخ)ەی تووشی گیانی مرۆڤایەتی دەبێت لە چەرخی تاریکی رۆحی و شکستدا.. هیچ دەستێك نیە ئەو گیانە چارەسەر بکات، هیچ تیشکێك نیە تاریکی و شاراوەکانی روناك بکاتەوە، مەگەر جارێکی دیکە ئیسلام پێشەوایەتی مرۆڤایەتی بکات، جا بگەڕێتەوە بۆ لێبوردەیی مرۆڤایەتی، دۆزینەوە و زانستەکانی بکاتە ئامێری بەزەیی و شارستانی و ئاشتی.

## ڕەگەزی ڕەوشت لە مامەڵە و هەڵسوکەوتدا

لە دیارترین جیاکەرەوەی گیانی ئیسلامی، زاڵبوونی ڕەوشتە بەسەر پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان لە ئاشتی و جەنگدا و، خۆدارنینە لە خۆویستییە بچوکە سنوردارەکەی، کە (وڵات) یان (نیشتمان) یان (ڕەگەز) یان (چین) دەپەرستێت و، بە ئامانجێکی پیرۆز و لەسەروی نمونەیی و ڕێبیر(مبدأ) و ڕەوشتی دادەنێت.

ئەو گیانەی بەسەر پەیوەندی نێوان دەوڵەتان و کۆمەڵاندا زاڵە، لە تێکڕای ئەو سیستەمانەی، کە زەوی ناسیویەتی-بێجگە لە سیستەمی ئیسلامی- کەشی ژیانی مرۆڤایەتی تێك دەدات و، وەکو ژیانی گورگەکانی دارستانی لیٚ دەکات، نە بەڵێن و نە پەیمانی تێدایە، جگە لە ناپاکی و دوڕوویی بواری شتی دیکە نیە.

مـرۆڤایەتی لـەو سـەردەمانەدا، کـە ئـەوروپا دەسـەڵاتدار بـوو، نمونـەی زۆری سـەردەمی دارستان و، چەندین وێنەی یاسای گورگانی بەخۆوە دیت. یاسای ناپاکی و دوڕوویـی و بێبـەهایی، شکاندنی بەڵێن و پەیمان، دڕاندنی ڕێکەوتنەکان، وەسف کردنی بەڵێننامەکان بەوەی کە پارچەکاغەزن.

هـەروا دڕەندەیـی وای بـەخۆوە دیت، کە دڕندەکان شەرم دەکەن ئەنجامی بدەن، دوایین ئەو دڕندایەتیە ئاشکرایە دوو بۆمبەکەی هێرۆشیما و ناکازاکی بوو.

مـرۆڤایەتی لـە داهاتووی نزیکیدا، جۆرەها غەدر و ناپاکیی بەخۆوە دەبینێت، جۆرەهـا دڕندەیـی بـەخۆوە دەبینێـت، کـە لەگەڵ گیانی ئەو شارستانیەتە ماددیە کافـرە بگونجێـت، ئـەو شارسـتانیەتەی بـڕوای بـە ئـایین و ڕەوشـت نـیە، ئـەو شارسـتانیەتەی خـۆی بـە هـیچ ڕێبیر و ویژدانێکەوە پەیوەست ناکات، بەشێوەیەك لەگـەڵ بیرۆکـەی مـاددی تاریکـیدا بڕوات، کە بەسەر ئەم شارستانیەتەدا زاڵە، جا هەرچـی ڕەگـەزی بـێجگە لـە بەرژەوەندی راستەوخۆ و دەمارگیری بۆگەن هەیە لە ژیان رەتی دەکاتەوە.

بیرۆکـەی مـرۆڤایەتی تـاك، لەژێـر سایەی ئەو شارستانیەتە گیان نزم و ویژدان بۆگەنـەدا، دوور لـە وەدیهاتن دەمێنێتەوە، هەرچەند بانگەشەی بیرۆکەی یەکیەتی جـیهان بکرێـت، لەبـەر ئـەوەی ئـەو یەکیەتیە دەبێ لەسەر بناغەی بیروباوەڕێکی ئـەدەبی و، گونجـاندنی پەیوەندیـیە ماددیـەکان و، بەڕێوەبـردنی ئامـێرەکان بـۆ بنیاتنانی ژیان نەك تێکشکاندنی، دامەزرێت.

چاوچـنۆکیی دەوڵەتان هەر حوکم دەکات، هەموو ناڕەوا و تاوان و دڕندایەتیەك بۆسیاسـی و سەرکردەکان حەڵاڵ دەکات، لەبەر ئەوەی ئاڕاستەی دەوڵەتێکی دیکە، یان ڕەگەزێکی دیکە، یان چینێکی دیکە کراوە!

هـەتا بیرۆکـەی پیرۆزیـی دەوڵـەت، یـان ڕەگـەز، یـان چـین -نـەك پیرۆزیـی مـرۆڤایەتی- فەرمانـڕەوا بێت، هیچ ڕێگرێك نابێت لەبەردەم ئەنجام دانی خراپترین تـاوان لە مافی خەڵکانی دیکە و، تاوانبار بە پاڵەوانێکی مەزن دادەنرێت و، ناپاك بـە سیاسـەتمەدارێکی لـێزان دادەنرێت، هەر بەو شێوەی، کە مرۆڤایەتی لە هەموو

مـێژوویدا بەخۆیـەوە دیـوە، جگـە لەو ماوەیەی، کە ئیسلام دەسەڵاتی هەبوو، کە تروسکی ڕوناکییەك بوو لە ناخی تاریکیەکاندا.

ئیسـلام -وەك باسمان کرد- هێزێکی ڕزگارکەرە، لە زەوی دەردەچێت، تا بەتەنها پەروەردگاریـەتی خـوای گـەورە بۆبـەندەکان بـڕیار بـدات، پاشان مرۆڤ لە کۆت و بـەندەکان ڕزگـار بکـات، ئـازادی و ڕۆشـنایی و ڕێـزیان پـێ ببەخشـێت، بـەبێ ڕەچاوکردنی دەمارگیری ڕەگەزایەتی، یان دەمارگیریی چینایەتی.

جـا ئەگـەر ئـەو هـێزە ڕوبـەڕووی هـێزەکانی خـراپەکاری و لەسنوردەرچوون و بەکۆیلەکـردن بـووەوە، ئـەوا تەنها دژی ئەو هێزە خراپەکارە تێدەکۆشێت و لەناوی دەبات، بەبێ ئەوەی هیچ ئامانجێکی داگیرکاری، یان ئابووری هەبێت.

((محمـد نـێردراوە تـا ڕێـنمونی خـەڵك بکـات، نـەك باج لەخەڵك وەربگرێ))، هـەروەك (عومـەری کوڕی عبدالعزیز) گوتویەتی، کاتێك ئەو سەرکارەی ناردبوو بۆ کۆکـردنەوەی سەرانە، سکاڵای ئەوەی دەکرد، کە بەهۆی مسوڵمان بوونی خەڵکەکە سەرانە کەم بۆتەوە!

کاتـێك ئیسـلام دەردەچـێت تا بە ئەرکی ڕزگارکردن و پاککردنەوە هەڵبستێت، ئـەوە لـەیاد ناکات کە بەرژەوەندی هەرەمەزنی مرۆڤایەتی یەکەم ئامانجیەتی، نەك بـەرژەوەندی تایبەتی ڕزگارکەرەکان خۆیان، یان بەرژەوەندی مسـوڵمانان بە تایبەت، کەواتـە هـیچ بوارێك نیە بۆ بیرۆکەی بیردۆزەی دەوڵەت یان ڕەگەز، کە قەدەغەکان حـەڵاڵ دەکـا و، بـیانو بـۆ کـاری خراپ دەهێنێتەوە و، غەدر و دوڕوویی و درۆ بە لێزانـیی سیاسـی دادەنێـت، یـان توندوتـیژی و تـاوان و دڕندایەتی بە پاڵەوانیەتی جەنگ دادەنێت.

بەڵێن و پەیمان پیرۆزە، هەرچەند ببێتە هۆی ئەوەی مسوڵمانان بەرژەوەندی نزیك و دەسـتکەوتی ویسـتراویان لەدەسـت بچـێت، شـەرەف ڕەچـاو دەکرێت، ئەگەریش مسوڵمانان دوچاری زیان و ناخۆشی بکات، هەستی مرۆڤایەتی لەبەرچاو دەگیرێت، هەرچەند جەنگەکە توندوتیژ بێت و شەڕ و لێکدانەکە گەرم بێت.

لـە کۆتاییدا، ئیسلام بە هەموو ئەمانە قازانجی کرد و زیانی لیٚ نەکەوت، گیان و دلّـی خەلّکی دەست کەوت، توندوتۆلّ بوونی ڕێبیرە بالآکانی دەستکەوت، کە بە مەبەسـتی بڕیار لەسەردانی لەسەر زەویدا هاتبوو، لە کۆتاییشدا بەهۆی پارێزگاری ڕەگـەزی ڕەوشـتی لـە ئاشتی و جەنگدا، ئەو زیانە لاوەکی و ناخۆشییە کاتییانەی دووچـاری بـبوو، هـەمووی بـۆ قـەرەبو کرایەوە، لە ماوەیەکی کورتدا بینیان چۆن سـەرکەوتنی خـودا و رزگارکـردن هـات و، چـۆن خەلّك دەستە دەستە دەهاتنە ناو ئایینی خوداوە.

ئیسـلام لە جیهانی نێو دەوڵەتیدا، بەلّکو لە جیهانی مرۆڤایەتیدا، پەیمان بردنە سـەری بەیاسـای خـۆی دانـا: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولاً: پەیمانیشـتان بەرنە سەریٚ، پەیمان پرسینەوەی لەسەرە. ﴾الإسراء/٣٤.

﴿وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ وَلاَ تَنقُضُوا الأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُم اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلاً إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ، وَلاَ تَكُونُوا كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَاثًا تَتَّخِذُونَ أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ أَنْ تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَى مِنْ أُمَّةٍ: ئـەو پەیمانـەی کـە لەگەلّ خودای دەبەستن بەجێی بێنن، سوێندەکانتان مەشکێنن، پاش ئەوەی کە لێـبڕان پێکـیان بێـنن و خوداتـان بە چاودێری خۆتان داناوە، دیارە خودا ئاگای لە کـردەوەتان هەیـە.. نەچـن وەك ئـەو ژنـە بکـەن کـە ڕیسـەکەی -لـەپاش گرژی- خاوکـردەوە و پسپسی کرد. سوێندەکانتان بکەنە هۆی فریودان، بەو بەهانەیەی کە فلانە گەل لە گەلی دیکە باشترن. ﴾النحل/٩١-٩٢

ئەمەیـە ئـەو بەهانەیـەی (دەوڵـەت) لـە ئـەوروپا دەیکاتـە پاسـاوی خـۆی بۆ شـکاندنی بەڵـێن و پەیمانـەکان. بەهانـەی بـەرژەوەندیی دەوڵـەت، قورئـان لێرەدا ئامـاژەی پیٚدەکـات: ﴿أَنْ تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَى مِنْ أُمَّةٍ﴾، ئاماژە بەوەش دەکات کە ئـەم ویستە بەهانە نیە بۆ پەیمانشکاندن، ڕێگری لە موسوڵمانان دەکات ئەو ڕێگایە بگـرنە بەر، بەڵێن شکێن بەو شێوە نابوتە دەچوێنیٚ ﴿كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَاثًا﴾.

خـوای گەورە چۆن پەیمان شکێنانی بەسوك و ناشیرین داناوە، هەتا لە گۆڕەپانی مـرۆڤایەتی وەدەری نـاون و، خستونیە ناو ئاژەڵان، هەروەش پەیمان بەجێگەیاندن و ئەنجامدەرانی بە مەزن داناوە:

﴿إِنَّمَــا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ، الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَلاَ يَنقُضُونَ الْمِيثَاقَ: ئـەم رامانـە هەر بۆ خاوەن ئاوەزانە، ئەوانەی پەیمانی خوا پێك دێنن و تازە لێی پاشگەز نابنەوە.﴾الرعد/١٩-٢٠.

﴿وَالَّذِيــنَ يَنقُضُــونَ عَهْدَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ أُوْلَئِكَ لَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ: ئەوکەسـانەی پەیمانیان دا بـە خـودا و پاشـان لـێی پاشـگەز بوونەوە و هەودای نێوان خۆیان و خودای خۆیان پسـاند -کـە خـۆی فەرمانی پێدابوون نەیپسێنن- و لە زەویدا بەدفەڕی دەکەن، لە بەهرەی خودا بێبەشن و دوارۆژی دژواریان هەیە.﴾الرعد/٢٥.

﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللَّهِ الَّذِينَ كَفَرُوا فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ عَاهَدْتَ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُــونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لاَ يَتَّقُونَ: خراپترینی زیندەوەران لای خودا ئەو کەسـانەن،کـە خودایـان نەناسـیوە و ئـیتریش بڕوا ناهێنن، ئەوانەی پەیمانت لەگەڵ بەسـتن و لەپاشـانا هـەمووجارێ پەیمانـیان هەڵدەوەشـێنن و هـیچ ترسـی خودایان نیە.﴾الانفال/٥٥-٥٦.

هــەتا ئــەو هاوبەش پەیداکەرانەی دژایەتی ئیسلام و مسولّمانانیان دەکرد و، بە شـێوەیەك ئازاریان دەدان کە نە پێشتر و نە لە پاشتر کەس وا ئازار نەدراوە -تەنها ئــەو ڕۆژە نەبێـت، کـە فەرمانـڕەوایی لـە ئـەندەلوس و لـە حەبەشە کەوتە دەست خاچپەرسـتەکان، هـەروا ئـەو ڕۆژەی فەرمانـڕەوایی لـە ڕوسیا و یۆغسلافیا و چین کەوتـە دەسـت شـیوعیەکان-، تەنانـەت ئەوانـەش، کـە خـوای گەورە دەربارەیان دەفەرمویـێت: ﴿كَـيْفَ وَإِنْ يَظْهَــرُوا عَلَــيْكُمْ لاَ يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلاًّ وَلاَ ذِمَّةً: چـۆن پەیمانـێك، کـە ئـەوان هـەرکاتێ بـزانن پێـتان دەوێـرن، بـەبێ ئـەوەی گوێ بدەنە سـوێندخۆری یـان خـزمایەتی، بـە گژتـاندا دێن.﴾التوبة/٨. هەتا ئەوانەش، خوای گــەورە لەسـەر مسـوڵمانان فەرز دەکات، کە پەیمانەکانیان بۆ بەرنە سەر، ئەمە لە

کاتـێکدا کـە دوافـەرمانی خـۆی دەربارەیـان دەرکردبوو،کە ئەوانە لەوەبەدوا هیچ بەڵـێن و پەیمانێکیان لەلایەن خوا و پێغەمبەرەکەی پێ نادرێت، بەڵام ئەوەی کراوە دەبـێ ڕەچاو بکرێت و، نابێت مسوڵمانان دەست پێشخەر بن لە شکاندنی؛ ﴿وَأَذَانٌ مِـــنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى النَّاسِ يَوْمَ الْحَجِّ الأَكْبَرِ أَنَّ اللَّهَ بَرِيءٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ فَـــإِنْ تُبْـــتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَـــرُوا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ، إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنْقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُوا عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ: خـودا و پێغەمـبەری خـودا لـە ڕۆژی حـەجی مـەزندا، لە خەڵك ڕادەگەیەنن کە خودا و پێغەمـبەری خـودا لـە بتپەرسـتان بـێزارن، ئەگـەر پەشـیمان ببـنەوە قازانجـتانە، ئەگـەریش قـبوڵی نەکـەن، لێتان ڕوون بێ کە لەدەست خودا دەرناچن، مژدەش بدە بەوانـەی خـودا نەناسن، بەشیان ئازاری بەژانە.. بێجگە لەو بتپەرستانەی پەیمانتان لەگـەڵ بەسـتوون و لەسـەر پەیمانەکەیان لانەکەوتوون و دژی ئێوە یاریدەی کەسیان نـەداوە، هـەتا مـاوەی پەیمانەکـە بەسـەر دەچـێ، ئـێوە پەیمانتان مەشکێنن. خوا پارێزکارانی خۆش دەوێت.﴾التوبة/٣-٤.

هـەتا ئـەو مسـوڵمانانەی لـە خانـەی ئیسـلام دوورن، ئەوانـەی کۆچـیان بـۆی نەکـردووە، کاتـێك مسـوڵمانان بەسـەر دوژمـناندا سـەردەخەن، ئەمـە ڕێگـە بە براکانیان نادات ئەو بەڵێننانە بشکێنن کە پێشتر بەستویانە؛ ﴿وَإِنْ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّيـــنِ فَعَلَـــيْكُم النَّصْـــرُ إِلاَّ عَلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ: گـەر ئەوان دەربارەی دیـنەکەیان یـاریدە لەئـێوە بخـوازن، لەسـەرتانە کۆمەکـیان بکـەن، مەگەر لەدژی ئەوانـەی لەگەڵ ئێوە هاوپەیمانن.﴾الانفال/٧٢. ئەمەش لوتکەی بەڵێن بردنە سەرە، کە هیچ دەربڕینێك پێی ناگات.

ئەمـە نمونەیـەکی بیردۆزەیـی و مەبدەئـێکی نمونـەیی نەبوو، بەڵکو ڕەفتارێکی واقـیعی بـوو لـە ژیـانی هەمو مسوڵمانان و پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکانیاندا. نمونە لەسـەر ئەمـەش لـە واقـیعی مـێژویی ئیسـلامدا زۆرە، لـەم شـوێنەدا کورتـەی هەندێکیان دێنینەوە:

(حوزەیفـەی کـوڕی یـەمان) دەڵـێ: هیچ وای لێنەکردم بەشداری (بەدر) نەکەم تـەنها ئـەوە نەبێـت، کە من و (حسیل) لە مەککە دەرچووین، کافرەکانی مەککە ئـێمەیان گـرت و گوتیان: دەتانەوێ بچن بۆ لای محمد؟ گوتمان: ئەومان ناوێ، تەنها دەمانەوێ بچینە مەدینە. جا بەڵێن و پەیمانیان لێمان وەرگرت، تا بچین بۆ مەدینە و لەگـەڵ (محمـد) نەجەنگین، کە هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا و هەواڵمان پێدا، فەرمووی: بڕۆن، بەڵێنەکەیان دەبەینە سەر و پشت بەخوا دەبەستین لەسەریان.

هـەندێك لـە هـاوەڵ پەیداکەران(مشرکین) پەیماننامەی (حدیبیە)یان شکان، لەو پەیمانـنامەیەدا هاتـبوو، کـە هـەر شـوێنکەوتەیەکی (محمد) هات بۆ لای قوڕەیش وەری بگـرن، هـەر شـوێنکەوتەیەکی قوڕەیـش هات بۆ لای (محمد) وەری نەگرێت. پێغەمـبەرﷺ بـە پەیمانـنامەکەوە پابـەند بـوو لەگـەڵ ئەوانـەی نەیانشـکاندبوو، لـەماوەی ئـەو پەیمانـەدا هـیچ قوڕەیشـییەکی وەرنەگرت.. (ابورافع)ی ئازادکراوی پێغەمـبەرﷺ دەڵـێ: ((قوڕەیـش ناردمیان بۆ لای پێغەمبەر، هەر کە پێغەمبەرم بیـنی ئیسـلام چـووە دڵـمەوە، گـوتم: ئەی پێغەمـبەری خوا! ناگەڕێمەوە بۆ لایان؟ فـەرمووی: مـن پـەیمان ناشـکێنم و نامەبەر ناگێڕمەوە، بگەڕێوە بۆ لایان، ئەگەر ئەمەی ئێستا لەدڵتا مایەوە، بگەڕێوە)).

ئـەو کاتەی سوهەیلی کوڕی عەمر لەگەڵ پێغەمبەرﷺ خەریکی ڕێکەوتن بوون لەسـەر پەیمانـنامەی (حدیبـیە)، لەکاتی نووسینی و پێش مۆرکردنی، (ابوجندل)ی کـوڕی (سـهیل) بـە کۆتکـراوی لـە دەسـت کافـرەکان ڕای‌کـردبوو و هات بۆ لای پێغەمـبەر.. (سـهیل) کـە کوڕەکـەی خۆی بینی، گرتی و گوتی: محمد! مەسەلەکە لەنـێوان مـن تـۆ بـڕاوەتەوە.. (محمـد) فـەرمووی: ڕاستەکەی.. (ابوجندل) گوتی: مسـوڵمانینە، ئایـا دەمگەڕێنـنەوە بـۆ لای هاوەڵ پەیداکەران تا لەسەر ئایینەکەم سزام بـدەن؟! ئەمـە هیچ دادی نەدا، پێغەمبەرﷺ بەپێی ئەو مەرجانەی لەسەری ڕێکەوت گەڕاندیەوە، ئەگەرچی هێشتا مۆری نەکردبوو.

(ئەبوعوبـەیدە) لـە سـەردەمی خەلـیفایەتی عومـەردا سـەرکردەی سوپا بوو، نامەیـەکی بـۆ عومـەر نووسـی، کـە بەندەیەك دڵنیایی داوەتە خەڵکی شارێك لە

عــێراق، پرســیاری رای ئــەوی کرد. عومەر بۆی نووسی: خوای گەورە بە وەفایی بە گــەورە دانــاوە، وەفــادار نابن تا پەیمانەکان نەبەنە سەر، جا بەوەفابن بۆیان و لێیان گەڕێن.

حــەز دەکــەم کەمــێك لــەلای ئەم رووداوە بوەستم، تا دوو دیاردەی پایەدار روون بکەمەوە:

یەکــەم: دانــنان و پشــت ڕاســتکردنی عومــەر بــە پەیمانــێك، لــە بەندەیــەکی مســولّمانەوە دەرچــووە و، فــەرماندان بە سەرکردەکەی، کە جێبەجێی بکات، ئەوە لەلایەکەوە یەکسانیی ڕەها لەناو مسولّمانان بەدی دێنێت و، ڕێزی پێویست لە تاك دەگرێــت، جــا ئــەو تاکــە هــەر پایەیــەکی هەبێت، ڕێزنان لە قسە و پەیمانەکەی بە جۆرێــك لەســەر هەموو مسولّمانان پێویست بێت، وەك بەڕاست دانانی فەرموودەی پێغەمــبەرﷺ: ((الْمُسْلِمُونَ تَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ..: مسولّمانان خوێنــیان هاوتایــە، پــەیمانی نزمترینــیان لەســەر هەمویان دەکەوێت..))[1]، ئەمە لەلایەکــەوە، پەروەردەکــردنی پــیاوانە بــە بەدەرخســتنی بەرپرسیارێتی مەزن، کە لەســەر هــەموو تاکــێکە، وتــەی ئــەو، وتــەی هەموو ئوممەتی ئیسلامە، بەو پێیە پێویســتە خــۆی لە دەربڕینی بەدووربگرێت و وردبین بێت لە پەیماندانەکەی، چونکە هەموو ئوممەتی ئیسلامی پێوە پەیوەست دەبێت و، لەسەری لێیان دەپرسرێتەوە.

بــەڵام دیاردەی دووەم ئەوەیە کە عومەر دەڵێت: ((وەفادار نابن هەتا پەیمانەکان نەبەنــە ســەر))، لەگــەڵ ئــەو مانا جوانەی تیایدایە، کە بیرۆکە و سروشتی ئیسلام وێــنا دەکــات.. کــە وشــە بوونــی نــیە، تەنها بە بەدیهێنانی ماناکەی لە جیهانی واقــیعدا نەبێــت، تــەنها بــە هاوشێوەیی نێوان گۆتەی گوتراو و رەفتاری بەرهەست نەبێــت.. ئیسلامیش لە هەموو مەبدەئە بەرزەکانی ئاوا بووە، ئەوە تەنها نمونەیەك نــەبوو بــۆ پــەند و ئامۆژگــاری وەرگــرتن، تــەنها وشــەی رەونەقدار نەبوو، بەڵکو سیســتەمێك بــوو بۆ جێبەجێکردن، دەستورێك بوو بۆ ئەرکبار کردن، واقیعێك بوو لە واقیعەکانی زەوی، ئەگەریش ئەوانە نمونەی بەرز بوون لە نیگای ئاسمان.

---

[1] البخاري

پاشــان ئیســلام لەسەر ڕێگە بەرزەکەی بە هاوشان لەگەڵ شەرەف و کەرامەت و ڕەوشــت دا ڕێ دەکــات، غــەدر حــەڵاڵ ناکــات هەتا لەو کاتەشدا، کە لە ناپاکیی خەڵکیدیکــە دەترسێت.. ناچارە لە دوژمنایەتیدا بەسەریاندا زاڵ بێت و بە ئاشکرا لەگەڵــیان بجەنگێت، بەڕۆژی ڕووناك پەیمانەکەیان بەڕودا بداتەوە. لەناکاو و بەغەدر بەســەریاندا نــادات لەکاتێکدا ئەوان لێی دڵنیان: ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَــيْهِمْ عَلَــى سَــوَاءٍ إِنَّ اللَّــهَ لاَ يُحِبُّ الْخَائِنِينَ: گەر هەستت کرد کۆمەڵێ لەو سوێندخۆرانە ناپــاك دەرچــوون، تــۆش وەك ئەوان سوێندیان بەسەردا بدەوە، خودا ناپاکانی خۆش ناوێت.﴾الأنفال/٥٨.

لەوانەیــە هــەندێك کــەس لــەکاتی بیســتنی فەرمودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ: ((الحـرب خدعــة: جەنگ فرت و فێڵە))[1] گومانێکیان لا دروست بێت، بەڵام ئەمە جێی گومان نیە، چونکە فرت و فێڵ لە جەنگدا ڕەوایە، ئەوە جەنگە نەك ئاشتی، کاتــێك جــەنگ ڕادەگەیەنرێت، بوار بواری پلانی جەنگیی دەبێت، دوژمن دەزانێ و ئاگاداریی خۆی دەکات و کاروباری ڕێك دەخات.. ئا لەو کاتەدا فرت و فێڵ دەبێتە زیرەکــیی جــەنگ و زۆرزانــیی ســەربازی لــە گۆڕەپــانی جەنگدا، نەك لە گۆڕەپانی ئاشتیدا.

پێغەمــبەر ﷺ ئەگــەر مەبەســتی هێرشی شوێنێکی بوایە، وای دەردەخست کە نــیازی شــوێنێکی دیکــەی هەیــە، تــا بەرامــبەرەکەی دەســخەڕۆ بکات، ئەوانەی دژایــەتی ڕاشــکاویان ڕاگــەیاندوە، نەك بۆ ئەوەی لە ناکاو بداتە سەر ئەوانەدا، کە پەیمانیان پێدراوە و دڵنیان و بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن لێیان بدات.

بــەم شــێوەیە ئیسلامی بەهێز، هەڵوێستێکی بەرێزانەی توند وەردەگرێت. غەدر نــیە و لاوازی نــیە، نــە زۆر لێکردن و نە مل پێکەچ کردن.. بەڵکو ئەوە عیززەتی بەهــێزەکانە و، بەرێــزیی ڕێــزدارەکانە و، بەڵێــنی وەفادارەکانــە.. بەم شێوەیە ئەو دیاردەیە دەرکەدەوێت لە دڵنیاکردنەوەی هاوبەشپەرستی دالدەدراو، چونکە ئەو لەو کاتــەدا هــیچ هــێزێکی نــیە تــا ئــازار بدات، مافی خۆشیەتی، کە ئازار نەدرێت،

---

[1] اخرجە ابوداود

چونکە ئیسلام مەبەستی لەناچوونی دژەکانی نیە، بەڵکو مەبەستی ڕێنوێینی کردنیانە بۆ ڕێگای ڕاست، هەروا ئازاریان نادات لە کاتێکدا ئەوان لەماوەی گوێڕاگرتن و ڕونکردنەوەدان:

﴿وَإِنْ أَحَـدٌ مِـنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ: هەرکاتێ یەکێك لە بتپەرستان خۆی خستە بەر داڵدەی تۆوە، پەنای بدە؛ با فەرمایشتی خودا ببیستێ، ئەوساکە بینێرە شوێنێ کە نەترسێ.﴾التوبة/٦.

کەواتە ئەمە تەنها پەنادان نیە، بەڵکو پاراستنیشە هەتا بەدڵنیایی دەگاتە شوێنی خۆی.

ئەمەش ئاسۆیەکی بەرزی دیکەیە، کە تەنها ئیسلام دەیگاتێ.

هەروا لە یاسای نێودەوڵەتی ئیسلامیدایە، کە نێردراو و ناوبژیوانان دڵنیا دەکرێن و پارێزگاریی تایبەتیان لێ دەکرێت، لەهیچ بارودۆخێکدا ئازاریان پێ ناگەیەنرێت.

(ابـن نواجه) و (ابن أُثـال) وەك دوو نێردراوی (مُسَيلَمَة) هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش پێیانی فەرموو: ((ئایا شایەتی دەدەن من پێغەمبەری خوام؟ گوتیان: شایەتی دەدەین (مسیلمە) پێغەمبەری خوایە! جا پێغەمبەر فەرمووی: ((لَوْ كُنْتُ قَاتِلًا رَسُولًا لَضَرَبْتُ أَعْنَاقَكُمَا: بڕوام هێنا بە خوا و پێغەمبەرەکەی! ئەگەر نێردراوم بکوشتبا، ئێوەم دەکوشت)).

بەڵام ئەگەر لەجەنگدا بێت، کەواتە ئەوە جەنگی ڕزگارکردنی مرۆڤایەتیە، جەنگە دژی کۆیلایەتی مرۆڤ بۆ مرۆڤ، جەنگە لەسەر زیادەڕۆیی و ستەم و دەستدرێژی، جەنگە لەسەر بیروباوەڕی پڕوپوچ و خەیاڵی و ئەفسانەکان.. جەنگی ڕزگارکردنە بە هەموو ماناکانی و لە هەموو گۆڕەپانەکانی.. جەنگێکی بێگەردە لە ئارەزوو و پاڵنەرە ئابوری و دەمارگیری و چینایەتییەکان.. جەنگێکە، بەشداریکردن تیایدا، ڕێزداریە بۆ مرۆڤایەتی، چونکە بڕیاردانی سیفەتی مرۆڤایەتی و مافەکانی مرۆڤایەتی و ڕێبیرەکانی مرۆڤایەتیە.

ئەمــە ئــەو جەنگــە نــیە، کــە سەرمایەدارە تاوانبارەکان بەڕێوەی دەبەن، تا لە پشــت پیشەســازیە دۆزەخیــیەکانەوە قازانج بدەن، ئەو جەنگەی گیان و جەستەکان بەزایــە دەدات، شارســتانیەتەکان قوت دەدات، دەرون و ڕەوشت تێك دەشکێنێت.. یــان ئــەو جەنگــەی کۆمپانــیا قۆرخکارەکــان بــەڕێوەی دەبــەن بــۆ پاراســتنی بەرژەوەندییەکانــیان لــە وڵاتە داگیرکراوەکان و، بەکارهێنانی کەلوپەلی خاوەکانیان لــە هــێزە سروشــتییەکان و هــێزە مرۆییەکان و، کردنەوەی دەرگای بازاڕەکانیان بۆ بەرهــەم و دروستکراوی کۆمپانیاکانیان.. یان ئەو جەنگەی ئەو دەزگایانە بەڕێوەی دەبــەن، کــە پــارە بــە ســو(ربــا) بــە قــەرز دەدەن، تا قازانجی بێشومار بکەن و، دەستکەوتی حەرام دابین بکەن و، هەلەکان بقۆزنەوە و، لە ئاوی لێڵدا ڕاوبکەن.

ئەمە جەنگێك نیە بە مەبەستی دروست کردنی شورەی پۆڵایین بە دەور گەلاندا، بــەبێ زانین و زانیاری و شارستانیەت، تا رۆڵەکانی وڵاتە داگیرکراوەکان بە کوێری و کــەڕی و لاڵی بمێننەوە، وەکو ئاژەڵ بەزەلیلی و نەفامی و ملکەچی بەرەو سەربڕین ببرێن.

ئەمــە ئــەو جەنگــە نــیە، کــە شارســتانیەتی رۆژئــاوایی پــیس و چــەپەڵ دژی مــرۆڤایەتی بــەڕێوەی دەبــات، بــۆ دەســتکەوتنی قازانجی ماددی و بەکۆیلەکردنی ڕەگەزایــەتی و، دەمــارگیری ئایــنی. وەك ئــەو جەنگانــەی جــیهانی رۆژئاوایی لە هەموو مێژووە پیس و درێژەکەی بەخۆیەوە دیوە.

بــەڵکو ئەمــە جەنگــێکە خــەڵك لــە بەندایــەتی بــەندەکان دەردەهێنێ و بەرەو بەندایــەتی خــوای تاقانــەی دەبــات.. ئــەو جەنگەی کە لەگەڵ خۆیاندا یەکسانی و دادوەری و ڕێــزی بۆ هەموو بونەوەرێکی مرۆیی سەر ڕووی ئەم زەمینە هەڵگرتووە و، لــە جــیهانی واقــیع و جــیهانی نمونەیــیدا بــەدیی دەهێنێــت، لــە دەستور و لە جێــبەجێکردن، بۆ ڕەش و سپی و، بۆ مسوڵمان و پەیماندار جێبەجێی دەکات.. بە یەك شێوە و بە یەك ئامراز و لە یەك ئاستدا، بۆ هەموان جێبەجێی دەکات.

ئیسلام سو(ربا) و قۆرخ کردن(احتكار)ی حەرام کردووە، قازانجی لەرادەبەدەری حــەرام کــردووە، بەکارهێــنانی خــراپەکارانەی حــەرام کــردووە، بەم شێوەیە، هۆیە

سەرەتاییەکانی جەنگی داگیرکاری ماددی لە کاردەخات، هەر لەناو بێشەڵان دەیکوژێت پێش ئەوەی نەوە بخاتەوە.

ئیسلام هەموو دەرگاکانی جەنگ دادەخات، بێجگە لە یەك دەرگا نەبێت، دەرگای جیهاد لە پێناوی خوا، تا وتەی خوا لە هەموو شتێ بەرزتر بێت، تا خەڵك هەمووی لەبەردەم خوای گەورە یەکسان بن.

ئەگەر جەنگ تەنها لەو رووەوە بێت، کەواتە جەنگێکی مرۆڤایەتیانەیە و مەبەستی بەڵا بەسەر هێنان و کوشتن و وێرانکردنی تێدا نیە؛ رێگانادات دەست لە بێتاوانان و بێدەسەڵاتان بدرێت، رێگا نادات لە ئامانجە یەکەمینەکەی تێپەڕێت لە لابردنی هێزەکانی خراپەکاری و ستەم، یان مل پێکەچ کردنی، تا مرۆڤایەتی لە خراپەکاریەکانی دڵنیا بێت، هیچ نیازێکی لەناوبردن و تۆڵەسەندنەوە و زەلیل کردنی تێدا نیە.

رەباحی کوڕی رەبیعە دەگێڕێتەوە، کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە یەکێك لە غەزایەکاندا دەرچوو، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەلای ئافرەتێکی کوژراودا تێپەڕین، پێغەمبەر لە دیاری راوەستا و فەرمووی: ((نەدەبوو ئەمە بکوژرێت!))، پاشان سەرنجی لە دەموچاوی هاوەڵانی دا و بە یەکێکیانی فەرموو: ((بگە خالیدی کوڕی وەلید، با هیچ نەوەیەك و بەکرێگیراوێك و ئافرەتێك نەکوژێت)).[1]

لەدوای رووبەڕووبوونەوەیەك، هەواڵ درا بە پێغەمبەر ﷺ کە چەند منداڵێك لەناو سوپاکەدا کوژراون، زۆر خەمبار بوو، هەندێك وتیان: بۆ خەم دەخۆی؟ ئەوانە منداڵی هاوبەش پەیداکەرەکان بوون؟!.. توڕە بوو، شتێکی ئاوای فەرموو: ئەوانە لەئێوە باشترن، ئەوان لەسەر فیترەتن، ئەی ئێوە منداڵی هاوبەش پەیداکەرەکان نین؟! نەکەن منداڵ بکوژن، نەکەن منداڵ بکوژن!!

---

[1] روى ابن عمر رضي الله عنهما وأخرجه الستة الا النسائي قال: ((وُجِدَتْ امْرَأَةٌ مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ -وروى البريدة- وَالصِّبْيَانِ)). قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَمَّرَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ أَوْ سَرِيَّةٍ أَوْصَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ وَبِمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا، ثُمَّ قَالَ: اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، اغْزُوا وَلَا تَغْدِرُوا وَلَا تُمَثِّلُوا وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا))أخرجه مسلم وابوداود والترمذي.

(مـالك) لـە (ابوبکـری صـدیق)ﷺ دەگێڕێـتەوە، کـە گوتویەتی: ((کەسانێك دەبیـنن وا هەڵدەبەسـتێت کە بۆ خوا خۆیان بەند کردووە! بۆ خوایان لێیان گەڕێن، ئافرەت و منداڵ و پیری پەککەوتە مەکوژن.))

لـە ئامۆژگارییەکـیش بـۆ سـەربازەکانی گوتـی: ((دار مەبـڕن، ئاوەدانی وێران مەکەن)).

زەیـدی کـوڕی وەهـەب دەڵێـت: نامـەی عومـەرمان بۆ هات تیایدا نوسرابوو: ((زیـادەڕۆیی مەکـەن، دەستدرێژی مەکەن، منداڵ مەکوژن، بەرامبەر بە جوتیاران لەخوا بترسن)).

لـە ئامۆژگاریـیەکانی: ((پـیر و ئافـرەت و منداڵ مەکوژن، لەکاتی پێکدادان و بەسەرداداندا خۆتان لە کوشتنی ئەوانە بپارێزن)).

ئـەو رێنمایـیانە تـیۆرێك نـەبوون لـە واقـیعدا بتاوێـنەوە و ون بـبن.. بـەڵکو رەفـتارێکی کـرداری بـوو لـە جەنگـە ئیسـلامییە کـۆن و تازەکـاندا، کـەس لێی لانـەداوە، مەگـەر بەدەگمـەن نەبێـت، دەگمەنـیش پـێوانەی لەسـەر ناکرێت، ئەو بـنەمایە پوچـەڵ ناکاتـەوە، کـە ئیسـلام کردویەتیە ئامانجی و، لە واقیعدا وەدیی هێناوە.

ئەگـەر ئـێمە لەم لوتکە بەرزەی ئیسلام لە ئاشتی و جەنگدا لەسەری وەستاوە، سـەرنج لـەو زەلکـاوە بۆگەنـە بدەیـن، کـە شارسـتانیەتی رۆژئاوا لە ئاشتی و لە جـەنگدا تـێی کـەوتوون، دەزانـین دووری نـێوان سیسـتەمێك، کە خودا بۆ مرۆڤی دابەزاندبێـت و، سیسـتەمێك خـەڵك بۆ خەڵکی دابنێت چەندە، هەست دەکەین کە ئـەو ڕۆژەی مـرۆڤایەتی پشـتی لـە سیسـتەمی خـوا کـرد، چەندی زیان لێکەوت. لەکاتـێکدا کە پێی لە لەخۆبایی بوون و خۆبەزانا دانانی پێکەنیناوی هەڵدەکەوێت، دەیەوێـت بڵێـت: ئـەو شـتێکی بۆ خۆی دەوێت لەوە چاکتر، کە خوا دەیەوێت، ئەو خاوەنی شتێکی چاکترە لەوەی خوا پێی داوە!

ئەم مرۆڤایەتیە هەر بە رێگایەکی پڕ لە هەوراز و نشێویدا دەڕوات؛ دەم دەنێتە نـاو هـەموو زەلکاوێکی بۆگەنی دەستکردی شارستانیەتی کافر و لوتبەرز و گومڕا

لـەخوا.. هـەتا ئـەو کاتەی ئیسلام جڵەو دەگرێتە دەست، جا مرۆڤایەتی سەرسام، بەرەو ئەنجامی دادگەریی و سیستەم و ئاشتی دەبات.

## ئەی ئێستا؟

ئێستاش.. دوای خستنەرووی بیرۆکەی ئاشتی لە ئیسلام و، تێگەیشتن لە بیرۆکە گشتییەکەی ئیسلام بۆ ژیان.. ئێستاش دوای زانینی مەبەستی تەواوی وشەی ئاشتی لە ئیسلامدا، ئەو مەبەستەی کە چەسپاندنی ئاشتی لە زەویش لەخۆ دەگرێت، ئاشتییەك لەسەر بنەماکانی دادگەریی ڕەها و، خێر و بێری گشتی و، وەدیهێنەری وتەی خوا دامەزرابێت.. ئەگەر نا جیهاد بەردەوامە بۆ وەدیهێنانی ئەو وتەیە، تێکۆشان بۆ لابردنی سنوربەزاندن و دوژمنایەتی بەردەوامە، ململانێ لەگەڵ خراپەکاری و شەڕ و لەسنور دەرچوون بەردەوامە.

ئایا ئێستا ڕێگای ئێمەی ئوممەی ئیسلامی کامەیە؟ هەڵوێستی ئێمە لەو ململانێ جیهانییەی لە دەورمان ڕوودەدات چییە؟ ئەرکی ئێمە بەرامبەر بە ژیان، بە مرۆڤایەتی، بەرامبەر بەخۆمان چیە؟

لە سەرەتای ئەم کتێبەدا وتم: بیروباوەڕە ئیسلامییەکەمان دەتوانێ بە چارەسەری کرداری فریامان کەوێت، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گیروگرفتە ناوخۆیی و دەرەکیەکانمان، لەم خستنەڕووەدا دەرکەوت، کە ئەم بیروباوەڕە، گیروگرفتە ناوخۆیی و گیروگرفتە دەرەکیەکان لێك جودا ناکاتەوە، بەڵکو لە ژیانی مرۆڤایەتیدا پێکەوەیان گرێ دەدات، لە هۆکارەکانی چارەسەردا پێکەوەیان دەبەستێت.

لەنێوان ئاشتی جیهانی لە سنورە نێودەوڵەتیەکەی و، ژیانی تاك لە ویژدان و ژیانی لەناو خێزان و ژیانی لەناو کۆمەڵدا، پەیوەستییەکی زۆرمان بینی.. لەنێوان ئەو شتانەی کێشە و دوبەرەکی لەبواری نێودەوڵەتی دەوروژێنێت و، زۆر لە هەست و سیستەم و کاروبارە ئابورییەکانی کۆمەڵدا، پەیوەستییەکی زۆرمان بینی.

ئەی ئێستا ڕێگاکەمان کامەیە؟ چۆن بە بیروباوەڕە ئیسلامییەکەمانەوە، ڕووبەڕووی مەسەلەی ئاشتی جیهانی ببینەوە؟ چۆن لەبواری نێودەوڵەتیدا بەپێی ئەم بیروباوەڕە ڕەفتار بکەین؟

پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، حەزدەکەم لە چوارچێوەی ئەو قەوارانەی ئەمڕۆ لە بواری نێودەوڵەتیدا ململانێیانە، ڕوبەڕووی واقیعی کرداری ببینەوە.. حەزدەکەم ئەو بنەمایانە بخەینە ڕوو، کە ئەو ململانێیانەی لەسەر بنیات نراوە، لەگەڵ ئەو هۆکارانەی هەڵی دەنێت و کاری تێدەکا.

جا لەژێر تیشکی ئەم ڕوبەڕوبوونەوەیەدا، دەکرێت بزانین ڕای ئیسلام لەو بنەمایانە و لەو پاڵنەرانە چییە؛ هەروا بزانین چ هەڵوێستێك وەربگرین و، دەرك بەوە بکەین، کە ئەو هەڵوێستەی بیروباوەڕەکەمان دەیخوازێت هەمان ئەو هەڵوێستەیە، کە بەرژەوەندیەکانمان بەدی دێنێت؟ یان تێکگیربونێك هەیە لەنێوان ئەرکمان بەرامبەر بیروباوەڕەکەمان و، ئەرکمان بەرامبەر بەرژەوەندیەکانمان، ئەمە و ئەگەر ئەو جۆرە تێکگیرانە هەبێت!

جا ئەگەر ڕون بۆوە، کە ئەو چارەسەرانەی بیروباوەڕە ئیسلامییەکەمان دەیخوازێت هەمان ئەو چارەسەرانەیە، کە بەرژەوەندییەکانمان دەیخوازێت، بەڵکو هەمان ئەو چارەسەرانەیە، کە بەرژەوەندی باڵای مرۆڤایەتی و چاکەی هەموو مرۆڤایەتی دەیخوازێت.. کەواتە ئێمە لەسەر ڕێگای ڕوناکی دەڕۆین و، بەهێز و بەئاسودەیی ڕێدەکەین.

لەم حاڵەتەدا هاواری لابردنی بیروباوەڕی ئیسلامی لەسەر ڕێڕەوی ژیانی سیاسی، یان کۆمەڵایەتیمان قسەی زیادە و هیچ بەڵگەیەکی نیە و، هەڵەوەڕ و چەنەبازییەکە، شایانی ڕێز نیە.

با بەناوی خوا ئەو واقیعە مرۆڤایەتییە بخەینە ڕوو، کە ڕوبەڕووی دەبینەوە، تا بزانین ڕای بەرژەوەندی مرۆڤایەتی و بەرژەوەندی نەتەوەیی و، ڕای ئیسلام چۆنە.

## لەسەر ڕۆخی تیاچوون

زەنگی جەنگ لێدەدا. ئا ئەوەتا لە گوێچکەی مرۆڤایەتی بەدبەخت و ڕەنجەڕۆ دەدات. پێشتر ئەمەم لە ئەمریکا بیست، هەتا پێش ڕوودانی جەنگی کۆریا،[1] هەموو ئەوانەی لەم ساڵانەی دواییدا لە ئەمریکا ژیاون بە ڕوونی هەست بەوە دەکەن، کە ئەمریکا جەنگ دەکات. هەموو شتەکان ئەم ڕاستییە دەردەبڕن، یان ئەو مانایە دەدەن؛ ئامادە و کۆکردنەوەی گشتیی هەموو هێزەکانی گەل و داهاتەکانی، ئەوەی ئەم ئامادەباشییە دادەپۆشێت، تەنها پەردەیەکی تەنکی دبلۆماسیەتە، لەوانەیە لە دەرەوەی ئەمریکا ڕاستیەکان بشارێتەوە، بەڵام لەناوەوە ڕاستییەکان زۆر لەوە دیارترن، کە ئەو پەردەیە دایپۆشێت.

هەرکەسێك چاودێری ڕۆژنامەگەریی ئەمریکی و دەزگاکانی دیکەی پڕوپاگەندەی ئێزگە و سینەماکان بکات، هەتا لەناو زانکۆ و پەیمانگاکانیش، بەڕوونی هەست دەکات، کە ئەم گەلە خۆی بۆ جەنگ -جەنگێکی نزیك- ئامادە دەکات، ڕای گشتی بەشێوەیەکی چەسپاو و تەواو و گشتگیر ئامادە دەکات، ئەم هەموو کۆشش کردنە، ئەگەر گەمژەییەکی بێگومان نەبێت، ئەوا جەنگێکی بێگومانە و، لەم نزیکانە ڕوودەدات!.

ئەمریکا دەیەوێت بجەنگێت، ئەگەر ئەوروپا بەگوێی بکردایە هەتا ڕووداوی کۆریا، ئارامی لەسەر جەنگ نەدەگرت؛ دەیویست هەر لەکاتی قەیرانی بەرلینی بەناوبانگەوە جەنگەکە تەواوبوایە؛[2] بەڵام ئەوروپای تێکشکاو لەوە دەستەوسان تر بوو، کە ویستە ئەمریکییەکە جێبەجێ بکات، هێشتا برینەکانی دەلێستەوە و کارەساتەکانی چارەسەر دەکرد، سەرەڕای ئەوەی شیوعیەکان هێزێکی داکراو

---

[1] لەکاتی گەشتەکەی لەگەڵ نێردەیەکی بەسەرکردنەوە لەساڵی ١٩٤٨، ئەوەبوو لەبارەی ئەو گەشتەوە کتێبە ونبوەکەی (امریکا التي رایت)ی دانا، کە هەندێك لە بەشەکانی لە کتێبی (امریکا من الداخل)ی د.صلاح الخالدي بڵاوکرایەوە. (محمد الحسناوي)

[2] ئەوکاتە زۆر سوور بوو لەسەر جەنگی هیندیی چینی و، هانی فەرەنسای دەدا بۆ بەردەوام بوون لێی و، بە هەڵگری فرۆکەکان بەشداری دەکرد و، هۆشیاری دەدا بە بەشداربوونی هێزەکانی ئەمریکا، ئەگەر فەرەنسا سەلامەتی پێش نەخستبا!

هـەڵگیراویان هەبوو، بۆ کاتێکی چاوەڕوان کراو خۆی ئامادە دەکرد؛ هەڵخەڵەتاندن بـە دۆلار لە ئەوروپا هەموو شتێکی پێدەکرا، تەنها ئەوە نەبێت کە بەرەو جەنگی جیهانیی سێیەم هەڵی بنێت.. تەنها لەبەر ئەمە ئەمریکا ئارامی گرت.

سـەرمایەی ئەمـریکی پێویسـتییەکی زۆریان بە جەنگێکی نوێ هەیە، ئەمەیە مەسـەلەکە، ئـەو سـەرکەوتنە زانسـتییانەی لـە جـەنگی ڕابـردوودا هەنگاوەکانی خـێراکرد و، ئەو سەرکەوتنە بازرگانییەی پیشەسازی بەدەستی هێنا لە دابینکردنی داهاتـەکان لـە ڕۆژانـی ئـەو جەنگـەدا، هـەلی تـازەی بـۆ پیشەسـازی ئەمریکی ڕەخساند، تا بەرهەمیان چەند قات بکەن، ئەمە لەکاتێکدا کە مەسەلەی فرۆشتنن سەخت بوو.

لەگـەڵ ئـەوەی بازاڕەکـان لـەدوای جەنگ خاڵی بوون، پێویستییەکی زۆریان بە بەرهـەمی مـەدەنی هەبوو، خاڵیبوو لە کێبڕکێی ئەوروپی، لەگەڵ ئەوەشدا توانای کـڕین لاواز بـوو، بـە تایـبەت لـە ئـەوروپای تێکشکاو. ئەمەش بە پێوانە لەگەڵ بەرهـەمی ئەمـریکی سسـتی بازاڕ دەگەیەنێت، بێبازاڕیش زیانێکی بێگومانە بۆ سەرمایە ئەمریکییەکان.

ئا لێرەوە پڕۆژەی (مارشاڵ) پەیدابوو، ئەم پڕۆژەیە سێ ئامانجی سەرەکی هەبوو:

مەبەستی یەکەم: سەرفکردنی بەرهەمە ئەمریکییە زیادەکەیە، بەبێ ئەوەی ئەو دەوڵەتانـەی سـودی لێدەبینن بەهاکەی بەدۆلاری ئەمریکی یەك جێ(نقد)ی بدەن، حکومـەتی ئەمـریکی مـتمانەی دارایـی(اعـتماد)ی بـۆ دەوڵەتـە ئەوروپییـەکان دەکردەوە، تا ئەو دەوڵەتانە زۆرتر لە کڕینی بەرهەمی ئەمریکی خەرج بکەن.

لەڕاسـتیدا سـەرمایەی ئەمریکیی بەرگەی باجی بەرزیان دەگرت، تا حکومەت بتوانێـت پـڕۆژەی (مارشـاڵ) جێـبەجێ بکـات، بـەڵام لەگـەڵ ئـەو باجە بەرزانە، قازانجـێکی مسـۆگەریان لـە جێـبەجێکردنی ئـەو پڕۆژەیە بەدەست دەهێنا و، لەو زیانانە بەدوور دەبوون، کە لە بێبازاڕی پەیدا دەبوو.

مەبەسـتی دووەم: دوورکەوتـنەوە بـوو لـە حاڵـەتی بێکاری لەناو کرێکارەکانی ئەمـریکا، دوورکەوتنەوە بوو لەو هەژانە کۆمەڵایەتییەی لە بێکاری دەکەوێتەوە..

دوای وەستانی بەرهەمی جەنگی، کە ئەو کرێکارانەی لەخۆ دەگرت؛ ئەمەش وای پێویست کرد کە فرۆشتنی بەرهەمی مەدەنی دابین بکرێت، کە ڕێگا بە کارگەکان بدات، تا ئەوپەڕی توانا کار بکات، ئەوەبوو پرۆژەی مارشاڵ و ناردنی ئامێرەکان بۆ دەوڵەتە ئەوروپییەکان، هۆکارێك بوون بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە، کە ئەویش لەلای خۆیەوە جۆرە قازانجێکی بۆ سەرمایەی ئەمریکیی بەدەست دەهێنا.

مەبەستی سێیەم: ئاوەدانکردنەوەی ئەورووپا و، بەگەڕخستنەوەی ژیان تێیدا، بە تایبەتی ژیانی کارکردن، بۆ بەدیهێنانی چالاکی ئابووری جیهانی لەلایەکەوە و، ڕێگری لە شیوعیەت، لەناوەندی بێکارەکاندا لەلایەکی دیکەوە.. پرۆژەی مارشاڵ هاریکاری بەدیهێنانی ئەم مەبەستەی دەکرد.

ئا لێرەوە، (مارشاڵ)ی خاوەنی ئەم پرۆژەیە، لە تێڕوانینی ئەمریکییەکانەوە، یەکێکە لە پیاوە مێژوویییە ئەمریکیەکان.. هەروەك گۆڤاری (لۆك Look) بە یەکێك لەو بیست کەسەی ژماردووە، کە سەدەی بیستەمیان داڕشت، نەك تەنها لە ئەمریکا، بەڵکو لە هەر هەموو جیهان.

* * *

بەڵام پرۆژەی (مارشاڵ) نەدەکرا، تاهەتا بەردەوام بێت، سروشتی شتەکان وادەخوازێت لە سنورێکی دیاریکراو بوەستێت، لەلایەکەوە کاتێك بازاڕی ئەورووپی دەگاتە پلەی تێربوون، لەلایەکی دیکەوە کاتێك ئامێری بەرهەمهێنانی ئەروپی دەگاتە پلەی بەرهەمی تەواومەند.

ئەورووپا توانای تەواوی بەرهەمهێنانی خۆی بەدەست هێنایەوە، یان نزیك بوو بەدەستی بێنێتەوە، گەڕایەوە ئەو ئاستەی، کە تیایدا بەرهەم بنێرێتە دەرەوە، نەك هەر بەرکاربەر(مستهلك) بێت، وای لیٚهات کێبڕکێ لەگەڵ بەرهەمی ئەمریکیدا بکات، نەك تەنها لە بازاڕە ئەورووپییەکان، بەڵکو لە بازاڕەکانی دیکەی جیهانیشدا.

ئا لەوکاتەدا بەریتانیا یارییە زۆرزانانەکەی کرد و تیایدا ساویلکەیی عەقڵیەتی ئەمریکی و کەمزانییە نێودەوڵەتیەکەی قۆستەوە، ئەو یارییەش بریتی بوو لە

دابەزاندنی بەهای جونەیهی ئیستەرلینی بەرامبەر بە بەهای دۆلار.. لێگەڕا ئەمریکا پێشی بکەوێت بۆ بەدیهێنانی بەهای ڕاستەقینەی دۆلار لە بازاڕەکاندا، نەك بەها ڕەسمییەکەی؛ خۆی وا دەرخست، کە لێی تۆقیوە و داوای بەزەیی دەکات، کەچی نیازەکەی دیکەی لە هاوپەیمانەکەی شاردەوە! ئەو نیازەی ئەمریکا لێی بێئاگا بوو تا لەم دواییانە بۆی ڕوون بووەوە!

ئەوەبو لە ئەنجامدا بازاڕەکان بەڕووی کەلوپەلی ئەمریکیدا داخرا، کە نرخەکەی بە پێوانە لەگەڵ دراوی ئەو ناوچەیەی ئیستەرلینی بەکاردەهێنن، بەرز بو.. ئەو بازاڕانە کەلوپەلی ئینگلیزییان هێشتەوە، کە دابەزینی بەهای ئیستەرلینی لە ناوچەی ئیستەرلینیدا هیچ کاری لە نرخەکەی نەکرد. بەڵام لە بازاڕەکانی دیکەدا زۆر لە هاوشێوە ئەمریکییەکەی هەرزانتر بوو!

ئەوکاتەی ئەمریکا لەو فێڵە بە ئاگا هاتەوە، دەستی کرد بە وەڵامدانەوەی لەڕێگای کێشانەوەی کەسەرەی خاو لە بازاڕەکانی جیهان، لەمەشدا پشتی بە توانای بێشوماری لە کڕین و، هێزی دراوەکەی لە بازاڕە جیهانیەکان بەست، ئەمەش تا نرخی کەرەسەی خاو لە بازاڕەکاندا لەڕووی پیشەسازی بەریتانی بەرز بکاتەوە، وای لێ بکات توانای پێشبڕکێی کەم بکاتەوە، لەبەر ئەوەی بەرزبوونەوەی نرخی کەرەسەی خاو، پیشەسازی ئینگلیزی ناچار دەکات نرخەکان بەرزبکاتەوە، بەمەش هاوسەنگییەك لەنێوان نرخە ئەمریکی و نرخە ئینگلیزییەکاندا دروست دەبێت.

بۆ نمونە نرخی کەرەسەی خاوی خوری بۆ ٥٠٠٪ بەرز بوویەوە، لەبەر ئەوەی خوری پیشەسازیی سەرەکی ئینگلیزی بوو، هەروا نرخی زۆربەی ئەو کەرەسەخاوانە بەرز بووەوە، کە پیشەسازی بەریتانی لەسەری ڕاوەستاوە، بە کاریگەریی ئەو نەخشە ئەمریکییە، کە وەك وەڵامدانەوەیەکی فێڵێکی ئینگلیزی هات، هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ ئەو شەپۆلە گرانیەی لەم دواییانەدا جیهانی گرتەوە، سەرەڕای ئەو هۆیە سروشتیانەی، کە لە ئەنجامی خۆئامادەکردن بۆ جەنگی جیهانی هاتە کایەوە!

بـەڵام ئـەم ڕەفـتارە ئەمریکـیە لـە ڕەفـتارێکی کـاتی زیاتـر نـەبوو، لـە ڕوبەڕووبوونـەوەی هێرشـێکی دیاریکـراودا، بـەڵام باری گشتیی بازاڕەکان لە رووی پێشـوازیکردنی بەرهـەمی ئەمـریکی کاریگەریـیەکی ئـەوتۆی نـەبوو. ئەمـەش هاوکـاتی ئـەو شـۆك(صـدمة)ە تـەواوە بـوو، کاتـێك شیوعیەت بەشێکی گرنگی بازاڕەکـانی جـیهانی ڕامـاڵی، کـە ئـەویش چین بوو، ئەو وڵاتەی پێنجسەد ملیۆن دانیشـتوانی هـەبوو، کـە دەکاتـە نزیکەی چواریەکی دانیشتوانی زەوی. لەراستیدا چـین بـازاڕێکی سـەرەکی ئەمریکا نەبوو، بەڵام دوای شکستی ژاپۆن، وا دەخوازرا ببێـتە بـازاڕێکی سـەرەکیی ئەمـریکا. جا کاتێك شیوعیەت راماڵی، ئەو دەرووە داخـرا، سـەرمایەی ئەمـریکی هەسـتی بـە هەناسـەبڕیەکی کـەم کـرد، هـەروەك فەرمانگـە کۆمەڵایەتیـیەکان هەسـتیان بـە ترسناکیی بڵاوبوونەوەی بێکاری کرد. پـێش جـەنگی کۆریـا، بـێکاری گەیشـتە نـزیکەی پێـنج ملـیۆن کـەس (دوای دەستپێکردنی جەنگەکە دابەزی بۆ سێ ملیۆن کەس).

لـێرەوە ئەمـریکا ناچـاربوو کـە بجەنگێـت، ئەگـەر جەنگی کۆریا نزیکەی دوو ملـیۆن بـێکاری ڕاکێشـا، ئـەوا بەتەنها چارەسەری هەڵوێستەکە ناکات، پێویستە جەنگـێکی تـێکڕایی ڕووبـدات تـا لەلایەکـەوە هـەموو بـێکارەکان ڕابکێشـێت، لەلایـەکی دیکـەوە قازانجـێکی تەواو بۆ سەرمایەکانی دابین بکات! بۆیە جەنگ بە پـێوەر لەگـەڵ ئەمریکای ئەمڕۆدا[1] زەرورەتێکی ژیانی نەتەوەییە، ئەمە سەرەڕای ویسـتی بەهـێزی بـۆ وەسـتاندنی شەپۆلی شیوعیەتی جیهانی، ئەو شەپۆڵەی هەر دەکشـێت، هـەر ڕۆژەی زەویـیەکی تـازە دادەپۆشـێت، هـەر ڕۆژەی بازاڕێکی نوێ دادەخات.

ئەگـەر ئـەوروپا لە وەڵامدانەوەی ئەمریکا سستی دەنوێنێت، ئەوا بەم سستییە تـەنها وادەی جـەنگی خوازراو دوادەخات، لەبەر ئەوەی لەم نزیکانە خۆی لەبەردەم هەمان ئەو پاڵنەرانە دەبینێتەوە، کە ئەمریکا بەرەو جەنگ هەڵ دەنێت.

[1] چاپی یەکەمی کتێبی (ئاشتی جیهانیی و ئیسلام) لە ساڵی ١٩٥١ بوو. (محمد الحسناوی)

ئـەو ڕۆژەی بەرهــەمی ســەرمایەی ئـەورووپی دەگاتــە ئەوپــەڕی، لــە بازاڕەکان ڕوبـەڕووی هــەمان هەڵوێسـت دەبێـتەوە.. هــەتا شـیوعیەت لــە کشاندا بێت-کە هــەردەبێ لــە کشـاندا بێت-، خراپیی باری کۆمەڵایەتیی زۆربەی وڵاتانی جیهان و جیاوازیــیە پشــت شـکێنەکانی نـێوان چینەکان، کـە سینگەکانی تەنگ کردبوو، هــاندەری ئــەم کشــانەن. ئــەو چاوبرســییەتیە گەمژەیــیانەیەی ســەرمایەدار و دەرەبەگــەکان خویــان پــێوەگرتوە، بــە تایبەتی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات، گەشە بە شـیوعیەت دەدەن.. هەتا شیوعیەت لە کشاندا بێت، هەر ڕۆژەی بازاڕێکی نوێ لە ڕووی بەرهەمی سەرمایەداریی ئەورووپا و ئەمریکا دادەخات.

ئـا لـێرەدا بەرژەوەندی سەرمایەدارەکان لێرە و لەوێ پێك دەگەن لە هەوڵدان بۆ ڕاگرتـنی ئـەو لێشـاوە و، گـێڕانەوەی بازاڕەکان بەزەبری چەك، یان بەلای کەمەوە لـەڕێگای بەکاربـردنی جـەنگی و بەرهــەم هێنانی چەك و تەقەمەنی و ئامێرەکانی مــەرگ و وێــرانکاری.. ئەوانــە کاری کارگەکان و، قازانجی سەرمایەکان و، مردنی ملیۆنەها کەس دابین دەکەن!

جـا هەڵوێستی ئێستای ئەورووپا و سستییەکەی لە وەڵامدانەوەی زەنگی جەنگ و، هەوڵــەکانی بـۆ هــێورکردنەوەی دەمــاری ئەمریکــیی هەڵچــوو، هەموو ئەمانە هۆکاری کاتیی ئاشتین، نەك دابینکاریــیەکی ڕاستەقینەی ئەم مرۆڤایەتیە بەدبەختە بێــت، کــە هەڵدەنرێــت بــەرەو قەســابخانەی بــەرژەوەندی و چاوچــنۆکیەکانی ســەرمایەداران، ئــەو مادددیــە هزریــیەی لــە پشــت ئــەم بــەرژەوەندی و چاوچـنۆکیانەوەیە، هـیچ بەهایەك بۆ هیچ هۆکارێکی ئەدەبی، یان ڕۆحی دانانێت، ســەرەڕای ئـەو هەموو ئاماژەیەی بە مەبدەئە ئەدەبییەکان و ئامانجە مرۆییەکان لە پڕوپاگەندەکانیاندا دەیکەن.

## لە دوڕیانی ڕێگادا

ئەمــڕۆ بلۆکــی شـیوعی لەلایــەك و، بلۆکــی ســەرمایەداری لەلایــەکی دیکــە وەســتاوە، هەریەکێکــیان هــەوڵ دەدات بەشەکەی دیکەی جیهان بەرەو خۆی کێش

بکـات، لـە قەسـابخانەدا داهاتی ئەو بەشە بەکاربێنێت و، هەموو داهاتە مرۆیی و ئابوری و جوگرافییەکانی بەکاربەرێت.

بـەڵام بلۆکـی سـەرمایەداری بـە پێشـەوایەتی ئەمـریکا چەندین شێواز بۆ ئەم مەبەسـتە بـەکار دەهێنێـت؛ یەکەمجار هۆکاری تۆقاندنی سەرمایەدارەکان لەگشت جـیهاندا و بـە تایـبەتی لـە جـیهانی عەرەبـیی دەرەبەگایـەتی، لەو شیوعیەتەی رۆژبـەرۆژ زیاتـر دەکشێت، بانگیان دەکات بۆ ئەو بەرژەوەندییە هاوبەشەی لەنێوان داگیرکـەر و سـەرمایەداریدا هەیـە، لەمەشـدا پـەنا دەباتـە بـەر هاوپەیمانیەتێکی سروشتی لە نێوان سەرمایەداری ناوخۆیی و سەرمایەداریی جیهانی.

دووەم جـار فشاری سیاسی و، ئابووری و هەندێك جار فشاری چەکداریش بەکار دەهێنێـت لـەو وڵاتانـەی ڕاسـتەوخۆ، یـان ناڕاسـتەوخۆ کەوتونەتـە ژێـر دەسـتی داگیرکەر، هەروەك لە کۆمەڵێك وڵاتە عەرەبییەکاندا ڕوودەدات.

سـێیەم جـار هەڵخەڵەتاندن بە دۆلار لەژێر زۆر ناونیشان بەکاردەهێنێت، لەوانە ئـەو ناونیشـانە تازەیـەی پـرۆژەی (مارشاڵ)ی لێ کەوتەوە، ناونیشانی (یارمەتییە ئابورییەکان) و ناونیشانی (خاڵی چوارەم) لە پرۆژەی (ترۆمان)دا[1]!

ئـەوەش بەگشـتی ڕوودەکاتـە چـینی دەسـەڵاتدار و چەوسـێنەر، زۆر پشـت بە جـەماوەر نابەسـتێت، لەبـەر ئـەوەی بەرژەوەندیـیەکانی ئەو چینانە بەسەرکەوتنی بلۆکـی سـەرمایەدارییەوە بەسـتراوە و، لـەم پێناوەدا کۆششێکی بێشومار دەدات، ئەگـەریش لـە هـەمان کـاتدا گـرنگی نەدات بە داواکارییە نەتەوەییەکانی گەلان، لەبەر ئەوەی باوەڕی زۆری بە چینە دەسەڵاتدار و چەوسێنەرەکان هەیە و، بێگومانە کـە ئـەو چـینانە لەپێـناوی داواکاریـیە نەتەوەیـیەکانی گـەلان، دوژمنایەتـیەکی ڕاستەقینەی داگیرکەر ناکەن.

---

[1] هـاری ترۆمان، دوای مردنی فرانکلین رۆزفلت، سەرۆکایەتی ئەمریکای گرتە دەست، ئەوەبوو فـەرمانی دا بـە لـێدانی قومـبەلەی ئـەوەوی لـە هیرۆشـیما و ناکـازاکی، هـەر ئـەو بـوو دەستپێشخەری کرد لە دانان بە قەوارەی زایۆنی. (محمد الحسناوي)

هەڵوێستەکەی هەروا دەمێنێتەوە، تا ئەو کاتەی ئەو گەلانە خۆیان کێشەی خۆیان دەگرنە دەست، دەیسەلمێنن کە بە جادووی گەورە و سەرکردەکانیان ناخەون، دەیسەلمێنن کە خەریکن کێشەی ڕاستەقینە لەگەڵ داگیرکەر و بەرەی سەرمایەداری دروست بکەن؛ لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگدا بەرژەوەندی و سوپای ئەو بەرەیە، دووچاری ترسناکیی ڕاستەقینە دەکات.. تەنها لەوکاتەدا بلۆکی سەرمایەداریی داگیرکەر، بیر لەوە دەکاتەوە کەمێك گوێ بۆ هاواری گەلان شل بکات.!

ئەو بلۆکە دەیەوێت ئێمەش بخاتە پاڵ خۆی، تا تەنها لە عەرەب ملیۆنێك سەرباز دابین بکات، هەروەك لە هەندێك بروسکەدا هاتووە؛ پاشان تا نەوت و داهاتە خۆراکی و شوێنە ستراتیژییەکانمان بکاتە کەلوپەلی سەرکەوتن لە قەسابخانە جیهانییە چاوەڕوانکراوەکەدا؛ بەتایبەتی دوای ئەو زللە توندەی لە هیندی چینی پێی کەوت و هێشتا گوێی دەزرینگێتەوە.

دەڵێن لە جەنگەکەی پێشوودا، جەنگاوەرەکان لە بیابانی ڕۆژئاوادا، بە مەبەستی پاك کردنەوەی کێڵگەکانی مین، هەندێك جار وشتر و ولاخیان بەرەڵا دەکرد، ئەگەریش وشتر و ولاخەکانیان لا خۆشەویست بوایە، ئەوا ڕەشپێست(زنجی)یەکانی شوێنە داگیرکراوەکانی ئەفریقیایان بەرەڵا دەکرد، بە جەستە پەرش و بڵاوەکانیان کێڵگەکانی مینیان پاك دەکردەوە!!

ئەمە ڕاست بێ یان نا، بێگومان ئەرکی سەربازانی شوێنە داگیرکراوەکان هەردەم پاککردنەوەی کێڵگەکانی مین و، سازاندنی بۆ گەورە سپی پێستەکان و، شیمانەی شۆك(صدمە)ی جەنگە گەرمەکان بووە.

لەم جەنگە کۆرییەی ئێستادا، ئەو لیوا تورکییەی چوو بۆ ئەوێ، هەمان چارەنوسی هەبوو، هەمان ڕۆڵی گێڕا. چارەنوسی ملیۆنێك بەرخی عەرەبیش، کە گەورەکانی ئێرە پێشکەشی هاوپەیمانییە سروشتییەکانیانی دەکەن، هیچ جیاوازی نابێت لەگەڵ سەربازانی شوێنە داگیرکراوەکان و لیوا تورکییەکە لە جەنگی جیهانیی داهاتوودا، ئەگەر بۆی نوسرابێت کە ڕووبدات.



بەڵام بلۆکی شیوعی ڕووی دەمی دەکاتە جەماوەری ڕەنجدەر، ئەم ملیۆنەها کەسە دەدوێنێت، کە هەموو شتێك بەرهەم دێنێت و برسیشە، گەدە بەتاڵەکان و، جەستە رووتەکان دەدوێنێت، ئەو قوربانیانە دەدوێنێت کە لە مێژە فەرامۆش کراون و بێبەشن، وایان لێهاتووە وەڵامی هەرکەسێك دەدەنەوە، کە کولێرەیەکیان پیشان بدات، هەرکەسێك وادەی نەمانی خۆشگوزەرانیی خراپەکاری پێدەدات، ئەو گوزەرانەی لەبەرچاو و گوێچکەی ئەودا، کەسانێکی کەم پیادەی دەکەن، داهاتەکانی بێشومارە، لەکاتێکدا برسیەتی بێویژدان و ستەمکار، ئەو ملیۆنەها ڕەنجدەرە تێك دەشکێنێت، پاشان ئەو تێکشکاوەش لەناو دەبات.

هەروا ئەو بلۆکە، هەڵەو تاوانەکانی داگیرکەر و، ویستی گەلانی ژێر دەست بۆ لادانی ئەو بارە لەسەر شانی و، وەدەست هێنانی ئەو ئازادییە سروشتییەی داگیرکەری خراپەکاری تاوانبار، بە یارمەتی ناپاکە هەلپەرستەکانی ئەو وڵاتە زەوتی کردووە، بەکاردەهێنێت، هەروەك سود لە بەرگریی خاچپەرستیی ڕۆژئاوایی و سەرمایەداری ناوخۆی دژ بە هەموو بانگەشەیەکی ئیسلامی ڕاستەقینە و، هەمو دادوەرییەکی کۆمەڵایەتی ئیسلامی وەردەگرێت.

هەرچۆنێك بێت، هەردوو بلۆکەکە هەوڵ دەدەن وا لەو بەشە ماوەیەی جیهان بگەیەنن، کە مرۆڤایەتی هیچ چاری نیە دەبێ یەکێك لەو دوو ڕێگایە بگرێتە بەر و، بچێتە پاڵ یەکێك لەو دوو بلۆکە، هیچ چارەسەرێکیش نیە تەنها ئەوەی بەرەی ڕۆژئاوا، یان بەرەی ڕۆژهەڵات سەربکەوێت، تا ئاشتی بەرقەرار بێت و مرۆڤایەتی بە ئاسایش شادبێت و، ئادەمیزاد بگات بە دڵنیایی؛ چوونە پاڵی بەشە ماوەکەی جیهان، تاکە ڕێگایە بۆ زاڵبوونی یەکجارەکی یەك لەو دوو هێزە بەسەر ئەوی دیکەدا، تا باری شلۆقی و ئەوسەر و ئەوسەر و سەرلێشێوان کۆتایی پێبێت.

جا ئایا ڕووی ڕاستی لەم بانگەشەیەدا چیە؟ ڕووی بەرژەوەندیی نەتەوەیی و بەرژەوەندیی مرۆڤایەتی لەو بانگەشەیەدا چیە؟

نە لە بەرژەوەندی ئێمەدایە و، نە لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتیدایە، کە یەکێك لەو دوو بلۆکە بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵ بێت و بوونی بسڕێتەوە؛ ئێمە لەژیاندا لە

قۆنــاغی تەواوکــردنی بوونــی سروشــتی خۆمــانین، لــە قۆنــاغی رزگارکــردنی بەرژەوەندییــەکانمانین لەدەســت داگیرکــەران، لــە بــەرژەوەندی ئێمە نیە، کە بلۆکی ڕۆژهــەڵاتی بــە یــەکجاری شکسـت بێنێت، هەروەك لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتیشدا نــیە.. بــێگومان بوونــی ئــەو بلۆکــە بــەو هــێزەوە لــەم ماوەیــەدا، یەکــێکە لــە دابینکاریــیەکانمان، تــا ئــەو مافانــە ڕۆژ بەڕۆژ رزگار بکەین، هەروەك دابینکاریی کــاتی بــۆ مــرۆڤایەتی، کــە هــێزەکانی داگیرکــەری ســتەمکاری زۆرداری مەکرباز بەسەریدا زاڵ نەبێت.

ئەگــەر لــەناوماندا هەبێــت گومانی بە ئەمریکا باش بێت، وا گومان ببات کە دەســەڵاتداریەکە ی چاوچــنۆکیی داگیرکــەر سنوردار دەکات، با سەرنج بدات، کە چۆن لە ڕیزی ئەو داگیرکەرانەدا دەوەستێت، چۆن لەکاتی پێویستدا بە ئاسن و ئاگر یارمــەتی دەدات. بــەڵام مــن پەنادەگــرم لــەوەی مــرۆڤایەتی بکەوێــتە بەردەستی ئەمــریکای هەڵێــت و پەڵێــتی لــەخۆبایی. هــەتا بەریتانیی لەخۆباییش لە زەوییە داگیرکراوەکانــیدا لەگــەڵ ئەو ناپێورێت.. دژایەتی ئەمریکیی بۆ ڕەنگ جیاوازەکان دژایەتیــیەکی بۆگــەن و بــێزراوە، ڕێنمایــیەکانی نازیــەکان بەرامــبەر بــە ڕەنــگ جیاوازەکان لــە تــەك رك و قیــنی ئەمــریکی بــۆ ڕەنــگ جیاوازەکان زۆر کەمە، لەخۆباییبوونی پیاوی سپی لە ئەمریکا زیاترە لە هەموو ئەوەی هیتلەرییەکان بۆی دەچــوون. قــوڕ بەسەر مرۆڤایەتی لەو ڕۆژەدا، کە بەدبەختیەکەی دەیخاتە بەردەست لــەخۆباییبوونی ئەمــریکی، بــەبێ بوونــی هــێزێك لــە زەویــدا، کە لێی بترسێت و حیسابی بۆ بکات.[1]

هــەروەها ئێمە پێویستییەکی کاتیمان بە بلۆکی ڕۆژهەڵاتی هەیە، بۆ ترساندنی دەســتدرێژکار و چەوســێنەران و، گــێڕانەوەی مافــە داگیرکــراوەکانی جــەماوەر، لەسێبەری ئەو ترساندنەدا! ئێمە قەرزاری بوونی ئەو هێزەین بە زۆر لە هەوڵەکانی

[1] هەروەك حاڵی ئەمڕۆ کە ئەمریکا تاکە هێزی جیهانە و ئە ئارەزووی خۆی بەڕێوەی دەبات. (محمد الحسناوي)

بەدیهێنانی دادوەریی کۆمەڵایەتی، ئەگەر لەبەر ترسی شیوعیەت نەبوایە زۆر کەمی دەهاتە دی!

بەڵام هەموو ئەمانە مانای ئەوە نیە، کە باشی ئێمە و چاکەی مرۆڤایەتی لەوەدا بێت، سەربازگەی ڕۆژهەڵاتی سەرکەوتنێکی یەکجارەکی تەواو بەدەست بێنێت و، ئەو خەونە خەیاڵییەی شیوعیەت بێتە دی و، هەموان قەرزاری شیوعیەت بن.

ئەم سەربازگەیە چاکەی بۆ ئێمە ناوێت، بەرگەی ئەوە ناگرێت کە ئێمە لەسایەیدا ڕێزێکمان هەبێت، دەیەوێت سەرباز و کۆیلەی بین، نەك خاوەنی بوونێکی خودی و قەوارەیەکی ڕێزدار بین. ئەزمونی فەلەستین، هەقیقەتی ناخی ڕوسیای شیوعیی بەرامبەر بە ئێمە ئاشکرا کرد.

لە ئەنجومەنی ئاسایشدا هەڵوێستی دژایەتی ئێمەی وەرگرت[1] هەروەك چەکەکانی بلۆکی ڕۆژهەڵاتی بوو لە دەست جولەکە لە فەلەستین لەڕووی ئێمە وەستا، ئەمە لەبەر ئەوەی ڕوسیا حەزناکا هەموو عەرەب قەوارەیەکیان هەبێت، ترسا لەوەی بلۆکی عەرەبی لە داهاتوودا ببێتە هێزێکی ڕاستەقینە و لە دەسەڵاتی شیوعیەت هەڵگەڕێتەوە، وای بەباشتر زانی کە هەموو بانگەشەکانی بۆ مافە سروشتیەکانی گەلانی چەوساوە ببێتە هەڵم و، یەکێك لە بنەماکانی پڕوپاگەندەی دژ بە داگیرکەر لەدەست بکات و، ڕێگا بدات دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر بنەمای تاکە ئایین دابمەزرێت -کە ئەمە گەورەترین شتێکە شیوعیەت ڕەتی بکاتەوە-، هەموو ئەمانەی بە باشتر زانی لەوەی بلۆکی عەرەبی بەهێز بکات، ئەو لێدانەشی لێدانێکی ستەمکارانەبوو، تا ئیسرائیل لە ناخیدا وەك دڕك دابمەزرێت، یەکێتیە جوگرافیەکەی لەت بکات، سنورەکانیان لێك جودا بکاتەوە، لە یەکگرتن و هێز و کەسایەتی بێبەرییان بکات.

---

[1] (ئەندریە گرۆمیکۆ) مزێموره نوێنەری ئەوکاتەی یەکێتی سۆڤیەت لە نەتەوە یەکگرتووەکان، دووەم کەس بوو لەدوای ئەمریکا بەناوی وڵاتەکەیەوە دانی بە قەوارەی زایۆنیدا نا..

(محمد الحسناوي)

روســیا دژی یەکێــتی و هــێز و بوونــی خودیــی ئــێمەیە، هــەموو ئەوانــەی پــڕوپاگەندەی شــیوعی کــاوێژی دەکــات، تــەنها چەکێکە، لە ململانێکەیدا لەگەڵ بلۆکی ڕۆژئاوایی بەکاری دەهێنێت، بەرامبەر بە پڕوپاگەندەکانی دژ بەو بلۆکە.

لــە دیــدی شیوعیەتی ڕوسیدا چی تێدا نیە، کە ڕێ نەدەین بە بلۆکی ڕۆژئاوایی داهاتــەکانی ئــێمە لــە جــەنگی دژ بــەو بــەکار بێنێــت، بەڵام ئەوەی ببینە خاوەن قەوارەیــەکی خــودی و، هــێزێکی تایــبەتی و، بوونــێکی نەتــەوەیی، ئــەوە نابێت! بانگخوازەکــانی شــیوعیەت لــە وڵاتــەکانمان دەتۆقن، وەك ئەوەی مار پێوەی دابن، ئەگــەر گوێــیان لــە بانگەشــەی کۆمەڵبوونــیان گــوێ لێبێــت کــە کەســایەتیەکی بەهــێزمان بــۆ دروســت دەکــات. ئــەوان دەیانەوێت تەنها کلکی شۆڕ بین و دروشمی شــیوعیەت بڵێیــنەوە، لــەکاتی هەڵگیرســانی جــەنگدا، لــە ســەر زەویــەکانمان ئاســانکارییان بــۆ بکــەین! ئەمــەش حاڵەتــێکە، بەرژەوەندیەکانمان قبوڵی ناکات، بــەڵکو تــەنها هەســتکردنمان بــەوەی، کــە مــرۆڤین و ئــاژەڵ و کەلوپەل نین، قبوڵی ناکات!

لەوانەیــە ئەمــڕۆ شــیوعیەت لەبەرچــاو زەحمەتکێشــە بێبەشــەکان زۆر جوان و بریســکەدار بێــت، ئــەو زەحمەتکێشــانەی خوێنــیان دەکرێــتە یــاقوت بۆ سینگ و ملــەکان و، ئارەقــەیان دەکرێــتە شەرابی ئارەقخۆر و سەرخۆشەکان. بەڵام وێنەیەك بهێنە بەرچاوت، کە تیایدا مرۆڤایەتی هەرهەمووی لەناو تاکە قالبی شیوعیەت دا بێــت، ڕێ نــادرێ یــەك فکرتان بێت، ڕێ بە دڵێك نەدرێت بە لێدانێك لێبدات، کە لیــنین و ستالین بەدڵیان نیە... تەنها ئەم تێڕوانینە موچڕك بە لەشدا دێنێ، هەموو هەستێکی ئادەمیی ساغ دەترسێ بەدی بێت.!

سروشــتی ژیــان نایەوێت یەکێك لەو دوو هێزە ماددیە سەرکەوتنی یەکجارەکی بەدەســت بێنێــت، ئــەو دوو هــێزەی، کــە جــیاوازی نــێوان سروشــتەکەیان، تــەنها جیاوازیی بــەرژەوەندی و چاوچــنۆکیە، شکســتیش لــە جەنجاڵیی سەرکەوتندا شین دەبێت، هەروەك سەرکەوتنیش لەسەر خاك و خۆڵی شکست شین دەبێت.

ئێمەش وا دەبینین کە هاوپەیمانەکان ئەوەندە کۆششەیان کرد بۆ شکست پێهێنانی ئەڵمانیاو ژاپۆن، ئیمڕۆ لەبەردەم وێرانە و مەیتەکان سەر دادەنەوێنن، تا ئەو گەورەپیاوانە رزگار بکەن، کە دوێنێ کوشتیان، تا پشتی پێ ببەستن لەدژی گەورەپیاوێکی نوێ.. هەمان ئەوەی دوای جەنگی جیهانیی یەکەم کردیان.. ئەگەر بەیانی بەسەر بەرەی ڕۆژهەڵاتدا سەرکەون، هەر لەخۆیدا دوژمنێکی بۆ پەیدا دەبێت، بەهۆی ئەو فشار و خەفەکردنەی، کە مرۆڤایەتی ناتوانێت زۆر بەرگەی بگرێت.

ئەوا یۆغسلافیا دەستی پێکرد، هەتا پێش ئەوەی جەنگەکە ڕووبدات، دوای ئەویش لەتلەت بوون لە سەربازگەی شیوعی ڕوودەدات،[1] لەبەر هەمان هۆ، یان بەهۆی مەین و ڕاوەستان، کە لە ئەنجامی داڕشتنی مرۆڤایەتی لە یەك قالبدا دروست بوون، کە تەنها یەك بیرۆکە بەسەریدا زاڵە و، لەدوای قۆناغی شیوعیەت، ڕێگە بە هیچ پەرەسەندنێك نادات، کە بە کۆتایی خەونی مارکسی دادەنرێت و لێی تێپەڕ نابێت! ئەمەش نەفرەتێکە، ئەگەر تووشی مرۆڤایەتی بوو، ئەوە بەڵایەکی مەزنی بەدواوەیە.

سادەو ساکار و ساویلکەین، گەر واتێبگەین ئێمە دەتوانین لەپشت لێکدانی هەردوو بلۆکە مەزنەکە لە جەنگێکی یەکجارەکی کۆتاییدا، ئاشتییەکی جیهانیمان دەست دەکەوێت. زۆرکەسی چاك و بێتاوان لەجیهان لە هەردوو جەنگەکەی ڕابردوودا، خەیاڵی ئەم بەروبومە بەتامە پێگەیشتوەیان دەکرد؛ کەچی داری جەنگ تەنها بەری تاڵی دا، ئەو پیاوە چاکە بێتاوانانە تاڵیان چەشت؛ بەرە شیرینەکەشی هەمووی بۆ زۆردار و چەوسێنەرەکانی ڕۆژهەڵات، یان ڕۆژئاوا بوو.

---

[1] بەراستی ئەم لەتلەت بوونە لە سەربازگەی ڕۆژهەڵاتی ڕوویدا، یەکێتی سۆڤیەت لێك ترازا، لەساڵی ۱۹۹۲ شیوعیەت ڕووخا، بەبێ ئەوەی هیچ سودێك لە کێشەی دوو جەمسەرەکە وەربگرین، بەڵکو تەنها گوێگر بووین بۆ ئەم و ئەو، جەنگی ئەوانمان دەکرد نەك هی خۆمان، هەلی زێڕینمان لەدەست دا کە دەمانتوانی یەکێتیمان و هێزی خودی خۆمان بنیات بنێین.. (محمد الحسناوي)

## ڕێگای ڕزگاریی

ڕێگـای ڕزگـاریی مرۆڤایەتی بەدبەخت ئەوە نیە پاڵداتە ئەم سەربازگە، یان ئەو سەربازگە، تا یەکێکیان ئەوی دیکە تێك بشکێنێت و ڕووی جیهانی بۆ چۆڵ ببێت، بە تەنها بەسەریدا زاڵ بێت و بە ئارەزوی خۆی بیبات بەڕێوە.

جەنگەکـە لـە نـاخی خۆیـدا لـە زەویـیەکی دەرەوەی زەویـی ئـەو دوو بلۆکـە ڕوودەدات. لـە تورکـیا و، ئێران و، عێراق و، سوریا و، میسر و، باکوری ئەفریقیا و، لـە پاکستان و ئەفغانستان ڕوودەدات. لە سەرچاوەکانی نەوتی ئێرانی و عەرەبی لـە (عبادان) و (ظهران).. ئەو جەنگە، داهاتەکانی ئێمە لەناو دەبات، ژیانی ئێمە تێك دەشکێنێت، زەویەکانمان کاول و وێران دەکات.[1]

جـا ئەگـەر ئەمـیان سـەرکەوێت یـان ئەویان، ئێمە لە وێرانی و تێکشکاوی لە جەنگەکـە دەردەچین. نەك وەك ئەوەی لەئەوروپا لە جەنگی ڕابردوو دەرچوو، بەڵکو وەك نەتەوەیەك، کە هەرگیز لەجەنگ دەرنەچوبێت.

بـۆ نمونـە ئەگـەر هێرۆشـیما بەهۆی بۆمبێکی ناوکیی بچووکەوە ڕۆیشت، ئەوا ئـێمە دەبیـنە ئـەو مشـکە بچـوکانەی بۆ تاقیکردنەوەی بۆمبی ناوکی و، بۆمبی هیدرۆجیـنی و، گـازی مـردنی لەسەرخۆ و، تیشکی مردنی ئەفسوناوی و، جەنگی ڤایرۆسـە سەرکەشـەکان و، هـەموو ئەوانـەی لـە مێشکی کافر لە دونیای ویژدانی پیسی ڕۆژئاوادا هەیە، بەکاردێن.

لـــێرە بـــانگخوازانی بلۆکـــی ڕۆژئـــاوایی بـــە چارەســـەرکردنی کێشـــە هەڵپەساردراوەکانمان لەگەڵ داگیرکەر منەتمان لەسەر دەکەن، ئەگەر ئێمە بچینە پاڵ سـەربازگەی سەرمایەداری، کە ناویان ناوە سەربازگەی دیموکراسی! وەك ئەوەی دوو جار لەسەر یەك نەچوبینە پاڵی، وەك ئەوەی دووجار لەو کونەوە مار پێوەی نەدابین.

مـن دەزانم هـۆی ئـەم هەڵوێسـتە سەیرە گومانـاویـە چـیە.. ئەو هاوپەیمانییە سروشـتیەی نـێوان سـەرمایەداریی نـاوخۆ و داگیرکـەری ڕۆژئاوایـە، ئـەوە بەرژەوەندییەکی هاوبەشە لەنێوان داگیرکەران و چەوسێنەران. زۆردار و چەوسێنەران

[1] هەر ئەمەبوو لە هەردوو جەنگی کەنداوی یەکەم و دووەمی ڕەش ڕوویدا (محمد الجسناوی)

لێره ناتوانن کەمێك لەو چەوساندنەوە و زۆرداریەی لەسەری ڕاهاتوون کەم بکەنەوە؛ دەشزانن کە داگیرکەر پشتیوانی سروشتیی ئەوانە، ئەو ئەمانی هێناوەتەبون و دروستی کردوون، دەسەلات و دەوڵەمەندی پێبەخشیون. ئەوبوو پاداشتی دایە ئەوانەی سوپای (عورابی)یان هەڵخەڵەتاند[1] و، لەمیسر یارمەتی سوپای داگیرکەریان دا و؛ زەوی و سامانیان پێشکەش کردن، هەتا وایان لێهاتووە ئەمرۆ بە منداڵی ماڵە گەورەکان دادەنرێن، بە نازناوی خێزانە بەرێزەکان ناو دەبرێن![2] داگیرکەریش لە هەموو شوێنێك ئەمە دەکات، نزیکترین نمونەش (جەلاوی)ی ناپاکە لە مەراکش، کە شەرم ناکات شانازی بە مردنی کوڕەکەی دەکات لە هەڵمەتی فەرەنسی بۆ سەر مسوڵمانانی وڵات!.

گەورەکان چی بکەن، کە جەماوەر ببێتە سوتەمەنی جەنگێکی نوێ؟ جەنگەکان سامانیان چەند قات دەکات؛ ئەو قەرزانەیان بۆ دەدات، کە لەسەر زەوی و زار و کۆمپانیاکانیان قورس بووە، ئەگەریش زیادەمەسرەفیان بۆ خۆیان کردووە لە دۆڕانی لگاو(قمار)، یان رابواردنی خراپەکاریی و بێڕەوشتی، کە سامانی زۆر لوش دەکات، دڵنیاشن کە لەژێر سایەی ڕەوشی کاتی(احکام عرفیة)، کە لەگەڵ جەنگدا هاودەمە، خۆیان لە ئابڕوچوون دەپارێزن و، دەمەکان دادەخەن و، قەڵەمەکان دەشکێنن و، بەتوندی لەو ئازادیخوازانە دەدات، کە جەماوەر لە مافەکانیان بەئاگا دەهێننەوە. ئەوان دڵنیان کە خۆیان لەو جەنگانەدا تیاناچن، هەروەك لە سامانەکانیشیان دڵنیان؛ چونکە لە ڕۆژهەلات باجی خوێن تەنها هەژارەکان دەیدەن! بینیمان لە جەنگەکانی فەلەستین چۆن ئەفسەرەکان -کە کوڕی پیاوەگەورەکان بوون- لە بەلاکانی گۆڕەپانی جەنگ دووردەکەوتنەوە، دوای ئەوەش مەدالیای ئازایەتیان پێ دەبەخشرا، لەکاتێکدا ئەوان لە قاهیرە لە بارِ و مەهاکان نقوم بوبوون!

---

[1] لە جەنگی (تل الكبير) ساڵی ١٨٨٢ (محمد الحسناوی)

[2] ئەم وتانە لە سەردەمی مەلیکی لابراو نووسراوە، لەم چاپەدا وەك تۆمارێکی مێژوویی هێشتمانەوە. (محمد الحسناوی)

گەورەکان چی بکەن تا وڵاتەکەیان بە ڕەوڕەوەی سەرمایەداریەوە ببەستنەوە-کە هاوپەیمانێکی سروشتییانە- لەکاتێکدا خۆیان لە هەموو زیانێك پارێزراون؟ سەرمایەداری رۆژئاوایی چی بکات، تا لە هاواری گەلان بۆ ئازادی خۆی کەڕ بکات، لەکاتێکدا خۆی جڵەوی ئەو گەورانەی بەدەستە، کە لەراستیدا دەزانن کێیە نیعمەتیان پێدەبەخشێت و دەیانپارێزێت؟!

بەڵام بانگخوازانی شیوعیەت، مننەتی نان و ئاشتیمان لەسەر دەکەن، ئەگەر بچینە ڕیزی شیوعیەتەوە، تا شیوعیەت سەرکەوێت.

ئێمە بەڕاستی پێویستمان بە نان و ئاشتی هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستمان بە هێز و کەرامەت هەیە. شیوعیەتیش نایەوێ بونێکی خود(ذاتي)مان هەبێت، یان وەك مرۆڤ سەرمان بەرزکەینەوە. ئەوەتا نمونەکمان پیشان دەدات لە هەڵوێستی لەگەڵ پەروەردەکراوی یەکەمی، کە یوغسلافیایە، کاتێك ویستی بوونێك بۆ خۆی پێکەوە بنێت.[1]

لەوانەیە لە ئەوروپای مەسیحیدا، شیوعیەت تاکە ڕێگا بێت بۆ بەدیهێنانی دادوەریی کۆمەڵایەتی ماددی؛ بەڵام لە وڵاتی ئێمە تاکە ڕێگە نیە، چونکە ئێمە شێوازی دیکەمان هەیە بۆ بەدیهێنانی دادوەریی کۆمەڵایەتی، کە گشتگیرتر و ڕێزدارانەترە لە دادوەریی شیوعیی ماددی، بونی خودیمان لێ ناسەنێت، دژایەتی حەزی سروشتیمان ناکات لە بوونی کەرامەت، ئەوە لای ئێمە ڕێزدارانەتر و لەپێشترە.

ڕێگای ڕزگاری ئەوەیە، کە لە زەویی جەنگە چاوەڕوانکراوەکەدا، بلۆکێکی سێیەم بێتە بوون، بە ئەوان و ئەوان بڵێت: نەخێر! ئێمە ڕێگا نادەین لەسەر لاشە و وێرانەی ئێمە جەنگەکەتان بەڕێوە ببەن. ئێمە لێ ناگەڕێین داهاتەکانمان خزمەتی

[1] لەگەڵ (مجر) ساڵی ١٩٥٦ و، چیکۆسلۆفاکیا ساڵی ١٩٧٢ هەر وای کرد، وڵاتەکەی داگیر کرد و حکومەتە نیشتمانیەکەی روخاند، ئەگەرچی ئیشتراکی بوون.
(محمد الحسناوي)

چاوچنۆکیەکانتان بکات، لێتاگەڕێن جەستەکانمان کێڵگەی مینتان بۆ خاوێن بکاتەوە، وەکو مەڕ و بەرخ ملمان نادەینە دەستتان.

تەنها ئەمەیە هێمنییەکی کەم دەگەڕێنێتەوە بۆ سەرگەرمەکان؛ هاوسەنگییەکی کەم دەدات بە هەنگاوە شێتانەکان. پاشان ئەوان و ئەوان هەست دەکەن، کە لەم پارچە زەویە فراوانە مەزنە گرنگەدا، خەڵکانێك هەیە حیسابیان بۆ بکرێت، نەك کەلوپەلێکی فڕێدراو بن، یان ئاژەڵ و کلك بن.!

ئەوانەی پڕوپاگەندەی دوو بلۆکەکە ڕۆحیانی داگیرکردووە دەڵێن: ئەمە مەحاڵە، هیچ چارەمان نیە، ئێمە ئەو هێزەمان نیە، کە لەنێوان دو بلۆکەکە ببینە بەربەست؛ لێرەولەوێ بەپێیەکانیان پامان دەکەنەوە، ڕاگەیاندنی بێلایەنی دادمان نادات، بکەوینە دوای ئەم یان ئەو.

من دەزانم چۆن پڕوپاگەندە ڕۆح و مێشکەکان داگیر دەکات؛ بەڵام نازانم خەڵك چۆن بەو ئاستە خۆیان بە کەم دەزانن، چۆن شەرم ناکەن بە ویستی خۆیان ببنە کۆیلە و شت و مەك!

سوپاکەمان دڵنیا نیە، کە جەنگەکە لە زەویی دوژمن بەڕێوە ببات، دەوروبەر بۆی لەبۆسەدان؛ تەقەمەنی و خۆراکەکەی لەکار دەخەن؛ ڕێگای هاتوچۆ و پەیوەندیی لێ دەبڕن؛ سیخوڕی بەسەردا دەکەن، لە ئارامی و ئاسودەیی بێبەشی دەکەن، جا ئەگەر لێیان بگەڕێت چی دەکەن بیکەن، یان هەڵمەتیان بکاتە سەر، ڕوبەڕووی شۆڕشێکی ناوخۆیی دەبێتەوە، لەهەمان ئەو کاتەی کە لە گۆڕەپان ڕوبەڕووی دوژمن بۆتەوە.

سوپای ئەڵمانیی سەرکەوتوو، پێش ئەوەی لە گۆڕەپانی جەنگدا بشکێت، دوو جار بەهۆی شۆڕش و ڕاپەڕینی ناوخۆییەوە شکا. لە جەنگە کۆنەکان یان تازەکاندا، هیچ سوپایەك نیە ڕوبەڕووی دژایەتی گەلان بێتەوە و لە دڵنیاییدا بێت. کەس بڕوای بەمە نیە تەنها خۆ گێلکەرە سەرشۆڕەکان نەبێت.

ئەو گەلانەی بە سەدان ملیۆن دەژمێردرێن، کە شوێنە ستراتیژیەکانیان، بڕیاری ئەنجامەکانی هەر جەنگێکی جیهانی دەدەن، داهاتە سروشتیەکانی بڕیاری

سـەرکەوتن و شکست دەدەن.. ئەو گەلانە ئەگەر شتێکیان بوێت دەستەوسان نابن، بێجگە لەمە هەرچی بوترێت قسەی بێ‌مانایە!

## وتەی ئیسلام

ئەمەیـە ئەوەی واقیع دەیدرکێنێت، ئەوەی تێڕوانینی زانستی بۆ بارودۆخەکان و شـتەکان دەیگاتێ، ئەی وتەی ئیسلام لە هەڵوێست لە واقیعی بارودۆخ و شتەکاندا چیە؟

١-ئـەم ئیسـلامە بـە مەبدەئـە گشـتیەکانیەوە دەربـارەی ژیـان و، بە بیرۆکە گشـتیەکەی دەربـارەی ئاشـتی.. نەفرەت لەو جەنگانە دەکات، کە مرۆڤایەتی لەم ڕۆژگارە ئەنجامی دەدات، نەفرەت لەو هۆیانە دەکات، کە دەیهێنێتە بوون، نەفرەت لەوانـە دەکـات، کـە بانگەشەی بۆ دەکەن و بەشداری تیا دەکەن.. ئەوە جەنگێکە پاڵـنەرەکانی نەفـرەت لێکراوە، ڕوداوەکانی نەفرەت لێکراوە، ئەنجامەکانی نەفرەت لێکراوە، لەبەر ئەوەی هەمووی جەنگێکە دژ بە وتەی خوا لەسەر زەوی، جەنگێکە دژ بەو بنەما بەرزانەیە، کە دەیەوێت.

لەگـەڵ ئەوەشـدا ئیسـلام لەسـەرمان حـەرام دەکـات، کـە بچـینە پـاڵ هـێزە زۆردارەکـانی سەر زەوی، هاوکاریی خراپەکاری و دوژمنایەتی بکەین: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوت: ئەوانـەی بڕوادارن لەڕێگـەی خـوا دەجـەنگن، ئەوانـەش کـە بێ‌بـڕوا بـوون لـەڕێگای تـاغوت شـەڕ دەکـەن.﴾النسـاء/٧٦. هـیچ گومـانی تـێدا نـیە کـە هـاندەری ئـەم جەنگـە و ئامانجەکانی بەشی وتەی خوای تێدا نیە، لەهیچ حاڵەتێکدا لەڕێگای خوا نیە.

٢- ئیسـلام قەدەغـەی کردووە، کە دەستی یارمەتی بۆ ئەوانە درێژ بکەین، کە ئـازاری مسـوڵمانان دەدەن و لـە وڵاتـی خۆیـان دەریـان دەکـەن و پشـتیوانی لـە دەرکردنیان دەکەن: ﴿إِنَّمَا يَنْهَاكُم اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيَـارِكُمْ وَظَاهَـرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ: بەڵکو ڕێگەتان نادا لەگەڵ ئەوانە ببـنە دۆسـت، کـە لەسـەر ئـایین شـەڕیان لەگەڵـتان کرد و ئێوەی لە زێدی خۆتان ئاوارەکرد و پشتیوانییان لە دەرکردنی ئێوە کرد.﴾الممتحنة/٩.

کەچی ئینگلتەرا و ئەمریکا و ڕوسیاش لەگەڵیان هاوبەش بوون بە دەرکردنمان لە وڵاتمان لە فەلەستین. کە هەموو ماڵێکی مسوڵمان لەسەر زەوی ماڵی ئێمەیە. فەڕەنسا هاوبەش بوو لە ئازاردان و جەنگی ئێمە لە باکوری ئەفریقی هەر هەمووی و ئێستاش بەردەوامە، هەموویان لە ئاییندا دژایەتیمان دەکەن و هێشتاش بەردەوامن.

لەگەڵ ئەوەشدا هەموو پەیمان بەستنێك، یان هاوکارییەك لەگەڵ یەك، یان زیاتر لەو دەوڵەتانە، ئیسلام بە تەواوی حەرامی دەکات؛[1] ئەو دەوڵەتەش کە ئەم پەیمانە دەبەستێت لە دەقی ئیسلامیی ڕاشکاو دەرچوە، بۆیە گوێڕایەڵی بۆ ئەو دەوڵەتە لەو کارە خراپەدا لەسەر گەلەکەی نامێنێ؛ بەڵکو پێویستە لەسەر ئومەت بە هەمو شێوازێك و بە هەموو ڕێگایەك، دەوڵەتەکە لەو خراپەیە بگێڕێتەوە.

٣-ئەم ئیسلامە لەسەرمان پێویست دەکات، کە ستەم لەسەر مرۆڤایەتی لابەرین و، دەبێ لە خۆمانەوە دەست پێبکەین بە لابردنی ستەم لەسەر خۆمان. هیچ ستەمێك لەسەر زەوی لە داگیرکەر خراپتر نیە. کە ئەمڕۆ بە پێوەر لەگەڵ وڵاتی ئیسلامی، سێ دەوڵەتە ستەمکارە دەستدرێژکارەکەیە: ئینگلتەراو فەڕەنسا و ئیسرائیل.[2]

پاشان ئیسلام بانگمان دەکا بۆ تێکۆشان دژی ئەو دەوڵەتانە لە هەموو گۆڕەپانێکدا؛ هەرکاتێك یەکەمین هەلمان بۆ هەڵکەوت، شمشێری لەڕوو بەرز بکەینەوە؛ خۆمان وادابنێین کە لە حاڵەتی جەنگداین لەگەڵیدا، تا لە دوژمنکاری وازدەهێنێت؛ ﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ: ئێوە لەگەڵ ئەوانەدا کە شەڕتان پێدەفرۆشن، لەڕێگای خوا بجەنگن.﴾البقرة/١٩٠.

---

[1] ئەمە ئەگەر پەیمان پەستنەکە یان هاوکارییەکە بۆ ئامانجی جەنگیی یان سەربازی بوو، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە کاروباری تەندروستی و زانستە جێبەجێکاریەکان و هاوشێوەکانیانەوە هەیە، ناکەوێتە ناو ئەم حەرامیەوە. (محمد الحسناوي)

[2] ئەمە لە سەردەمی دانانی کتێبەکە بوو، ئەو دەوڵەتانە بوون کە لە ساڵی ١٩٥٦ هێرشی سێقۆڵییان کردە سەر میسر، بەڵام ئێستا سەری دەوڵەتە ستەمکارە دەستدرێژکارەکان ئەمریکایە. (محمد الحسناوي)

٤-لەم بوارەدا ئەوەی لەسەر دەوڵەت و حکومەت جێبەجێ دەبێت، لەسەر کۆمەڵ(جماعة) و تاکەکانیش جێبەجێ دەبێت. هەموو کۆمپانیا، یان دامەزراوێکی دارایی، یان بازرگانی و هەموو تاکێك، ئەگەر هاوکاری لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە بکات، جا هەر جۆرە هاوکارییەك بێت، ئەوە لە ئیسلام دەرچوە، پێچەوانەی فەرمانی خوایە، لە ئوممەتی ئیسلامی دەردەچێت، لە هەرکوێ بن زیان بە مسوڵمانان دەگەیەنێت.

ئەو بەڵێندەرانەش، کە خۆراك و شتە گرنگەکان بۆ سوپای ئەو دەوڵەتانە دەهێنن لەهەر کوێ بن، ئەو کرێکارانەی لە سەربازگەکانیان کاریان بۆ دەکەن، یان لە بەندەر و شوێنەکانی دیکە شتیان بۆ بار دەکەن؛ یان ئەو زانایانەی دین دەکەن بەپیشە، کە کۆمپانیاکانی داگیرکەران بەکاریان دەهێنن، تا لەکێشەکان رزگاریان بکەن.[1] ئەوانە ناپاکیی لە خوا و پێغەمبەرەکەی و ناپاکی لە مسوڵمانان و ناپاکی لەخۆیان دەکەن و، سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن بەدرێژایی ئەو ماوەیەی دەستی پارەوییەك، یان خزمەتێك یان یارمەتیەك، یان فەتوایەکیان بۆ درێژ دەکەن!

ئیسلام لەسەر هەموو تاکێك و، هەموو دەستەیەك و، هەموو حکومەتێك و، هەموو دەوڵەتێك لە وڵاتێکی ئیسلامی پێویست دەکات، کە دژی ئەو فەتوا زۆردارە جیهاد بکات و تێبکۆشێت و، بەو رێگایەی بۆی دەکرێت، گورزی لێ بوەشێنێت. ئێمە لە حاڵەتی جەنگێکی بەردەوامداین لەگەڵیا، تا ئەو کاتەی واز لە دوژمنایەتی ئێمە و، دەستدرێژی لە هەموو زەوی دەهێنێت.

---

[1] هەروەك شێخ محمد نور-شێخ رواق الجبارتە لە ئەزهەر- کردی، کە بەرگریی لە داگیرکاریی ئیتاڵی بۆ لیبیا کرد و باسی دەستکەوتە شارستانیەکانی داگیرکەری کرد و، بەتوندی هێرشی کردە سەر سنوسیەکان کە لە لیبیا سەرکردایەتی جیهادی ئیسلامییان کرد.
(محمد الحسناوی)

ئەمەیە وتەی ڕاشکاوی ڕوونی ئیسلام، وتەیەکی بەرز و دەنگدەرەوەیە، ڕێگای ڕزگاربونمان بۆ دەکاتەوە، ڕێگای ئاشتی بۆ هەموو مرۆڤایەتی دەکێشێت. ئاشتیەکی تەواو و گشتگیر، دوور لە ستەم و خراپەکاری و دوژمنکاریی.

بەلام چۆن ئەم وتەیەی ئیسلام لە واقیعی ژیاندا دێتە دی؟ وەلام ئەوەیە کە لە ڕەوشی جیهانیی ئێستادا نایەتە دی، مەگەر ئوممەتی ئیسلامی دووهەنگاوی هاودەم هەلبگرێت:

هەنگاوی یەکەم: گەڕانەوە بۆ حوکمی ئیسلام لە ناو هەموو دەولەتێك لە دەولەتەکانی و، هەلێنجانی یاسا و دەستورەکان لە شەریعەتی ئیسلامی و، جێبەجێکردنی بنەما ڕەوشتی و ئابووری و کۆمەلایەتیە هەلێنجراوەکانی ئەم شەریعەتە و، داڕشتنەوەی پرۆگرامەکانی فێرکردن و پەروەردە و بەرنامەکانی لە سایەی بیرۆکەی ئیسلامی بۆ ژیان.

هەنگاوی دووەم: ئەوەیە کە ئەو دەولەتانە لەژێر بەیداغی ئیسلامدا کۆببنەوە، کۆبونەوە لە بواری سیاسەتی نێودەولەتی و، لە بواری ئابووری و، لە بواری جەنگی.. کۆبونەوەکە لەسەر ئەو بناغەیە بێت کە یەکەم: داوای سەربەخۆیی و ئازادیی تەواوی خۆی و هەموو خەلکەکەی دەکات، جەنگێك دەبێت دژ بە هەموو دەستدرێژکارێك بۆ سەر ئەم سەربەخۆییە، دووەمیش: دژی هەموو دەستدرێژکارێك و، هەموو داگیرکەرێك دەوەستێت، هەر جۆرێك بێت و لە هەر لایەکی ئەم زەویە بێت.

ئەم بلۆکە هاوچەشن و چون یەکەیە، کە بۆی هەیە پەیداغێکی نوێ هەلبکات، کە بیرۆکەی نوێی مرۆڤایەتی دەنوێنێت و؛ دەبێتە ڕێنیشاندەرێك بۆ مرۆڤایەتیی گومڕای ئەشکەنجەداری بەدبەخت.

ئەم بلۆکە سنورە هاوبەشە لە کەنارەکانی (ئەتلەنتی) تا کەنارەکانی (باسفیکی)[1] کە مەراکش و تونس و، جەزائیر و لیبیا و، دۆلی نیل و سوریا و،

[1] ئۆقیانوسی هێمن : (محمد الحسناوي)

لبـنان و عـێراق و، ئـەردەن و دورگـەی عـەرەبی و، یەمـەن و تورکـیا و، ئێران و ئەفغانیستان و، پاکستان و ئەندەنوسیا لەخۆ دەگرێت.

ئەم بلۆکە کە ژمارەیان زیاد لە (٣٠٠) ملیۆن دانیشتوان دەبێت،[1] کە خاوەنی دەوڵەمەندتـرین سەرچـاوەکانی نـەوت و مـاددە خامـەکانن و، بـە شـوێنە ستراتیژیەکانیان دەسەڵاتیان بەسەر هاتوچۆی جیهاندا دەبێت.

ئـەم بلۆکـە دەتوانـێ سەنگێك بۆ خۆی دابنێت، ئەگەریش لەچەك داماڵرابێت؛ دەتوانێـت وا بکـات هەریـەك لـە دوو بلۆکە ناکۆکەکان دوو جار بیربکەنەوە، پێش ئـەوەی دەسـت بـە جـەنگ بکـەن، کـە تـیایدا ئـەو ناوچـە فـراوانە بـبڕێت، کە بەربەسـتێکە لەنـێوان هـەردوو بلۆکەکە و پێك ناگەن، تەنها بە بڕینی ئەو ماوەیە نەبێـت؛ چـەندین جـار بـیر بکاتـەوە پـێش ئـەوەی لەسـەر سیاسـەتە داگیرکاریـە ستەمکارەکەی بەردەوام بێت لەم زەویە داماوە، بەر نەفرینی داگیرکەر کەوتووە.

ئـەم بلۆکـە هـەموو ئەمانـەی بەدەسـتە، ئەگـەر پلەی وشیاری تیایدا گەیشتە ئاسـتێك، کـە دژی پڕوپاگەندە درۆینەکان بوەستێت، ئەوانەی بانگخوازانی هەریەك لـەو بلۆکانـە پـێی هەڵدەسـتن. ئەگـەر ئـەو بلۆکـە توانـی چـۆن فەرمانـڕەوا و چەوسـێنەرەکانی ناچـار بکات پەیڕەویی سیاسەتی ئیسلامی بێگەرد بکەن، ئەگەر ئـابووری و تواناکـانی خـۆی ڕێکخسـت و لـە داگیرکاریی ئابوری رزگاری کرد، کە بەهۆیـەوە دەسـەڵاتی دەبێـت بەسەر فەرمانڕەوا و سەرمایەدارە چەوسێنەرەکان و، ئەوانەی گوێ بە نیشتمان، یان نەتەوە یان ئایین نادەن.

من بۆ گەلان دەنووسم نەك بۆ حکومەتەکان، بۆ جەماوەر دەنووسم، نەك بۆ چەوسێنەران، من بڕوام بە گەلان و جەماوەر هەیە لەو پارچە فراوانەی زەویدا. هۆکارەکانی لاوازی و جودایی هەرچی بێت، هۆکارەکانی فشـار و خەفەکردن هەرچی بێت، پێویستە بانگخوازان بڕوایان بە گەلان لەدەست نەدەن؛ گەلانێك بیانەوێت دەتوانن ببنە هۆی سەرئێشە بۆ بەهێزەکان و هاوپەیمانەکانیان لە خەڵکی

[1] ئەمڕۆ ژمارەی موسڵمانان گەیشتە (٢٠٠٠) ملیۆن، چارەکی دانیشتوانی گۆی زەوی. (محمد الحسناوی)

ولأت. دەتوانن ئەوان و ئەوان دووچاری دەردی بەردەوام بکەن، لەگەڵیدا لە هەڵچون بەدور نابن، پشتیان لە شێوان و داڕوخان ناپارێزن.

کـاتی ئـەوە هـاتووە گـەلان سـنورێك بۆ ئەو دەستە خراپەکارە دابنێن، ئەوەی فەرمانـڕەوا و چەوسـێنەرەکان ئـەنجامی دەدەن؛ هـەروا بـڕیاری چارەنوسـی خۆیان بەدەستی خۆیان بدەن و، هەموو دەستێك ببڕن، کە دەیەوێت یاری بە چارەنووسەکان بکات بۆ مەبەستێکی تایبەت، کە هیچی بۆ ئەو گەلانە تیا نیە.

فەڵەسـتین لەسـەر قەسـابخانەی پێشـبڕکێی نـێوان چەند ماڵێکی دەسەڵاتداردا، لەدەسـت چـوو، نـەك لەبەر ئەوەی هێزەکانی نەتەوەی عەرەب-هەرچەند لاواز بن-نەیانـتوانی بەرامبەر کۆمەڵە جولەکەیەك خۆڕاگرن. هەرچەند یارمەتییان لە بلۆکی شـیوعی و بلۆکـی سەرمایەداری بۆ بهاتایە، ئەگەر کۆمەڵەی گەلانی عەرەبی ئەو چـالاکیەیان تـیابوایە، کـە چاوچنۆکیی چاوچنۆکان تێك بشکێنێت و، لەو دەستانە بدات کە یاریی پێدەکەن، هەرگیز ئەم کارەساتە رووی نەدەدا.

کارەسـاتەکە ئـەو کاتـە ڕویـدا، کـە بەیداغـەکان پەرتـەوازە بـوون، بـەیداغی نەتـەوەیی لـەرزۆك، وای کـرد کە چاوچنۆکیی دەوڵەتەکان و ماڵە دەسەڵاتدارەکان، پایەی یەکەمیان هەبێت و وتەیان زاڵ بێت.

جا گەڕانەوە بۆ یەك بەیداغی ئیسلام تاکە ڕێگایەکە ماوە، ئەم بەیداغە نیشانە و مەدالـیای رزگاریـیە. وتـەی ئیسـلام دوا وتەیـە، کـە مسـوڵمانان بـۆ ڕزگـاری بانگهێشـت دەکـات، بـەڵکو هـەموو مـرۆڤایەتی بـۆ ئاسایش و ژیان بانگهێشت دەکات.

# ناوەڕوك

# پەیڤێکی کۆتـایی

دانیشتن و گـوێگرتن لـە دانایـان و بیریـاران، تـام و چـێژێکی بێهاوتـای هەیـە. بەرهەمەکانیشیان لەدوای خۆیان بەهـەمان شـێوە.. هەرکـە دەسـتت پێکـرد، تـا کۆتایی ناتوانی دەستبەرداری بیت، هەست بە ماندوبون ناکەیت، واهەست دەکەیت خۆراکێکەو هەمور جەستەو گیانت داوای دەکات.. لەوانەیە هۆکاری ئەمە بۆ ئـەو هزرە فراوانە بگەڕێتەوە، کە پەروەردگاری باڵا پێی بەخشیون.. کە لە خزمەتیانـدا دەبیت، واهەست دەکەیت لەجیهانێکی باڵادایت، لەجیهانی پاك و بێگەردیـدایت، جیهانێك هەموی ڕاستی و پاکی و رونییە.

من بەش بەحاڵی خۆم ناتوانم وەسفی ئەو چێژە بکەم، کە لە خزمـەت ئـەو زانـا و بیریایانەدا هەستی پێدەکرێت، تـەنها دەتـوانم بڵـێم وەك چـیرۆکێك وایـە، لەگـەڵ هەڵدانەوەی هەر لاپەڕەیەك، تامەزرۆی لاپەڕەکەی دواتر دەبیـت، تـا کۆتـا بەشـی ناتوانیت دەستی لێ هەڵگریت، ئەوسا هەست بە ئاسـودەییەك دەکـەیت، کـە زۆر جیاوازە لە هەمور هەستەکانی دیکە.. ناخۆشترین کارەساتیش لەو کاتەدا ئەوەیە، کە لە سەرەنجامی چیرۆکەکە دابڕێیت.

(ئاشتی جیهانی و ئیسـلام) یەکێکـە لـە شـاکارەکانی بیریـاری مـەزنی جیهـانی ئیسلامی، مامۆستا (سید قطب)، خوا بە شەهیدی قەبوڵ بکات. تا نەیخوێنیتـەوە نازانیـت چـیە، چـونکە لەخوێندنەوەیـدا، تـام و چـێژێکی تایبـەتی هەیـە، لـە بیرلێکردنەوەیدا جیهانێکی فراوانی روناك هەیە، نوسەر زۆر لێبراوانە خـاڵ لەسـەر وشەکان دادەنێت و چەمکەکان ڕاست دەکاتـەوە و، گرێکوێرەکـان دەکاتـەوە، لـەو بڕوایەدام هەرکەسێك دەستی بە خوێندنەوەی چەند دێرێکی کردبێـت، تـا کۆتـایی دەستبەرداری نەبووە. وابزانم زۆربەی ئەوانەی خوێندویانەتەوە، بە کۆتـایی هـاتنی کتێبەکە تینویەتیان نەشکاوە، چونکە لەناخیاندا ئەو هەسـتە هـەبوە، کـە ئەمـە کۆتایی نیە!

هەتا پەروەردگاری دانا پەردەی لەسەر ئەو نهێنیە هەڵدایەوەو، دڵسۆزانێکی هانـدا بۆ ئەوەی ئەو بەشەی بەناوی (والآن- ئەی ئێستا)، کە لە چاپی یەکەم و دووەمـی کتێبەکەدا هـەبووەو دوایـی لێـی لابـراوە، بـڵاوی بکەنـەوەو بیخەنـە بەردەسـتی خوێنەران، ئەگەرچی بەشێوەی نامیلکەیەکی جودا لە کتێبەکەش بوبێت.

بۆیە منیش وەك خوێنەرێکی ئەم کتێبە، هەستام بە وەرگێڕانـی بـۆ سـەر زمـانی کوردی و بەشـە لابراوەکەشـم خسـتەوە سـەری، بـەو هیوایـەی تـوانیبێتم هـزر و تێڕوانینەکانی نوسەرم بە خوێنەرانی کوردزمان گەیاندبێت.

داواکاریشم پـەروەردگاری بەخشـندە لـە هەڵـەکانم ببورێـت و بیخاتـە تـەرازووی چاکەکانمەوە و، بە بەرەکەتەکەی بەهرەوەرم بکات.

**وەرگێڕ**

**٢٠٠٦/٣/٣٠**